**ساڵی سیانزەهەم هاوینی ٢٠١١ ژمارە ٦٧**

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

خاوەنی ئیمتیاز
**شێرکۆ بێکەس**

سەرنووسەر
**ڕەووف بێگەرد**

راوێژکاری گۆڤار
**رێبین هەردی**

دەستەی نووسین
**هیوا قادر**
**هەورامان وریا قانع**

هەڵەچن
**ساکار ڕەووف**

تایپ
**لەرین لەتیف - شەهلا جەمال**

بەرگ
**ئارام عەلی**

## فیكر و فەلسەفە



## مەلەفی ژمارە/ بەهاری عەرەبی



## گفتوگۆكانی مەلەف

## گفتوگۆ



## ئەدەب و هونەر



## وێستگەكانی سەردەم



## ناونیشان

دەزگای چاپ و پەخشی سەردە شەقامی سالم ـ سلێمانی
تەلەفۆن: دەزگای سەردەم ٣١٢٨٩٢٠- ٣١٢٠٨٩٠
سەرنووسەر ٠٧٤٨٠١٣٦٦٥٩
ناردنی بابەت لەدەرەوەی وڵاتەوە لەڕێی سندوقی پۆستی
لەڕێگەی (ئیمەیل)ەوە
govarysardam@yahoo.com
www.serdem.org
نرخی (١٢٥٠) دینار

# ڕۆشنگەریی چ کاریگەرییەکی لەسەر گۆڕانی بیرکردنەوەی مۆدێرن داناوە

نووسینی: ری پۆرتەر
و. لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

زۆرێك لە تیۆرستانی کۆنەپەرستو ژاوە ژاوکەر لە دەیەکانی نەوەدی سەدەی هەژدەدا گوناهی هەموو ئەو شتانەی ناویان نابوو بەڵاکانی شۆڕشی فەڕەنسا، ئەخستە سەر ئەستۆی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری. بە تێڕوانینی ئادموند بورك و ئایە بارۆئێل، "درەوشاوەکان" (illuminati) کۆمەڵێك دالْغەلێدەری مەست بوو بە باوەڕهێنان بە عەقڵبوون کە پرۆژە بە روکەش لۆژیکی، هەڵخەڵەتێنەر و نیمچە هیومانیستیەکانیان لەگەڵ وتارخوێنی بێ مایەیان، خەڵکی خۆشباوەڕیان بۆ خۆیان ڕاکێشابوو و بە شێوەیەکی کارەساتاوی بونیادی بارودۆخی هەبویان (quo status) لەرزاندبوو. نەیارانی ڕۆشنگەری بە پشتبەستن بە ڕاستیە بەڵگەنەویستەکان ئەیانتوانی بەشداری ڕاستەوخۆی بیریارانی ڕۆشنگەری لە سیاسەتەکانی ڕۆشنگەریدا پیشانبدەن. کاتێك کوندریسە بوە قوربانی حکومەتی تیرۆرو تام پینی نوسەری دیموکراتی "سەردەمی عەقڵ" بە ئەستەم توانی لەدەست تیرۆر رزگاری بێت، دەرخستنی ئەوەی

# کاتێك رۆشنگەری رەواجی پەیداکرد و پتەو بوو، کۆتایی بە جەنگە مەزهەبیەکان و سوتاندنی مورتەدەکان لە ئاگردا هات، سەردەمی جادوگەری و بەخت گرتنەوە کۆتایی هات، غەیبگۆیی رەونەقی نەما و بڕوابون بە بونی واقعی بەهەشت و جەهەنەم و شەیتان و پەیرەوەکانیان کەمتر و کەمتر بووە.




ری پۆرتەر

کە فەیلەسوفانی رادیکالی رۆشنگەری دواجار کەوتنە ئەو چاڵەوە کە خۆیان هەڵیانکەندبوو، ئاسان بوو.

بەڵام خەتابارکردن یان ستایشی فەیلەسوفانی رۆشنگەری لەسەر ئەوەی لە ١٧٨٩ بە دواوە رویداوە، کارێکی بێهودەو بێ ئەنجامە. بەهەرحاڵ بەگشتی زۆربەی رابەرانی بەرجەستەی ئەم بزوتنەوەیە لەو کاتەدا نەمابون و لەبەر ئەوەش زانینی کاردانەوەیان لەبەرامبەر روداوەکانی شۆڕشدا مومکین نیە. ریفۆرمخوازانی وەك ئاراسمۆس داروین لە بەرەبەیانی شورشدا پیشوازیان لێکرد، بەڵام پاش لەسێدارەدانی لوی شانزەهەم و پەرەسەندنی حکومەتی تیرۆر، هاودڵی خۆیان لەگەڵ شوڕشدا لەدەستدا.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا پرسیاری ئەوەی فەیلەسوفانی رۆشنگەری لە کاتی خۆیاندا چ دەستکەوتێکیان هەبووە، پرسیارێکی بەجێیە. لە زۆرێك لە وڵاتەکاندا هەنگاوە بنەڕەتیەکانی ریفۆرم لەسەر بناغەی بنەماکانی رۆشنگەری داڕێژراوە و زوربەشیان بەهۆی دەوڵەتدارانی رۆشنگەرەوە پراکتیك کراوە. لەم ئاراستەیەدا هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندیەکانی ئاغا و کۆیلە لە نەمسادا لەلایەن جوزێفی دوهەمەوە نمونەیەکی باشە. لوی شانزەهەم ئەرکی چارەسەری قەیرانی دارایی فەرەنسای بە تۆرگۆی فەیلەسوفی رۆشنگەری سپارد. تۆرگۆ نەیتوانی ئەم قەیرانە چارەسەر بکات، بەڵام هەر کەسێکی دیش لەبری ئەو دابنرایە سەرکەتوو نەئەبوو لە چارەسەرکردنیدا. لە ئینگلتەرا قوتابخانەی تازەی ئابوری سیاسی کە بە هۆی ئابوریزانە سکۆتلەندیەکانەوە داڕێژرابوو، پێشوازی لێکرا و بەهۆی پیت و لایەنگرانیەوە درێژەی پێدرا. رادیکالیزمی

فەلسەفی سود باوەڕی (utilitarian) کە بەهۆی جرمی بنتامەوە ورد کرابوەوە، کاریگەرییەکی نکۆڵی لێکراوی لە چاکسازی ئیداری سەدەی نۆزدەهەم و بەتایبەت لەسەر ڕێکخستن، ڕەچاوکردن و جێبەجێکردنی یاسای بەناوبانگ بە یاسای فەقیری هەبوو.

ڕەنگە دۆزینەوەی ئەو هەنگاوانەی مۆنتیسیکۆ، ڤۆلتێر، دیدرۆ، دالامبێر، مابلێ یان مۆرول پێشنیاریان کردووە و بەڕاستی پراکتیك کراون ئەستەم بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ڕاستیە پتر لەوەی سەرنەکەوتنی فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری پیشان بدات، شکستی کارەساتئامێزی دەرباری فەرەنسا لە بوژانەوەی کاروبارە دەوڵەتیەکان ئەسەلمێنێ. بەهەرحاڵ فەیلەسوفە بەرجەستەکان لە لوتکەی سەردەمی ڕۆشنگەریدا لە سەرەتادا بەدوای دۆزینەوەی ڕێگەچارەی سیاسی واقعبینانە و پێشوەخت دیاریکراوەوە نەبوون، بەڵکو سەرقاڵی سەرەکیان ئەوە بوو بابەتەکانی ڕەخنەی خۆیان هەستپیکراو و قابیلی تێگەیشتن بکەن و بە یارمەتی لێکۆڵینەوە داهێنەرەکانیان کە لەسەر بناغەی عەقڵ دامەزرابوو، تێگەیشتنێکی تازە و ئینسانی تر و زانستی تر بۆ مرۆڤ وەك بونەوەرێکی سروشتی و کۆمەڵایەتی پێشکەشبکەن. ئەوان کەمتر خەریکی پێشکەشکردنی پرۆژەی ورد و زیاتر خەریکی شیکردنەوەی مەسەلەکان بوون، کەمتر خەریکی وەرگرتنی ئەنجام و زۆرتر خەریکی هێنانە پێشی پرسیارگەلی لەم چەشنە بوون: سروشتی مرۆڤ چیە؟ ئەخلاق لەسەر چ بنەمایەك بیناکراوە؟ ئایا مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە یان نا؟ وەك دیدرۆ لە دوا شانۆنامەیدا ئەپرسێت: ئایا مرۆڤ بەسروشت چاکە یان خراپ؟ ئەم بەرهەمە کە بە شاکاری دائەنرێت، گێژەڵۆکەیەکی سەرسوڕهێنەرە لە پرسیار و دودڵی و ئاڵۆزگەلێك کە هاوار ئەکەن بۆئەوەی بەشێوەیەکی جەوهەری بناغەی مۆدێرنە پێکبهێنن.

زانستی مرۆڤ چۆن دروست ئەبێت؟ چ شتێکی ڕاست و چ شتێك هەڵەیە؟ ئایا مرۆڤ تەنها مەکینەیەکە کە کارەکانی بەهۆی جینەکان یان کاردانەوە کیمیایەکانەوە ڕێك ئەخرێت؟ یان مرۆڤ خاوەن ئازادی ئیرادەیە؟ یان ڕەنگە وابزانێت کە خاوەن ئیرادەی ئازادە؟ مرۆڤ لە کوێوە هاتووە و بۆ کوێ ئەچێت؟ هەموو ئەم پرسیارانە چەندین جار هەندێکجار بە تەنز و گاڵتەئامێز و هەندێکجار بەشێوەی فەلسەفی هێنراونەتە ئاراوە. ئەوەی گومانی تیا نیە ئەوەیە لێکۆڵینەوە بەردەوام لەبارەی ماهیەتی مرۆڤ و سەرچاوەی ڕەفتارەکانی کە بە پرۆژەی ڕۆشنگەری دەستی پێکرد، بووە هۆی نەفیەکی ڕادیکالی یان لانیکەم دورکەوتنەوە لەو تێزە تەقلیدی و قەبوڵکراوانە لەبارەی مرۆڤ، ئەرکەکان و چارەنوسیەوە، ئەو تێزانەی کە کەنیسەی مەسیحی لە ڕێگەی بنەما ئاینی و دینیەکانی خۆیەوە بەدرێژایی سەدەکان ڕەهەندێکی قودسی و ئاسمانی پێبەخشیبوو.

مێژوناسان لەبارەی ئەوەی بەرنامە سیاسیە ڕاگەیەنراوەکانی ڕۆشنگەری لە کرداردا تا

چ ئاستێك رادیكال و جێی رەزامەندی بون، بۆچونی جیاوازیان هەبوو. ئەوەی پێدەچێت بەڵگەنەویست بێت ئەوەیە كە رادیكالیزمی واقعی رۆشنگەری ئەگەڕێتەوە بۆ جیابونەوەی لەو چوارچێوە تێگەیشتنە مەزهەبی و ئاسمانیە بۆ مرۆڤ و كۆمەڵگا و سروشت، تێگەیشتنێك كە لە كتێبە پیرۆزەكاندا لە قاڵبی وەحیدا هاتووە و بە هۆی كەنیسەوە سەلمێنرابوو و زانستی ئیلاهیاتیش شكڵێكی عەقلانی پێبەخشیبوو، لە سەكۆكانی وتاربێژی و ئامۆژگاری و قوتابخانەكانەوە ئەخوێنران. لە سەرەتای كۆتاییەكانی سەدەی حەڤدەهەمدا ئەسقەفی فەرەنسی بوسو كە بەرجەستەترین مێژونوسی ئەوروپی بوو كتێبێكی بە ناوی "مێژوی جیهانی" (History Universal)وە نوسی. ئەو هەموو مێژوی مرۆڤی بە كەمتر لە شەش هەزار ساڵ و سەرجەم كاروباری مرۆڤی بە ملكەچی خواستی خودایی ئەزانی، لەم مێژووەشدا جێگەیەكی بۆ چینیەكان دانەئەنا(خاڵێك كە ڤۆڵتێر كینەئامێزانە بە بیری ئەهێنایەوە). بۆ مێژوونوسی مەسیحی گونجاوترین شێوەی نوسینی مێژوی مرۆڤ، لێكۆڵینەوەی بوو وەك بابەتی تەقدیری ئیلاهی. بە پێچەوانەوە مێژوونوسی فەلسەفی كە ڤۆڵتێر پێشەنگی بوو كارەكانی مرۆڤی لە سروشت و كۆمەڵگادا ئەكردە بابەتی لێكۆڵینەوەكانی. كتێبی "مێژوی تێكشكان و دارمانی ئیمپراتۆری رۆم"ی بەرهەمی گیبۆن جۆرێك مێژوی سروشتی بۆ مەزهەبی مەسیحیەت پێشكەش ئەكرد. بەپێی تێگەیشتنی گیبۆن مەسیحیەت لەبەر چەند هۆیەكی بەتەواوی سروشتی یان لاوەكی پەیدا بوو و پەرەیسەند. فەیلەسوفانی رۆشنگەری لە شێوازە مێژونوسیەكەدا قاڵبی هەڵسەنگاندنی مرۆییان خستە جێگەی هەڵسەنگاندنی ئیلاهی (قاڵبێك كە لە ڕاستیدا تەبا بوو لەگەڵ دیدی گشتیاندا بۆ مرۆڤ).

بەمشێوەیە رۆشنگەری هەنگاوێكی چارەنوسسازی لە داماڵینی دین و عەلمانیەتی بیركردنەوەی ئەوروپیدا نا. ئەمە بە مانای ئەوە نیە كە هەموو فەیلەسوفانی رۆشنگەری باوەڕیان بە خودا نەبوو یان سەردەمی مەزهەبی بون تەواو بوو بوو. بە هیچ شێوەیەك وا نەبوو. لە راستیدا بڕوابون بە مەسیحیەت و رۆحانیەت لە كاردانەوە بەرامبەر بە شۆڕشی گەورەی فەرەنسیدا زۆر بە بەهێزی لە سەرتاسەری ئەوروپادا ژیایەوە. بەڵام پاش رۆشنگەری مەسیحیەت دەسەلاتی خۆی لە بوارە كلتوری و كۆمەلایەتیەكاندا لەدەستدا. بە كورتی رۆشنگەری سنورێكە كە لە لایەكەوە دانتێ، ئەراسمۆس، برنینی، باسكال و میلتۆن (كە هەمویان هونەرمەندان و نوسەرانی گەورەی مەسیحی بون) و لەلایەكەی ترەوە شۆپنهاوەر، جۆرج ئەلیوت و داروین راوەستاون. ئەو قسەیە لە راستیەوە دور نیە كە كاتێك رۆحی مرۆڤ لە قاڵبە مەزهەبیەكەی دوركەوتەوە، قاڵبی تازەی رۆمانتیزمی بۆخۆی داهێنا.

كاتێك رۆشنگەری رەواجی پەیداكرد و پتەو بوو، كۆتایی بە جەنگە مەزهەبیەكان و سوتاندنی مورتەدەكان لە ئاگردا هات، سەردەمی جادوگەری و بەخت گرتنەوە

کۆتایی هـــات، غەیبگۆیـــی ڕەونەقی نەما و بڕوابون بە بونی واقعی بەهەشت و جەهەنەم و شەیتان و پەیڕەوەکانیان کەمتر و کەمتر بووە. بە یەك ڕســـتە بڕوابون بە میتافیزیکیا لە بواری ژیانی گشـــتی کرایە دەرەوە. هەستپەرســـتی ڕۆمانتیکیەتی ســـەدەی نۆزدە بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی مەعنەوی کە بەمشێوەیە پەیدا بووبوو، ئەبوو بەشـــێوەیەکی تایبەتی خۆی دەســـتی بکردایە بە پیرۆزکردنی سروشت و نەریتێکی تازە و پێش هەموو شـــتێك نیشتیمانپەروەری وەك دەرکەوتـــەی ڕۆحی گشـــتی دابهێنایە. ئەڵبەتـــە مەزهەب درێژەی بـــە ژیانی خۆیدا بەڵام هێـــواش هێواش بناغەکانـــی خۆی لە زانین، زانست و هەروەها لە هونەردا لەدەستدا. لەڕاســـتیدا ڕۆشـــنگەری بایەخی مەزهەبی لە هەموو بوارەکاندا لاوازکرد.

هەموو ئـــەم گۆڕانکاریـــە مەزنانە لە یەك شـــەودا ڕویان نەدا. بەڵام بەڕاســـتی ڕویاندا. بۆچی؟ چەندان هێزی دیاریکراوی ئاشـــکرا بـــەم ئاراســـتەیە کاریـــان ئەکرد، بـــۆ نمونە سەرکەوتنەکانی لێکۆڵینەوە زانستیەکان. بەڵام ئەوە تێگەیشـــتنێکی تـــەواو گومراهکەرانەیە گوایە زانســـت لە ڕیزبەندی جەنگێکدا دژ بە مەزهەب دەرگیر بووە. بە پێچەوانەوە زۆرێك لە زانایانی ســـەدەی هەژدە خۆیـــان پیاوانی دینی بوون. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دۆزینەوە زانســـتیەکانی سەدەی هەژدە لە پاڵ شێوەکانی تـــری لێکۆڵینەوەدا، بەردەوام تێگەیشـــتنێکی یەکتایـــان بۆ زەمەن و شـــوێن لاواز ئەکرد، تێگەیشـــتنێك کە بـــۆ بایەخی ئەفســـانەکانی کتێبـــی پیرۆز (باغی بەهەشـــت، ڕوداوەکانی بتلهام، حەواریەکانی مەسیح و هتد) پێویست بوو. مەســـیحیەت لەو کاتەوەی کە ڕۆشنبیران هەوڵیاندا مەسەلەگەلی وەك ملیاردەها ئەستێرە لە زەمـــان و فەزای بێ کۆتاییـــدا، جۆرە بێ ئەژمارەکانی ئاژەڵـــە لەناوچوەکان و هەروەها هەمەڕەنگی زمانی، کلتوری و نەژادی مرۆڤ، نەك بە هـــۆی ئیمانی مەزهەبیـــەوە بەڵکو بە ڕونکردنەوەی زانستیەوە وەڵام بدەنەوە، توشی گرفت بوو، و لەو کاتەوە بەردەوام هەوڵیداوە خۆی لەگەڵ زانســـتە تازەکاندا بگونجێنێت. بە پێچەوانەوە ڕۆشـــنگەری گیرۆدەی سەیرو سەمەرەی زەمەن و فەزای بێ سنور بوو.

لە هەمان حاڵەتدا ئەبێت جەخت لەو خاڵە بکرێت (وەك لە فەســـڵی چـــواردا وترا) کە ڕۆشنگەری سەردەمێك بوو کە تیایدا گروپێك ڕۆشنبیری ســـکولار و نامەزهەبی دەرکەوتن کـــە بـــۆ یەکەمجار خـــاوەن دەســـەڵات و فراوانیەك بون کە بتوانن ڕوبەڕوی ڕۆحانیەت ببنەوە. ڕۆحانیەت بە درێژایی چەندان ســـەدە دەســـەڵاتی بەســـەر ناوەندەکانی پەیوەندیدا هەبووە (کەنیســـە و مینبەرەکانی ئامۆژگاری)، پلەوپایە ســـەرەکیەکانی دەزگاکانی پەروەردە (قوتابخانـــە، زانکۆ و حـــەوزە دینیەکان)ی لەبەر دەســـتدا بووە و بە شـــێوەیەکی یاسایی بڵاوبونەوەی هەواڵ و زانیاری کۆنتڕۆڵ ئەکرد.

هەموو ئەمانە لەســـەردەمی ڕۆشـــنگەریدا گۆڕان. لەســـەدەی هەژدەدا بەشێکی گەورە لـــە ئەهلی کلتـــور کـــە ســـەربەخۆبون لە کەنیســـە توانیان لە ڕێگەی کارە زانســـتی و

ئەدەبیەکانیانەوە بژین. هەندێك لە رێگەی رۆژنامەگەریەوە بخۆو مەمرەیەکیان پەیا ئەکرد و هەندێکی تر لە رێی نوسینەوە دەوڵەمەند بوون. ڤۆڵتێر ئەیگوت کە لە لاویتیدا کۆمەڵگا لەژێر دەسەڵاتی نەجیبزادەکاندا بوو، پاشان ئەهلی قەڵەم دەسەڵاتیان بەسەرا پەیدا کرد. بانگەشەکەرانی سیاسی رۆشنگەری سودیان لە ئامێرە تازەکانی پەیوەندی وەك رۆژنامە و گۆڤار وەرئەگرت بۆ بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانیان (ئەکرێت بڵاوکراوەی تەماشاکەر بە جۆرێك ئامۆژگاری نادینی دابنرێت).

وەرگرانی نوسەرانی ئەمجۆرە بڵاوکراوانە، خوێنەرانێکی روو لە زیاد بون کە بە تامەزرۆییەوە بەدوای شێوە تازەکانی نوسینەوە بوون وەك وتار، رۆمان و بیوگرافی. پاشتر کارو کاریگەری ئەم نوسەرانە بە هۆی دەزگا نادینیەکانی وەك یانە ئەدەبی، کلتوری و ئەنجومەنە زانستی و کلتوریەکان کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد زیادی کرد. بەمشێوەیە دەزگای تازە چینی چوارهەم (کە زۆر بە گشتی ئەتوانرێت بگوترێت بڵاوکراوەکان) ململانێی لەگەڵ چینی یەکەم واتە پایەو پلە بەرزەکانی رۆحانیەت بۆ راکێشانی چینی سێهەم (کە بە شێوەیەکی تەقلیدی حکومەتی بەدەستەوە بوو) و چینی چوارهەم (کە تازە شکڵی وەرئەگرت و دەسەڵاتی روی لە زیادبوون بوو) واتە خەڵکدا ئەکرد.

هەڵسەنگاندنی وردی گرنگی ئەو گۆڕانکاریانەی رۆشنگەری لەرێگەی دەرکەوتنی ئەم گروپە بەهێزەی ئەهلی کلتورەوە (**literati**) یان بە دەربڕینێکی تر لە رێگەی رۆشنبیرانەوە دروستیکرد، ئاسان نیە. لەسەدەکانی یەکەمی سەردەمی تازەدا کە زانین و بیروڕاکان هێشتا تارادەیەکی زۆر بەهۆی ئەو رۆحانیانەوە تەفسیر ئەکرا کە بە شێوەیەکی فەرمی وەفاداری بەرپرسیارە باڵاکان بون، پەیدابونی بیروڕاکان لەسەر بناغەی ئەو پرۆژ ئەرسۆدۆکسیانە شکڵیان وەرئەگرت کە قابیلی پێشبینی بون و رەنگە بۆ بونیادی بەرێژە راوەستاوی کۆمەڵگای تەقلیدی گونجاوتر بوون.

رۆشنبیرانی تازە بە پێچەوانەی رۆحانیەتەوە تەنها وەفاداری گروپێکی تایبەت نەبون. ئەوان هەندێکجار بێ پارێزەرەکانیان و هەندێکجار بۆ موشتەریەکانیان ئەیاننوسی، بەڵام زۆرتر بۆ خزمەکانی خۆیان یان بۆ کڕیارانی بەرهەمەکانیان ئەیاننوسی کە هەستیان ئەکرد قسەیان لەگەڵدا ئەکەن. بەهەمان شێوە کە نوسەرانی تازە خۆیان لەو کۆتوبەندانە رزگار ئەکرد کە رۆحانیەکانی سنوردار ئەکرد، بەرهەمهێنانی بەرهەمە

**لە زۆرێك لە وڵاتەکاندا هەنگاوە بنەڕەتیەکانی ریفۆرم لەسەر بناغەی بنەماکانی رۆشنگەری دارێژراوە و زوربەشیان بەهۆی دەوڵەتدارانی رۆشنگەرەوە پراکتیك کراوە**

ئەدەبـــی و هونەریـــەکان هەمەڕەنگیەکـــی زیاتری وەرئەگرت. بەمشـــێوەیە ژمارەی ئەو بڵاوکراوانەی بۆ راکێشانی خوێنەر ململانێیان ئەکرد، چەند بەرابـــەر بوو. ئەم حاڵەتە خۆی هەمەڕەنگـــی و جیـــاوازی روو لـــە زیادی کۆمەڵگای پیشـــان ئەدایەوە و توندی ئەکرد. کۆمەڵگایـــەك کە بـــە پەرەســـەندنی رادەی خوێنـــدەواری و زیادبونـــی حەزی خەڵك بۆ خوێندنەوەی رۆژنامـــە و بڵاوکراوە، بایەخی زیاتری بە بەرهەمە نوسراوەکان ئەدا.

ئاماژەکردن بۆ ئەو خاڵە لە جێی خۆیدایە کـــە هەمەڕەنگـــی بڵاوکـــراوەکان بوە هۆی سەربەخۆیی زیاتری نوســـەران و خوێنەران. بـــە دەربڕینێکـــی تـــر میراتی رۆشـــنگەری رزگاربونـــی بیرکردنـــەوەی ئەوروپی بوو لە چوارچێوەی تەسکی بیرکردنەوەی دۆگمایی. بەمشێوەیە ئەبێت دوا کاریگەری رۆشنگەری بە کاریگەریەکی رادیکال هەڵســـەنگێنرێت. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەم ئەنجامگیریە زیاد لە پێویست ســـادەیە و جێگەی گومانە. بیـــروڕاکان هەرگیـــز ناتوانن ســـەروتر لەو کۆمەڵگایە بفڕن کە لەناویـــدا ئەژین. لێرەوە زۆرێك لە بیرکردنـــەوە داهێنەر و بوێرەکانی ســـەدەی هەژدە بەخێرایی گۆڕان و بوون بە پایەکانی رژێمی باڵادەست لە سەدەی نۆزدەدا.

زانســـتە مرۆیـــە تـــازە و ســـەرەڕۆکانی رۆشـــنگەری کە دینامیکیەتـــی کۆمەڵایەتی، زیادبونی ســـەرژمێری، بەرهەمهێنانی سامان و زیادبونی خۆشگوزەرانی شیئەکردەوە، بوو بە ئابوریەکی سیاســـی پۆزەتڤیزمی ("زانستێکی وەڕسکەر) کە ئەرکی ئامادەکردنی خۆراکی گونجـــاوی ئایدۆلۆژی بوو بۆ حکومەتگەلێك کـــە ئەیانویســـت نیشـــانی بـــدەن رژێمـــی ســـەرمایەداری نەگـــۆڕ و ناچارییە و فەقیری مرۆڤی فەقیر گوناهی خۆیەتی.

دەروناسی کۆندیاك و هلوتیوس کە بڕوایان وابوو مرۆڤ لێوان لێـــوە لە توانای گۆڕان و پەرەسەندن، بە جۆرێك چاککرا و بەکارهێنرا کە منالانی لـــە قوتابخانـــە و گەورەکانی لە فەزای کاردا ناچار بە رەچاوکردنی رێکخستن و گوێڕایەڵیی کرد. ئەوەی سەردەمێك دیدی ئەفســـونکەر بوو بۆ مرۆڤ وەك بونەوەرێکی مەکینەئاسا (رزگار بوو لە گوناهی سەرەتایی)، بوو بە کابوســـێکی واقعی فەزای کارخانە لە سەردەمی مەکینەدا.

رۆشـــنگەری یارمەتی مرۆڤی دا بۆ ئەوەی لە کۆتوبەندی رابـــردوو رزگاری بێت، بەڵام نەیتوانی رێگری لە دروســـتبونی کۆتوبەندی تازە بکات. ئێمە هێشـــتا لە حاڵەتی خەباتداین دژی کێشـــە و مەسەلەکانی کۆمەڵگای شاری پیشەســـازی و مۆدێرن کە رۆشنگەری مامانی بوو، لەم خەباتەشـــدا بە ڕادەیەکی زۆر سود لەو بنەما شیکاریە کۆمەڵایەتی، بەها مرۆیی و ئەزمونە زانستیانە وەرئەگرین کە فەیلەسوفانی رۆشنگەری بەرهەمیان هێنا. ئێمە ئەمڕۆ هێشتا هەر وەك نەوەکانی رۆشنگەری ماوینەتەوە.

**سەرچاوە:**

دوا فەسڵی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:

ری پورتر: مقدمەای بر روشـــنگری. ت: سعید مقدم. تهران: اختران ١٣٧٨.

# کۆمەڵگای دوای عەلمانییەت

نووسـینی: یۆرگـان هابرماس
و. لـە ئینگـلیـزییـەوە: فـوئاد عـەبدولڕەحمان

### تێبینی

لە راســـتیدا هابرماس ئەم دەقەی وەکو لێکۆڵینەوەیەك نووسیوە بۆ خوێندنەوەی لە وانەیەکیدا لە پەیمانگای نیکسۆسی سەر بە زانکۆی تیلبێرگ لە هۆڵەندا، لە مارسی ساڵی ٢٠٠٧. پاشان لە مانگی ئەپریلی ســـاڵی ٢٠٠٨ لە رۆژنامەی (بلاتەر ڤۆر داوتسخ ئوند ئینتەرناسیۆناله پۆلیتیك)دا بلاوی کردۆتەوە. من لەبەر گرنگیی بابەتەکە، بە هەندێك دەستکاریی کەمەوە وەرمگێڕایە سەر زمانی کوردی.

"ئەگـــەر بمانەوێ بەلانســـێك لـــە نێـــوان هاوولاتیو کولتوورەکەیدا فەراهەم بکەین، پێویستە دەرگا لە رووی هەردوو عەقڵییەتی عەلمانیو ئایینیدا بۆ فێربوونی یەکتر قبوولکردن والابکەین."

کۆمەڵگای دوای عەلمانییەت (**post_secular society**) لە چەند روویەکەوە دەبێ بە قۆناغی دەوڵەتی عەلمانیدا تێپەڕ بووبێت. لەبەر ئەوە، دەستەواژەی (کۆمەڵگای دوای عەلمانییەت)، دەتوانین تەنها لە نێو ســـنووری ئەو جۆرە کۆمەڵگایانـــەدا بەدیی بکەین، کە لە رووی ئابوورییەوە

**"ئەگەر بمانەوێ بەڵانسێك لە نێوان هاووڵاتیو کولتوورەکەیدا فەراهەم بکەین، پێویستە دەرگا لە رووی هەردوو عەقڵییەتی عەلمانیو ئایینیدا بۆ فێربوونی یەکتر قبووڵکردن والابکەین."**

دەوڵەمەند بنو گەشـــەیان کردبــێ. وەك: وڵاتانی ئەورووپای رۆژئاوا، یان ئەمریکاو کەنەداو ئوسترالیاو نیوزیلاند، کە پەیوەندیـــی ئایینیی بە کۆمەڵگاوە تیایاندا بە شێوەیەکی تەواو بەرچاو بەرەو لاوازی، یان نەمان چووە. ئەمە بە تایبەتی لە دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە روویداوە. هەڵبەت هاووڵاتییانی نێو ئەو وڵاتانە، لە رووی هۆشیارییەوە بە تەواوی بوون بە بەشـــێك لە قۆناغی کۆمەڵگای عەلمانی. ئەو هۆشـــیارییە عەلمانییەشیان گۆڕانی لە رەفتارو بیرو رای ئایینییاندا کردووە، بە جۆرێك، کە بۆتە مۆرك بۆ کۆمەڵگاکانیانو بۆتە زەمینەســـازییەك بۆ پێ خســـتنە نێـــو ســـنووری کۆمەڵـــگای دوای عەلمانییەتەوە. لەمەدا، خواستو هەوڵی هاووڵاتیانی ئەو کۆمەڵگایانە، بۆ بنبڕکردنی دامودەزگا ئایینییە تەقلیدیـــەکانو داهێنانی فۆڕمی نـــوێ لە ئایینو ئایینزا، هەمیشە بۆ ئەوە بووە، کە بەها کۆمەڵایەتییە بنچینەییەکانیان بگێڕنەوە، کە لە کیسیان چووە.(١)

دەرگای گفتوگـــۆ کردنەوە لەســـەر بەعەلمانییەت کردن:

بێگومـــان، گۆڕانکارییەکانی جیهان هەمیشـــە لە دەرەنجامی ئـــەو قەیرانو پێکداداناـــەن، کە بە ئاشکرا پەیوەندییان بە مەسەلە ئایینییەکانەوە هەیە. ئەم راستییە ئەو گومانەشمان لەلا دروست دەکات، کە ئایـــا ئایین بەرەو کـــزیو لاوازی چووبێت. چونکە دەبینین، لە تێکڕای جیهاندا تەنها هەندێکی کەم لە کۆمەڵگا هەن، کە گریمانەی ئەو بۆچوونە دەســـەلمێنن. لە هەمان کاتـــدا دەبینین ماوەیەکی دوورو درێـــژە پەیوەندییەکی زۆر نزیك لە نێوان تازەگەری لـــە کۆمەڵـــگاداو بەعەلمانییەتکردنی جەماوەردا دروست بووە.(٢)

هەڵبەت گریمانەی ئەو بۆچوونە سێ لایەنی هەیە، کە وەك ســـەرەتا لۆجیکین: یەکەم: پێشـــکەوتنی زانســـتیو تەکنۆلۆجی بۆتە یارمەتیدەری عەقڵی مرۆڤ بۆ تێگەیشـــتن لە دیوە پەنهانەکانی جیهان،

به رادەیەك، كە بشـــێ بە ئەزموون روونكردنەوەو لێكدانەوە بۆ هۆكاری رووداوەكان بكرێ. بەڵام لە هەمان كاتیشدا، عەقڵی زانستیو رووناكگەرایی بە ئاسانی ناتوانێ هاوسەنگی لە نێوان عەقڵی ئایینیو عەقڵی میتافیزیكدا بكات. دووەم: هەرچی كڵێسەو دامو دەزگا ئایینییەكانـــی تریش، كە هەن، لەگەڵ هەموو ئەو ئەركە لاوەكییە جۆراوجۆرانەیان، كە لە نێو سیســـتمی كۆمەڵایەتیدا هەیانبووەو هەیانە، بـــەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا نەیانتوانیوە دەســـەڵاتی راستەوخۆیان بەسەر یاساو سیاسەتو بەرژەوەندیی گشتیو خوێندنو پەروەردەو زانستەكاندا بسەپێنن. ئەمەش لەبەر ئەوەیـــە، كە دەتوانین بڵێین، خۆیان تەنها بە مەســـەلەی رێكخســـتنی كەشی پرسە بۆ مردووەكانو مردوو ناشتنو بەهەشتو دۆزەخەوە خەریـــك كردووە. ئایینیان خســـتۆتە ســـنووری خواپەرســـتیو چاكەو خراپەی مرۆڤە تاكەكانەوە. بەو هۆیەشەوە، ئەو ئەركە كۆمەڵایەتییە گرنگەیان فەرامۆش كردووە، كـــە تاكەكانی نێو كۆمەڵگاو جەماوەر پێویســـتیان پێیەتی. بـــۆ نموونە: ئازادیی تـــاكو یەكســـانیو دادپـــەروەری كۆمەڵایەتیو دیموكراسیو مافی مرۆڤو مافی جەماوەر. سێیەم: گەشەكردنی پیشەســـازی لە ئەوروپادا بە رێگای بەرهەمی كشتوكاڵییەوە قۆناغێكی دوای پیشەسازیی هێنایە كایەوە، كە بووە هۆی خۆشگوزەرانیی باری ژیانی مـــرۆڤو بەرقەراربوونی ئەمنو ئاسایشـــی كۆمەڵایەتیو كەمبوونەوەی مەترســـیو دژواریو ســـەختیی ژیان. ئەوەش بووە هۆی فراهەمبوونی ئاسایشی نەتەوەییو دەوڵەتی. ئیتر مرۆڤەكانی ئەو كۆمەڵگایانە كەمتر پێویســـتیان بەوە بووە، كە بە بەردەوامی خۆیان بۆ قەیرانی گەورەو لە ناكاو لە ئامادەباشیدا بنو ترسو دڵەڕاوكێیان لە ئاییندەیان هەبـــێ. تەنانەت تاكەكانی ئـــەو كۆمەڵگایانە، بە شـــێوەیەكی گشتی، ئەو ئیمانو هەستی ترسەشیان لا نەماوە، كە قەدەرێكی یەزدانی، یان گەردوونی، لە ناكاو تەفروتونایان بكا.

ئەمانە، ئەو هۆكارە ســـەرەكیانە بوون ســـەبارەت بە داهاتنی عەلمانییەت. بەڵام لە لای شـــارەزایانی زانســـتی كۆمەڵایەتی، مەســـەلەی كۆتاییهاتن بە قۆناغی عەلمانییەت ماوەی زیاتر لە بیســـت ساڵە گفتوگۆو مشتومڕی زۆری لەسەرە.(٣)

پاشـــان، لە ئەنجامی هەندێ رەخنەی بێ بنەما، لە تێڕوانینی ئەوروپاییەوە، قســـە لەسەر ئەوە دەكرێ قۆناغی مێژوویی عەلمانییەت كۆتایی هاتبێت.(٤) زۆر لـــە ئەمریكاییـــەكان، لەگەڵ ئـــەوەی، كە لایەنگریـــی خۆیان بۆ ئایین نیشـــانداوە، بەڵام لە هەمان كاتدا بـــوون بە ســـەرەنیزەی تازەگەری. دیارە، بـــۆ ماوەیەكی زۆرە، بـــوون بە هەڵگری دروشمو رێبازی عەلمانییەتو بەردەوامیش بوون بـــە پارێزگاریكەری بنەماكانی. نـــەك هەر ئەوە، بەڵكو هەوڵیان داوە، ئەو عەلمانییەتو تازەگەرییە دیپـــۆرت بكەن بـــۆ وڵاتانی تری جیهـــان. لەم روانگەیەوە، پێشـــكەوتنی ئەوروپـــا، كە مۆدێلی ئاوەزگەراییـــە (**rationalism**) رۆژئاواییەكەی لە ناوچەكانی تری جیهاندا بەكار دەهات، لە راستیدا تایبەتمەند (**exception**) بوو، نەك گشتی (**norm**). لەبەر ئەوە، ئەو مۆدێلـــی ئاوەزگەراییە رۆژئاواییە لادان بوو لە رێگا راســـتەقینەكەی خۆی. ئیتر نە ئێمەی رۆژهەڵاتیو نە ئەوانی رۆژئاوایی، رێگای راستمان نەگرتە بەر.(٥)

لە ســـەر ئەوەشەوە، ئەو ســـێ دیاردەیەی چوون

بە نێو یەکتریدا، پێکەوە بـــوون بە هۆی داهاتنی بیرو بۆچوونێکی جیهانی بـــۆ گەڕانەوە بۆ ئایین. ئەوەش وای کرد، کە نوێنەرایەتیکردنی مەسیحی بۆ مژدەبردنـــی ئایینـــی (**missionary**) دووبارە ســـەرهەڵبداتەوە، توندڕەویی نەژادی (ئوســـوڵی‌و ســـەلەفی) دەربکەوێ، بەسیاسەتکردنی ئایین، (بۆ نموونە: ئیسلامی سیاســـی) بڵاوبێتەوە، خۆرسکی توندوتیـــژی لە هەنـــدێ ئایینـــی جیهانیدا قۆرخ بکرێت.

یەکەمین نیشـــانەی ئەم راســـتییانە، یەکەمجار لە ڕێبازی ئەرتۆدۆکســـیدا بەدی کرا، بەتایبەت لای کۆنســـەرڤاتیڤەکانو ئەو گرووپانەی، کە ســـەر بـــە دامەزراوە ئایینییەکانو کڵێســـەکان بوونو بە بەردەوامی لە پەرەســـەندندا بـــوون. تەنانەت ئەم دیاردەو نیشانانە لای هیندۆسەکانو بووداییەکانیشدا بـــەدی کران. جگە لەوەش، بـــە هەمان رادە لای هەرســـێ ئایینە یەکتاپەرستییەکانیشدا (جوولەکەو مەسیحی‌و ئیســـلام) دەرکەوتن. لە هەموو ئەمانە گرنگتر، بڵاوبوونەوەی ئەو دامەزراوە ئایینیانە بوو لە ئەفریقاو لە وڵاتانی رۆژهەڵاتو لە باشـــووری ئاسیادا. سەرکەوتنی مژدەبەرانیش دیار بوو لەوەدا بوو، کە بە نەرمی‌و بێ توندوتیژی ئەو دامەزراوە ئایینانەیان هەڵسووڕاند.

هەڵبەت بازدان بەسەر دەمارگیریی نەتەوەگەری‌و نەتەوەپەرســـتی‌و رۆڵـــی هەمـــە کولتووریـــی کڵێســـەی کاتۆلیکی، رۆڵی باشـــتری هەبووە بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ جیهانگیری، یان خۆخزاندنە نێـــو جیهانگیرییەوە، زیاتر وەك لەوەی کڵێســـەی پرۆتســـتانتی پەیڕەوی کرد. چونکە پرۆتستانتەکان زیاتر نەتەوەپەرســـتیان کردو لەســـەر ئەو بنەمایە خۆیان ڕێکخســـت. هەر بۆیە وەکو کاتۆلیکەکان لـــە گونجانیان لەگەڵ جیهانگیریدا ســـەرکەوتوو نەبوون. لە نێو هەموو ئەو ئایینانەشدا، کە زۆرترین داینامیکییەتی هەبوو بێت، ئایینی ئیسلام بوو، لەبەر ئەوەی پەیڕەوی بنەمـــای نامەرکەزییەتی کردوو، بە تایبەتی لە باشووری بیابانی گەورەی ئەفریقادا. لـــە بەرامبـــەردا، ئینجیلییەکانیـــش کاریگەرییان هەبوو بەســـەر کۆمەڵگاکانی ئەمریکای لاتینیدا. ئـــەم جـــۆرە نامەرکەزییەتـــە ئایینییـــە بەهـــۆی کاریزمای رابەرایەتییـــەوە فەراهەم بوو. لە رووی ئوســـوولییەتەوە (فەندەمێنتالیـــزم)، کە خێراترین بزووتنەوەی گەشەکردووی ئایینی بوو، بە ئاسانی دەتوانین نموونەی توندڕەوەکان (**Pentecostal**)و موســـوڵمانە رادیکالەکان بێنینەوە. ئەمانە، یان ئەوە بوو دژایەتیی تونـــدی جیهانی تازەگەرییان کرد، یاخود ئەوە بوو خۆیان لەو تازەگەرییە پاراســـتو خۆیان لێ گۆشەگیر کرد. شێوازی خواپەرستییان ئاوێتەیـــەك بوو لـــە رووحانییەتو تیرۆریســـتی، تێکەڵ بە بیرو بۆچوون ســـەبارەت بە رەوشـــتو رەفتاری زۆر توندڕەوانەو گەڕانەوە بۆ لێکدانەوەو پەیڕەوکردنی کتێبە پیرۆزەکان وشـــە بە وشـــەو دێڕ بە دێڕ. بە پێچەوانەی ئەوەشـــەوە، ژمارەیەك بزووتنەوەی ســـەردەمانە داهات، کە لە ســـاڵانی حەفتای سەدەی رابردووەوە چەکەرەیان کرد. بۆ نموونە: بزووتنەوەی هاوســـانیی کالیفۆرنیاییەکان (**Californian’ syncretism**)، کە بوون بە هاوشان لەگەڵ ئینجیلییەکاندا (**Evangelicals**) سەبارەت بە هەوڵی لەنێوبردنی شێوازی کەشی ئایینی. لە وڵاتی یابانیشدا، نزیکەی چوارسەد تایەفەی ئایینی سەری هەڵدا، کە ریشـــەیان بوودیـــزمو ئایینە میللیەکانو

درۆینەکانو باوەڕە شـــاراوەو نهێنییەکان بوون. لە وڵاتی کۆماری میللیی چینیشـــدا چەوساندنەوەی سیاســـی لەســـەر تایەفەی ئایینیـــی فالون جونگ (Falun Gong) بووە هۆی سەرهەڵدانی ژمارەیەکی زۆر لـــە ئایینی نوێ، کـــە موریدەکانیان ژمارەیان گەیشتە هەشتا ملیۆن کەس.(٦)

دواجار، رژێمی ئاخوندەکان لە ئێرانو تیرۆریزمی ئیســـلامی ئاشـــکراترین نموونەن لە بـــێ لغاویی سیاسیو سنوور دانەنان بۆ خۆرسکی توندڕەویو توندوتیژی لە نێو ئاییندا.

لە زۆر باردا، هەرچی هەڵگیرســـانی ململانێکانن، ســـەرچاوەکانیان لەوەوە دێ، کە هەڕەشە بێت لە پیرۆزییەکانو بەزاندنی هێڵی سوور. ئەوەش بووە هۆی یەکەم چەخماخەی ئاگرخستنەوە لە ئاییندا. ئەمەش لە راســـتیدا بووە هـــۆی بەرەنگاریکردنی عەلمانییەت لە ململانێکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستو نەتەوەگەریـــی هیندیو قەیرانی پێکداادان لە نێوان هیندستانو پاکستان.(٧)

هەروەهـــا هەڵمەتـــی کۆکردنـــەوەی دەنگـــی ئایینپەروەران لـــە ئەمریکادا بۆ پەلاماردانو لێدانی عیراق.

پێناسەکردنی کۆمەڵگای دوای عەلمانییەتو پێوەری ئەوەی، کە چۆن هاووڵاتییـــان لە کۆمەڵگایەکی وەهادا لە خۆیان تێبگەن؟

لە راســـتیدا ناتوانم بـــە دورو درێـــژی باس لەو مشتومڕە بکەم، کە لە نێو کۆمەڵناساندا لە ئەوروپادا هەیە سەبارەت بە رەوشی کۆمەڵگای عەلمانی، بە تایبەتی لە رووی رووبەڕووبوونەوەیان بەرامبەر بەو بزاوتو جووڵانەوە ئایینییانەی لە جیهاندا دەبینرێن. بـــە بۆچوونی من، کۆی هەموو ئـــەو زانیارییانەی لـــە سەرانســـەری جیهانـــەوە کۆکراونەتـــەوەو لەبەردەســـتدان، تا ئێستا ئەوە نیشـــان دەدەن، کە پشتگیریی زۆر لە رەوتی عەلمانییەت دەکرێت.(٨)

بـــە بۆچوونـــی من، هـــۆی لاوازیی تیـــۆری بە عەلمانییەتکـــردن (secularization) دەگەڕێتەوە بۆ دەرکەوتنی دەرەنجامی کاڵو ناپوختو ناتەواو لـــە بەعەلمانییەتکـــردنو لە بـــە تازەگەریکردندا (modernization). راســـتیی ئەمە ئەوەیە، کە لە رەهەندی جیاوازیکردن لە نێوان کار لە سیســـتمە کۆمەڵایەتییەکاندا، کڵێسەکانو تایەفە ئایینییەکاندا، بە بەردەوامی خۆیان دەبەســـتنەوە بە ئەرکە ئایینییە بنەڕەتییەکانیانـــەوە، کـــە خزمەتکردنی ئەوقافو شەرعیو ئایینییە. ئیتر لەوە بترازێ، خۆیان بە کارە تراژیدیو خەماوییە گرنگەکانی کۆمەڵەوە خەریك ناکەن. لە هەمان کاتیشدا، تەنانەت پراکتیزەکردنی ئیمانو باوەڕی ئایینیش پەیوەست دەکەن بە مرۆڤی تاکـــەوە لە نێو کۆمەڵگادا، نەك بە کۆمەڵگا خۆی. بەڵام، ئێمـــە دەزانین، کە کۆپەیوەندییەکی توندی کۆی گشتیی سیســـتمی ئایینی بە پراکتیزەکردنی ئایین لە لایەن تاکە کەسەکانەوە هەیە. بەهەر حاڵ، لەگەڵ ئەوەشدا، هەروەکو خۆسێ کاسانۆڤا (Jose Casanova) تەواو خاڵی خســـتۆتە سەر پیتەکان، فەرامۆشکردنی ئەرکی سەرەکیی ئایینو رووکردنە گرنگیـــی لایەنی تاك لـــە نێو کۆمەڵـــگادا، ئەوە ناگەیەنێت، کە ئایین کاریگەریو ئەرکی عەقلانیی خۆی لەدەست دابێت، چ لە بواری سیاسیو چ لە بواری فەرهەنگـــی کۆمەڵایەتیدا، یاخود لە بواری هەڵسوکەوتو رەفتاری ژیانی کەسایەتیدا.(٩)

دوور لە قورســـایی ژمارەییەوە، بە روونی دیارە، گروپو کۆمەڵە ئایینییەکان هێشـــتا هەر هەوڵ بۆ

کورسیی دەسەڵات لە نێو ژیانی ئەو کۆمەڵگایانەدا دەکەن، کــە تاکو رادەیەکــی زۆریش بوون بە عەلمانــی. ئیمڕۆ، دەکرێ هۆشــیاریی خەڵك لە ئەوروپادا بەو جۆرە ببینرێ، کە لە کۆمەڵگایەکی دوای عەلمانییەتــەوە بــن. بە رادەیــەك، کە لە ئێســتادا ئەم خەڵکە پێویستیان بەوە هەبێت دان بە خۆیاندا بگرن لەبــەردەم بەردەوامبوونی کۆمەڵگا ئایینییەکانی، کە لە ڕەوشــێکی عەلمانیشــدا هەر بەردەوام لە پەرەسەندندا بوون.(١٠)

بــە خوێندنەوەیەکی ورد، ســەبارەت بە تیۆری عەلمانییــەت، دەبینین، کەمتر پەیوەندیی بە کرۆك (substance)ەوە هەیــە، بەڵکو زیاتر پەیوەندیی بە پێشبینییەوە هەیە ســەبارەت بە رۆڵی ئاییندەی ئایین. ناونانی کۆمەڵگا نوێیــەکان بە کۆمەڵگای دوای عەلمانییەت، ئاماژەیە بــۆ ئەو گۆڕانەی لە هۆشیاریدا بەدی دەکرێ. من، بەش بە حاڵی خۆم، ئەم گۆڕانە بە سێ جۆر دەبینم: یەکەم: دەرککردنی تەواو بەوەی ئەو ململانێیانەی لە جیهاندا دەخرێنە بــەر بــاس‌و لێکۆڵینەوە، زیاتر پەیوەســت بن بە گۆڕانکاری لــە خەباتی (جیهــادی) ئایینی، کە کاریگەرییان بە گشتی بەسەر گۆڕانی هۆشیاریی خەڵکییەوە هەیە. زۆربــەی هاووڵاتییانی ئەوروپا پێویســتیان بە هیــچ جوڵانەوەیەکــی توندڕەوی نەماوە. بەڵکو ســڵ لە هەموو جۆرە هەڕەشەیەکی تیرۆریزمــی ئایینی دەکەنەوە. لەبــەر ئەوەیە، کە هۆشــیارییان گەیشتۆتە ئاستی ئاسۆی جیهانگیری. ئەمەش بۆتە هــۆی ئەوەی لــە عەلمانییەتدا ئەو تێگەیشتنە نەمێنێ، کە سەرکەوتنی ئایینیی رووحی هیچ بوونێکی هەبێت، یان هیچ واتایەکی لۆجیکیی هەبێت. هەروەها، ئاســتو رادەی هۆشیاریی ئەو مرۆڤانەی لە کۆمەڵــگای عەلمانییەتدا (secular society) دەژین، پەیوەستیی نامێنێ بەو یەقینەوە، کــە پێشــکەوتنی رۆشــنبیری‌و تازەگەریی لە کۆمەڵگادا بــە تەنها دەبێ لە رێگەی کاریگەریی

**کۆمەڵگایەکی تورکی لە بەرلین، یان لە کوێڵن، یان لە فرانکفۆرت، کاتێك، کە هەوڵ ئەدەن نوێژەکانیان لە دەرگای حەوشی ماڵ بەرنە دەرەوە بۆ ئەوەی مزگەوتێکیان بۆ دروست بکرێت، کە لە دوورەوە دیار بێت، ئیتر مەسەلەکە لەوەدا نامێنێتەوە، کە هەر باوەڕ بێت، بەڵکو دەبێتە مەسەلەیەکی پەیڕەو**

ئایینییەوە بەسەر تاکەکانی نێو کۆمەڵگادا بکرێت. دووەم: کاریگەریی ئاییــن تەنها بە جیهانیکردنی نابێت، بەڵکو بەوەشە، کە لە بوارە گشتییەکانی نێو نیشتمانێکدا بێت.

من، لێــرەدا، بیر لەو راســتییە دەکەمــەوە، کە کڵێســەکانو دامــەزراوە ئایینییەکانیش چۆن بە بەردەوامی رۆڵیــان لە لێکدانــەوەی کۆمەڵگادا هەبووە ســەبارەت بە بوارە گشتییەکانی کۆمەڵگا

عەلمانییەکان.(١١)
بە بـــڕوای من، ئەوانـــە توانیویانـــە کاریگەرییان لەســـەر رای گشـــتی هەبێت، ئەوەش بە ڕێگەی بەخشـــینەوەی یارمەتی لە هەندێ بۆنەدا. چ کەم بێتو چ زۆر بێت، چ پەسەند بکرێتو چ پەسەند نەکرێـــت. کۆمەڵگا هەمـــە ڕەنگییەکانی ئێمە بە ئاســـانی دەکەونە ژێر کاریگەریی دەستێوەردانی ئەنجومەنـــی بریـــقو باقـــەوە، لەبەر ئـــەوەی بە بەردەوامـــی دەخلســـکێنە نێـــو دووبەرەکییەوەو دەکەونە ململانێی سیاســـیی سەختەوە. بۆ نموونە، لە کۆمەڵـــگا هەمەرەنگییەکانی ئێمەدا ناکۆکییەك هەیە لەسەر شـــەرعییەتو ناشـــەرعییەتی منداڵ لەباربـــردن، یان لەســـەر منداڵبوونی لوولەیی، کە ئەمانە مەســـەلەی جێ مشـــتومڕی پزیشـــکین. هەروەها مشتومڕ لەسەر شەرعیەتو ناشەرعیەتی ئاژەڵ کۆپیکردن، یان مەســـەلەی دژ بە ئازاردانو چەوســـاندنەوەی ئاژەڵ، یان مەســـەلەی گۆڕینو پیســـکردنی ژینگەو کەشو هـــەوا. جگە لە زۆر مەســـەلەی تری لەم جۆرە، کە جێی مشـــتومڕن لەسەر بنەمای ڕەوشـــت. بۆ زیاتر نزیککردنەوەی مەســـەلەکە، ئەوە بیربخەمەوە، کـــە زیندوویيو چالاکیی تایەفە ئایینییـــە بیانێکانیش هاندەربوون بۆ نزیکبوونەوەی خەڵکی لە کڵێســـەکانو لە جێ کۆبوونەوەی ئایینییەکانی تر. موسوڵمانەکان لە پاڵ ئەواندا پاڵنەر بوون بۆ هاوولاتییانی مەسیحی، کە زیاتر بەربەرەکانێی باوەڕی ئیسلام بکەن. هەروەها پاڵنەریـــش بوون بـــۆ هاوولاتییـــە عەلمانییەکان، کە هۆشـــیارتر بن لە ئاســـتی دیاردەکانی ئایینە میللیەکانـــی ســـەردەمەکەیان. هاندەری ســـێیەم بۆ گـــۆڕان لە هۆشـــیاریدا لە نێـــو هاوولاتییانی ئەوروپادا ئەو کرێکارە میـــوانو پەنابەرانە بوون، کە کولتووری کۆمەڵگاکانی ولاتەکانی خۆیانیان لەگـــەڵ خۆیانـــدا هێنایە ئەوروپـــاوە. هەڵبەت لە ســـەدەی شـــانزەهەم بە دواوە، ئەوروپا دەبووایە بکەوێتە بەر کاریگەریی دابەشبوونی تایەفەگەری لـــە کولتـــووری کۆمەڵگاکەیـــدا. دوا بە دوای دیاردەی کـــۆچو پانەبەریی لەم سەردەمەشـــدا، دووبەرەکـــیو دژ بە یەکبوون لـــە نێو گروپو تایەفە ئایینییەکاندا روونتر دەرکەوت. ئەمەش بوو بە هۆی تێکدانی سیمای کولتووری هەمەڕەنگیی لە نێـــو کۆمەڵگای ئەوروپادا. لـــە کۆمەڵگاکانی هاوشـــێوەی کۆمەڵگای ئێمەدا، کە هێشـــتا هەر کەوتوونەتە بەر باری ناهەمواریی گۆڕانکارییەوە، کە لەگەڵ کـــۆچو پەنابەریی کۆمەڵگا پۆســـت کۆلۆنیالەکانەوە دروست بووە، بەڕاستی مەسەلەی گیان لێبوردەیی (تۆلیرانس)و پێکەوە ژیان لە نێوان کۆمەڵـــە ئایینییەکاندا چۆتـــە قۆناغێکی دژوارترو سەختترەوە، بە تایبەتی لە چۆنێتیی پێکەوە گونجانو تواندنەوەی کولتوورەکان لە نێو یەکتردا. هەڵبەت گۆنجاندنو تواندنـــەوەی، یان بەجیهانگیریکردنی ئابووری، یان هاوپێکەوە ژیانی کۆمەڵگا لە یەکتر نامـــۆکان، بە زۆرو زۆرەملێـــش بێت، هەر دەبێ ســـەرکەوتن بەدی بێنێـــت، ئەگەرچی لە بارێکی ناهەموارو نائاساییشدا بێت. بەڵام ئەمەش باسێکی ترە. من، لەبەر ئەوە، تا ئەم ساتە، وەك چاودێرێکی کۆمەلایەتی هەڵوێســـتم نواندووە لە هەوڵدان بۆ وەلامدانەوەی ئەو پرسیارەی، کە بۆچی دەتوانین ئەو کۆمەڵگایانـــەی، کە بوون بە عەلمانی، ناویان لێ بنێین کۆمەڵـــگای دوای عەلمانییەت. چونکە لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا ئایین کاریگەریی گرنگی

لەسەریان هەیە، بەڵام بەعەلمانییەتکردن بێگومان لە تێکڕای جیهاندا لە نێو ڕێچکەی تازەگەریدا گوم دەبێ‌و زەمینەی نامێنێت. ئیتر لەوە بە دواوە، ئەگەر بێـــتو پابەند بین بە ڕوانگەی پێکەوە ژیان، بەهەر حاڵ، دەبێ ڕووبەڕووی پرسیارێکی تەواو پێوانەیی ببینەوە، کە ئەویش ئەوەیە: چۆن دەتوانین خۆمان وەکو ئەندامی کۆمەڵگایەکـــی دوای عەلمانییەت ببینین‌و دەتوانین چاوەڕێـــی چی بکەین لە یەکتر لـــە مامەڵەکـــردن‌و پێکەوە ژیان لـــە پێناو ئەوەی بتوانیـــن دەوڵەتێکی نەتەوەیی پتـــەو دابمەزرێنین، یان بتوانین پەیوەندییەکـــی کۆمەڵایەتیی وەها لە نێوانماندا دروســـت بکەین، کە شارستانییانە بێت، ئەگەرچی هەمە کولتـــوورو هەمە ڕای جیاوازمان لەگـــەڵ یەکتردا هەبێت لـــە ڕووی باوەڕی دنیای ئایینییـــەوە؟ هەڵبـــەت هـــەر هەمـــوو کۆمەڵگا ئەورووپاییەکان لە ئیمـــڕۆدا چاوەڕێی وەڵامی ئەو پرســـیارەن. ئەو کاتەی خەریکی ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە بووم، لە شوباتی/ فبرایەری ڕابردوودا، پشـــوویەکی کۆتایی هەفتە کاتی بۆ ڕەخساندم بۆ خوێندنەوەی ســـێ بابەتە هەواڵی جیاواز لە یەکتر. لە یەکەمیاندا دەڵێ سەرۆك سارکۆزی چوار هەزار پۆلیســـی تری ناردووە بۆ پاریســـی پایتەخت، کە بە شـــێوەیەکی توندو دڵڕەقانە ڕووبەڕووی گەنجە مەغربییەکان ببنەوە؛ سەرۆکی قەشەکانی کڵێسەی کانتربری پێشـــنیاری کردووە یاسای بریتانی کار بە بەشـــێك لە شـــەریعەتی ئیســـلامیش بکات بۆ موســـوڵمانەکانی وڵاتەکەی؛ هەروەها لە شـــاری لۆدویگ شافن ئاگرێك لە باڵەخانەیەك کەوتۆتەوە بە هۆیـــەوە نۆ کەس لـــە تورك ســـووتاون، کە چواریان منداڵن. هـــەر هەموویان مردوون. ئەگەر چی هیچ بەڵگەیەك بە دەســـتەوە نییە، کە ئاگریان تـــێ بەردرابێت، بەڵام گومانـــی قووڵ هەیە، وەك لە ڕاگەیاندنـــە تورکییەکانەوە بڵاوکراوەتەوە، کە دەستێك لە پشتی ئەم کارە ترسناکەوە بووبێت. لە ئەنجامی ئەوەدا سەرۆك وەزیرانی تورکیا سەردانی ئەڵمانیای کردووەو لە شـــاری کوێلن هێرشـــێکی دووڕوویانـــەی کردۆتە ســـەر حکومەتی ئەڵمانیا. ئەمەش کاردانەوەی بەرچـــاوی لێکەوتۆتەوە، کە ڕاگەیەنراوەکانی ئەڵمانیـــا بڵاویان کردۆتەوە. ئەم کێشـــانە لەگەڵ پەلاماردانەکەی یانزەی سێپتەمبەر بـــە دواوە توندتر بوونەتەوە. بۆ نموونە: لە هۆڵەندا تیرۆرکردنی تیۆ ڤان کـــوخ (**Theo van Gogh**) ئاگرێکی تری نایەوە لە دڵی ئەورووپیەکاندا. دوا بە دوای ئەوە، مەسەلەی وێنە کارکاتێرییەکان لەسەر پێغەمبەری ئیســـلام لە ڕۆژنامەیەکـــی دانیمارکیدا ئاگرەکەی زیاتر خۆشکرد.

ئەم کێشانە ڕەنگدانەوەی تایبەتی خۆیان بوو (٢١) شـــەپۆلی ناڕەزایی سنووری ئەو وڵاتانەی تێپەڕاند. تاکو هەموو وڵاتانی تری ئەورووپای گرتەوە.(٣١) ئەوەی زیاتر سەرنجی منی ڕاکێشا، ئەو ناڕەزاییانە، هەمووی بەســـەر موســـوڵمانەکانی دانیشـــتوانی ئەورووپادا شکایەوە. بەڵام، بەرلەوەی بچمە کرۆکی فەلسەفیی ئەو ناڕەزاییانەو ئەو تاوانانەی بەرامبەر بە موسوڵمانانی ئەورووپا کران، دەمەوێ هەردوو خاڵی دەســـپێکی هەردوو لایەنە دژ بـــە یەکەکە ڕوون بکەمەوە. لێکدانەوەیەکی ڕاســـت بکەم سەبارەت بەوەی ناوی لێ دەنرێت (جیاکردنەوەی کڵێسە لە دەوڵەت).

لە پێکـــەوە ژیانی ناجێگیرەوە بەرەو هاوســـەنگی لـــە نێـــوان هاووڵاتیبوونی هاوبەشـــی‌و جیاوازیی

کولتووری

بە عەلمانییەتکردنـــی دەوڵەت کاردانەوەیەکی گونجاوو بەجێی ئەو جەنگە ئایینیە تایەفەگەرییانە بووە، کە لە سەرەتای سەردەمی تازەگەریدا بەرپا بوون. بنەمای جیاکردنەوەی کڵێســـە لە دەوڵەتیش تاقـــە ڕێگایەك بووە بۆ بەرە بـــەرە کەمکردنەوەی ئـــەو قەیرانانە، کە بووە هۆی ئەوەی شـــێوازێکی نوێو جیاواز لەوەی پێشوو لە یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت بێتە کایـــەوە. تەنانـــەت بەڕادەیەك، کە حکومەت هەوڵی داوە سیمایەکی عەلمانیی لەخۆ بگرێ؛ هەنگاو بە هەنگاویش کەمینە ئایینییەکانیش بە ڕێگەی پیادەکردنی سیاســـەتی گیان لێبوردەیی (tolerance) مافـــی زیاتریـــان پێ ببەخشـــرێت. بـــۆ نموونە: مافی ئازادیی پراکتیزەکردنی کەشـــە ئایینیەکانیـــان لەماڵەکانی خۆیاندا. پاشـــان مافی ڕادەربڕینی ئایینیو مافی پەیڕەوکردنی هەرکەشێکی ئایینی بە ئاشکراو یەکســـانی. بە ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی سەبارەت بەم هەنگاوە سەختو دژوارانە، ساڵانی سەدەی بیست پێمان دەڵێ، کە ئەنجامێکی گرنگی لێ هاتـــە بەرهەم، کـــە ئەویش ئازادیی ئایینییە، کە بە یەکسانیو بێ جیاوازی بێت بۆ هەر هەموو هاووڵاتیان. لە پاش چاکســـازی، دەوڵەت لە ســـەرەتادا ڕووبـــەڕووی ئەرکێکـــی بنەڕەتی بووەوە سەبارەت بە پێویســـتی بۆ هێورکردنەوەی کۆمەڵگایەك، کە تووشی دووبەرەکییەکی تایەفەیی ئایینیی گەورە بوو بـــوو. بە واتایەکی تر، لە پێناو بەرقەرارکردنی ئاشتیو ئاسایش. لە دووتوێی ئەم مەسەیەدا، نووسەری هۆڵەندی (ماغرێت دی موور) بیـــری هاووڵاتیانی خۆی دەخاتـــەوە بەوەی، کە: ”زۆر جار گیانـــی لێبوردەیی (Tolerance) وەکو ڕێزلێگرتن تەماشـــای کراوە. بەڵام، ئێمە دەزانین، کە گیانی لێبوردەیی ڕەگ‌و ڕیشـــەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی شانزەهەمو حەڤدەهەم، نەك بۆ واتای ڕێزلێگرتن. واتە (تۆڵێرانس) لەو سەردەمانەدا واتای ڕێزلێگرتنـــی نەگەیاندووە. بەڵکـــو بە پێچەوانەوە، چ کاتۆلیکـــەکانو چ کالڤنیێـــکان، تەنانەت یەك تۆزقاڵ ڕێزیان لە ئایینەکانی بەرامبەریان نەگرتووە. تەنانەت هەشتا ســـاڵی جەنگی یاخیبوونی ئێمە لە ئیســـپانیا، خەباتێکی (جیهادێکی) خوێناوی بووە لەلایـــەن کالڤنیـــە ئەرتۆدۆکســـەکانەوە لە دژی کاتۆلیکەکان.“(١٤)

بـــەڵام، خێرا، دوای ئەمە دەبینین، کە چ جۆرە ڕێزلێگرتنێکە، کە مارغرێت دی موور (Margriet de Moor) خستوویەتیە مێشکی خۆیەوە. سەبارەت بە ئاشـــتیو ئاســـاییش، حکومەتـــەکان دەبووایە هەڵوێســـتێکی بێ لایەنانەیان وەربگرتایە، تەنانەت ئەگەر خۆشیان بە ئایینی ئەو سەردەمەی خۆشیانەوە ببەستایەتەوە لە وڵاتەکەیاندا. لە نێو ئەو وڵاتانەشدا، کە قەیرانی تایەفەیی ئایینیشی تێدا هەبووە، دەوڵەت دەبووایە چەکـــی بەرە دژ بەیەکترەکان هەڵماڵێت. زەمینـــە خۆش بکات بۆ بەرقەرارکردنی ئاشـــتیو ئاساییش. بە جۆرێ، کە بەرەیەك دان بە مافەکانی بەرەکـــەی بەرامبەریدا بنێت. هەڵبـــەت لە کاتی قەیراندا، تەنانەت هاوپەیمانانیش دووبەرەکییان لێ دەکەویتەوە. بۆ نموونە: لـــە ئەڵمانیا، یان هۆڵەندا، کولتووره لاوەکییەکانیش کەوتبوونە دژایەتیکردنی یەکتری. هەر لایەنێکیان بۆسەو لانەیەکی بۆ خۆی ناوەتـــەوە لە دژی ئەوی تر. لـــە ئەنجامدا، لە نێو یەك کۆمەڵگادا، هەر یەکەیـــان بووە بە بێگانە لە ئاســـت ئەوی تر. بێ گومان، ئەم مۆدێلی قەیرانە،

لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمەوە جۆرە سیستمێکی سیاســی نوێی بــە دوای خۆیدا داهێنــا، کە بە تەواوی کاریگەریی لەســەر داهاتنی دەســەڵاتی دەوڵەتی عەلمانیدا هەبوو، چ لە رووی سیاســەتی حوکومڕانــیو چ لە رووی خواســتی خەڵکی بۆ دیموکراســی. ئەم دەوڵەتــە عەلمانییەش تەنها بە دەســتوور دەتوانێت ئازادیو یەکســانی لە ئایین بۆ هاووڵاتیانی دابین بــکات. بە مەرجی ئەوەش، کە هاووڵاتیان خۆیان لە نێــو کۆمەڵگای ئایینی، یان ئایینزایی تایبەت بــە خۆیاندا قەتیس نەکەنو مــۆری تایبەت لە خۆیان نەنێن، کــە ئایینی، یان ئایینزای ئەمان لە هینی خەڵکی تر باڵاترو گرنگتر بێــت. یان ئایینو ئایینزای ئەمان ســەرەکی بێتو هینی خەڵکی تر لاوەکی بێــت. چونکە تەنانەت کولتــوورە لاوەکییەکانیش، گەرچــی ئایینی بن، یاخود دنیایی، چاوەڕوانیان لێ دەکرێت تاکەکانی نێو کۆمەڵگاکانیان لــە بازنەی خۆیان ئازاد بکەن. کەواتە، هاووڵاتیــان دەتوانن لە چوارچێوەی یەك کۆمەڵــگادا یەکتر قبووڵ بکــەنو دان بە بوونی یەکتــردا بنێن، بەو پێیەی، کە هەموویان ئەندامانی یەك کۆمەڵگانو لە ژێر چەتری یەك دەستووردان. وەکو هاووڵاتیی دیمۆکراسی، خۆیان ئەو یاسایانە بە خۆیان دەبەخشــن، کە مافیان پێ دەبەخشێت. وەکو هاووڵاتیی ســادەو تاکیش، کەســایەتیی، یان ناســنامەی خۆیان دەپارێــزن لە چوارچێوەی کولتوورێکــی تایبەت بە خۆیــانو روانینیان بۆ ژیــان. هەڵبەت ئەم پەیوەندییە نوێیەی ژێر چەتری حکومەتــی دیموکراتیو کۆمەڵــگای مەدەنیو کولتووری لاوەکی، کۆدی تێگەیشتنی راستەقینەیە ســەبارەت بە دوو شێواز لە خەباتی ئیمڕۆی دژ بە یەکتر، ئەگەرچی ئامانجیشیان ئەوەیە تەواوکەری یەکتر بــن. هەر پرۆژەیەك لە جیهاندا، کە لە پێناو هۆشیاریی سیاسیدا بێت، بێگومان دژ بە بۆچوونی هەمە کولتوورە (**multiculturalism**). هەر جۆرە یاســاو حوکومڕانییەك، ئەگەر لەســەر بنەمایەکی لیبراڵــی دابمەزرێت، ئەوە بێگومــان گرەنتییە بۆ ئــەوەی ئازادیــی ئایینی هەبێت وەکــو مافێکی بنەڕەتــی. ئەمــە واتای ئەوەیە، کە چارەنووســی کەمایەتییــە ئایینییــەکان بەند نابێــت بە خێری (**benevolence**) گیانــی لێبوردەیی کەم تا زۆری دەســەڵاتی دەوڵەتەوە. ئەوجا، تەنها هەر دەوڵەتی دیموکراســییە، کە دادوەریی کۆمەڵایەتی بەپێی بنەمای ئازادیی ئایینی فەراهەم بکات.(١٥)

کۆمەڵگایەکــی تورکــی لە بەرلیــن، یان لە کوێڵــن، یان لە فرانکفــۆرت، کاتێك، کە هەوڵ ئــەدەن نوێژەکانیــان لە دەرگای حەوشــی ماڵ بەرنە دەرەوە بۆ ئەوەی مزگەوتێکیان بۆ دروســت بکرێت، کە لە دوورەوە دیار بێت، ئیتر مەسەلەکە لەوەدا نامێنێتەوە، کە هەر باوەڕ بێت، بەڵکو دەبێتە مەســەلەیەکی پەیڕەو. بە هەر حاڵ، پرنسیپی گیان لێبوردەیی (تۆلێرانس) لــە کۆمەڵگای رۆژئاواییدا تەنها بە چاکســازیی دیمۆکراســی نەهاتۆتە دی، بەڵکــو بەوە هاتۆتــە دی، کــە یەکەمجار ترس رەوێنراوەتــەوە لــە بێ متمانەیی لــە نێوان لایەنە ناکۆکو دژ بە یەکــەکان. ئەوجا هەنگاو نراوە بۆ رێککەوتن لە نێوان یەکتردا.(١٦)

گیــان لێبوردەیی (تۆلێرانــس)، بەهەر حاڵ، مەســەلەی دانانو جێبەجێکردنی یاسا نییە، بەڵکو مەسەلەی ژیانی رۆژانەی مرۆڤەکانی نێو کۆمەڵگایە. تۆلێرانس مانای ئەوەیە، ئەوانەی یەك بیرو باوەڕیان

هەیە، ئەوانەی بیرو بـــاوەڕی جیاجیایان هەیە، یان ئەوانەی بیـــرو باوەڕیان نییە، هـــەر هەموویان، بە حەزی خۆشـــیان نەبێت، دەبێت دان بەوەدا بنێن، کە بەرامبەرەکانیان ئازادن چ ڕێگایەك لە ژیاندا بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن.(١٧)

لەبەر ئەوە، بنەمـــای ئەو دانپیانانـــە، ڕێزلێنان نییە لەمو لـــەو، یان لەم لایەنەوە لەو لایەنە، بەڵكو هۆشیارییە بەوەی، کە بەرامبەرەکەش ئەندامێکی، یان لایەنێکی نێو کۆمەڵگایەو هەموو مافێکی وەك بەرامبەرەکەی هەیە لە یەکسانیو لە بەشداربوونی لە بڕیـــاری سیاســـیی وەك هاوولاتییـــەك کە لە ولاتەکەیدا دەژی.(١٨)

یەکســـانیی هاوولاتییانیـــش لـــە نێـــو هـــەر کۆمەڵگایەکـــدا، تەنها ئەوە نییە، کە کولتوورێکی سیاســـیی هەبێت لیبرال بێتو جیـــاوازی لە نێوان هاوولاتیاندا نەکات، بەڵکـــو دەبێت بە کۆمەڵێك مەرج بێت. لەوانە، بە جیاوازیی کولتووریشـــەوە، دەبێـــت تێکەڵاوی هەبێت لـــە دایانگاکانەوە تاکو خوێندنگاکانـــی ئامادەییو زانکـــۆکان. هەروەها دۆزینـــەوەی هەلی کار بە یەکســـانی. بۆ نموونە، لەبەرئەوەی بەشێکی زۆر لە هاوولاتییە ئەڵمانییەکان، کە بە ڕەگەز تورکنو موسڵمانن، زیاتر پەیوەندیی پتەویان بە ولاتی تورکیاوە هەیە وەك لە ئەڵمانیا. ئەم دەنگانە ســـوودی نابێت بۆ ژیانی سیاسیی ئەڵمانیا، بە تایبەتی لە سندوقەکانی دەنگداندا، کە پێویستن بۆ گەشـــەدان بە بەها سیاســـیو کولتوورییەکان. چونکـــە بە بێ بەشـــداریکردنی کەمایەتییەکان لە نێو کۆمەڵگای مەدەنیدا، هەردوو پڕۆســـە سیاسیو کولتوورییەکـــە ناتوانێت پەنجە نـــەرم بکات بۆ گەشـــەکردنو پێشکەوتن. بە تایبەتی لە کرانەوەی کۆمەڵگای سیاســـی بە ڕووی کەشێکدا، کە تیایدا باوەش بـــۆ مرۆڤە کەمایەتییە بێگانەکانیش بکاتەوە بۆ قبوڵکردنیان بە خۆیانو کلتوورەکەشـــیانەوە لە نێو کۆمەڵگایەکـــی ڕۆژئاواییدا. ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تـــرەوە، کرانەوەی کۆمەڵگای کولتووری ڕۆژئاوایـــی بە ڕووی کەشـــێکدا، کـــە کلتوورە بچووکەکانیشـــی جێ تیابێتـــەوە، بە جۆرێك، کە ببێتە هانـــدەر بۆ ئەوەی مرۆڤە خـــاوەن کلتوورە بچووکەکانیش لە نێو ژیانی سیاســـیدا بە گشـــتی بەشدار بن.

جەنگی ڕۆشـــنبیری لـــە نێـــوان کۆمەڵگای هەمەکلتووریو عەلمانییەتی توندڕەو لە ڕوانگەی فەلسەفییەوە

بۆ وەڵامدانەوەی پرســـیارێك، کـــە ئایا ئێمە چۆن لـــە خۆمان تێبگەیـــن، وەکـــو مرۆڤی نێو کۆمەڵگای پاش عەلمانییـــەت؟ دەتوانین لەم دوو خاڵەوە دەست پێبکەین: یەکەم ئەوەیە، کە دەبینین ئەو پارتە سیاســـییانەی هەڵگری ئایدیۆلۆجیانو بە دروشمی ساتەوەخت ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوەو ململانـــێ لەگەڵ یەکتردا دەکـــەن، زۆر بە کەمی بیر لـــەوە دەکەنەوە، کە چ خاڵـــی هاوبەش هەن لە نێوانیاندا. دووەم ئەوەیە، کە پارتە سیاسییەکانی هەڵگری باوەڕی هەمـــە کلتوورین، هەوڵ دەدەن پارێزگاری لە مافی هەموو مرۆڤە خاوەن کلتوورە جیاجیاکان بکەن. دژی ئەو پارتو گرووپانەشن، کە توندڕەویی دەنوێنن لـــە بیری ڕووناکگەرایی (**tnemnethgilnE**). بـــە تایبەتی ئەو عەلمانییانەی، کـــە بڕوایان بە هەمە کلتـــووری نییەو دژی کەمە نەتەوەییەکانـــن، کە لـــە چوارچێوەی سیاســـیدا بەشـــدارییان هەبێت. بە بیانووی ئەوەی، کە هەمە

کلتـــووری خیانەتکردنە لە بەها ســـەرەکییەکانی ڕووناکگەرایـــی، کە ئەوروپای ڕۆژئاوا هێناویەتییە بەرهـــەم. لە هەندێك لـــە وڵاتـــە ئەوروپییەکاندا، هەندێك پارتی سیاســـی هەن، کـــە ڕۆڵی گەورە دەبینن لە ئاگرنانەوەی ئەم جۆرە کێشانە. هەڵبەت، ئەو کەسانەی بڕوایان بە سیاسەتی هەمە کلتووری هەیە، خەبات لـــە پێناو دادپەروەریدا لە یاســـادا دەکـــەن، کە یەکســـانی لە نێـــوان مرۆڤە خاوەن کلتوورە جیاجیاکاندا هەبێت. هەڵبەت، ئەو کەسانە دژی سیاســـەتی بەزۆر کلتـــوور گۆڕینن. لەگەڵ ئـــەوەدا نین، کـــە دەوڵەتی عەلمانی بـــە بیانووی یەکسانیکردنی هاووڵاتیان، بە زۆر کەمایەتییەکان بتوێنێتـــەوە لـــە کۆمەڵگاکەیدا. بـــە جۆرێك، کە تاکـــەکان دابماڵێت لە ناســـنامەی کەســـایەتیی ڕەســـەنی خۆیان. لـــەم ڕوانگە بـــە کۆمەڵایەتی کردنە، سیاســـەتی پێکەوە هاوگونجاندن، بە زەبر، بـــە ملکەچکردنی کەمایەتییەکان بـــۆ وازهێنانیان لە کلتووری ڕەســـەنی باوباپیرانـــی خۆیان، جێی گومـــان دەبێت، کـــە دادپەروەریو یەکســـانیی ڕاســـتەقینەی تێدا بێـــت. بەڕاســـتی مرۆڤایەتییانە بێت. ئیمڕۆ، ســـەردەمی باهۆزێکە هەڵیکردووە بۆ ئایندەیەك، کـــە کۆمەڵگاکان بینە هەمە کلتووری. "نەك تەنها ئاکادیمییەکان، بەڵکو سیاسەتمەدارانو ڕۆژنامەنووسانیش بڕوایان وایە، کە ڕووناکگەریی دیوارو شـــوورەیەکە بۆ بەر هێرشـــی توندڕەویی ئیسلامی."(١٩)

ئـــەم کاردانەوەیە، خۆی لە خۆیـــدا، ڕەخنە گرتنە لە توندڕەویـــی ڕووناکگەرایی. بۆ نموونە، تیمۆتی گارتۆن ئـــاش (Timothy Garton Ash) لە گۆڤاری نیویۆرکی کتێب هەڵسەنگاندندا (New York Review of Books) (٥ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٦) دەڵێـــت: "تەنانەت ژنانی موســـوڵمانیش دژی ئەو بۆچوونەن، کە حیرسی عەلی (Hirsi Ali) دەربڕیوە سەبارەت بەوەی، کە ئیسلام دەیانچەوسێنێتەوە، نەك کلتووری نەتەوەییو خێڵەکی.(٢٠)

بـــەڵام، لە ڕاســـتیدا، پەنابەرە موســـڵمانەکان بە ئاســـانی ناتوانن لە نێو کۆمەڵـــگای ڕۆژئاواییدا بتوێنەوەو لە ئایینەکەی خۆیـــان یاخی ببن. جگە لەوە، عەلمانیەکان وەك ئەوەی، هەوڵ بدەن هەموو هاووڵاتیان تووشـــی ڕەنگێ کوێری ببن، بیر لەوە ناکەنـــەوە، کە هەر بەشـــێکیان گـــرێ دراون بە کلتووری ڕەسەنو ئایینی خۆیانەوە. ئەم لایەنە دژە بە دەرەنجامەکانی سیاســـەتی ناسنامە، کە بە زۆر یاسا دەسەپێنێ. لەبەر ئەوە دژە بۆ ئەوەی داکۆکیو پارێزگاری لە بنەماکانی کلتووری کەمایەتییەکان بکات. لەم چوارچێوەیەدا، ئایین دەبێت جیاکرێتەوە لە سیاســـەتی ناسنامە. پاســـکال برکنەر (Pascal Bruckner) لەگەڵ ئەوەدا نییـــە، کە پارێزگاری لە مافی کلتوور بکرێـــت، لەبەر ئەوەی ئەگەر وا بکرێت، ئەو کاتە کۆمەڵگا کلتوورییە بچووکەکان هاوتەریب نابـــن لەگەڵ کۆمەڵـــگا گەورەکاندا، بەڵکو پەراوێز دەخرێن، هەریەکەیان شـــێوازێکی جیاو سەربەخۆ وەردەگرێت.(٢١)

لەبەر ئـــەوە، بروکنەر بە تونـــدی دژی هەمە کلتوورگەراییە، لەبەر ئەوەی بە نەژادپەرستییەکی دژ بە نەژادپەرستییە. لەبەر ئەوە، بناغەی دژبوونیەکەی بروکنەر بە هەموو جۆرێك بەرامبەر بەو بیرکردنەوە هەمـــە کلتوورگەراییەیە، کە بەرگـــری لە مافی هاتنەناوەوەی هەموو کلتوورە گشتییەکان ئەکات. ئەم بەرگریکردنەش، لە هاتنەنـــاوەوەی کۆمەڵگا

کلتوورییەکانی تــر، لە راســتیدا مافی تاکەکان بەرتەسکتر دەکاتەوە لەوەی، کە بتوانن و بیانەوێت رێبازی ژیانی تاکەکەســیو تایبــەت بە خۆیان هەڵبژێرن. ئەوجا، لایەنــە دژ بە یەکترەکان هەوڵ دەدەن شەڕ بۆ هەمان مەبەست بکەن، کە هێنانەدی کۆمەڵگایەکی لیبراڵە، کە تیایدا هاووڵاتییان بتوانن سەربەستانە بە شێوەیەکی شارستانییانە مامەڵە لەگەڵ یەکتردا بکەن. بەڵام هێشتا هەر دەبن بە بەشێك لەو شــەڕە کلتوورییەی، کە لە هەر بۆنەیەکی سیاسیی نوێدا ســەرهەڵدەدات. لەگەڵ ئەوەشدا، ئاشکرایە، کە هــەردوو لایەنەکــە پێکەوە گــرێ دراون. تاڵییەکە لەوەدایە، کە هــەردوو لایەنەکە بڕوایان بــەوە هەیە، کــە دەبێ پارێزگاری لە ناســنامەی کلتــووری بکرێت، چونکە لە ســەرووی هەموو شتێکەوەیە بۆ پاێزگاریکردن لە هاووڵاتیبوون، یان هاووڵاتینەبوون.(٢٢)

گفتوگۆکردن بە گەرمی لەسەر ئەم مەسەلەیە دەبێت لەســەر بنەمایەکی فەلســەفی بێت، کە بە هۆیــەوە بتوانرێت بەرپەرچــی رای بەرامبەرەکە بدرێتەوە، کە هەڵە بن، یان راست بن. ئیان بوروما (**Ian Buruma**) تێبینییەکی سەرنجڕاکێشی کردووە، کە لــە پاش یانــزەی ســێپتەمبەرەوە گفتوگۆی ئاکادیمییانە دەربارەی رووناکگەرایی، مۆدێرنیتی، هەروەها پۆست مۆدێرنیتی، لە زانکۆکانەوە دەستی پێکردووەو لەوێوە چۆتە بازاڕەوە.(٢٣)

ئــەو گفتوگــۆ ئاگرینانە بە هــۆی بیروڕای جیاوازەوە هەڵگیرســاون، بە تایبەتی ســەبارەت بە ئاســتی رێژەیی لە کلتووردا، شــان بە شــانی رەخنەی ئاوەزگەرایی لــە لایەکەوەو عەلمانییەتی توندڕەوانە لە لایەکی تــرەوە، کە پاڵنەر بوون بۆ رەخنەی ئایینگەرایی. هەڵبەت، خوێندنەوەی هەمە کلتوورگەرایی، زۆر جار پەیوەستە بە خوێندنەوەی بــاری ناجێگیریو ناســەقامگیری لــە جیهاندا. هەروەها پەیوەســتە بە بیروبۆچوونــی جیاجیاوە. لەم روانگەیــەوە، شــێوازەکانی ژیانی کلتووری وەکو کۆمەڵێك جیهانی پڕ لــە واتا دەردەکەون، کــە هەریەکەیان پێــوەری تایبەتی خۆی هەیە بۆ عەقڵو بۆ راستییەکان. لەبەر ئەوە، هەر کلتوورێك، دەبێــت تایبەتمەندیــی خۆی هەبێــت، لە رووی واتاییەوە. جیاوازیی هەبێت لەگەڵ کلتووری تردا. بــەڵام لە هەمان کاتدا ئــەم جیاوازییە، نابێت ببێتە هــۆی ململانێ لەگەڵ کلتوورە جیاوازەکانی تردا. بە گوێرەی ئەم بۆچوونــە، هەموو کلتوورگەراییە رادیکاڵەکان ئەوان نین، کە بانگەشــە بۆ سیستمی دیموکراسیو مافی مرۆڤ دەکەن، بەڵکو ئەوانەن، کە بانگەشــە بۆ هێزو دەسەڵاتی ئیمپریالیزمیو بۆ لەناوبردنی کلتــووری کەمایەتییەکان دەکەن. ئەم خوێندنەوەیــە، بێ گومان، رەخنەیە لە شــێوازی مامەڵەکردن بەرامبەر بە کلتووری کەمە نەتەوەکان. لە کۆمەڵگای پەنابەری پاش کۆلۆنیالیزم، سیاسەتی جیاوازی کــردن لە نێوان کلتووری فرەنەتەوەییو کەمە نەتەوەییدا پەرەی سەندو رەگی داکوتا. ئەم جیاوازیکردنە تەنانەت خرایە دەستوورەکانیشەوەو کاریان پێ کرا. من لێرەدا پێویســتم بەوەیە بچمە قووڵایی باسێکی فەلسەفییەوە سەبارەت بەوەی، کە رێژەیی کلتووری، کە لە رەخنەی عەقڵیی پۆست مۆدێرنەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆچی هەڵوێستێك نییە شایانی ئەوە بێت بەرگریی لێ بکرێت.(٢٤)

بــەڵام، بە هەرحــاڵ، هەڵوێســتەکە خۆی لە خۆیدا لەبــەر هۆیەکی تر شــایانی بایەخ پێدانە.

ئەویــش لەبەر ئەوەیە، کە خۆی لــە خۆیدا بوار دەرەخســێنێت بۆ دەرەنجامی هەڵوێستی سیاسیو ئــەوە روون دەکاتەوە، کە بۆچی گۆڕانی ســەیر لە سیاســەتدا لە هەردوو لایەنــەوە روو دەدات. ســەیر لەوەدایە، کە ئەم ڕێژەیــی کلتوورییە لای ئەو مەســیحییە توندڕەوانەش هەیــە، کە جەنگ لەگەڵ ئیسلامییە توندڕەوەکاندا دەکەن، ئەگەرچی بە شانازیشــەوە باس لەوەش دەکەن، کە هەڵگری دروشــمی ڕووناکگەرایین. باس لــەوە دەکەن، کە ڕووناکگەری بەشــێکی دانەبــڕاوە لە نەریتی کاتۆلیکــی ڕۆمانییان، یان لقێکــی دیاریکراوە لە پرۆتســتانتیزم. لە ڕوویەکی ترەوە، ئەم ڕاستڕەوانە، سەیر لەوەدایە، لایەنگرانی سەیریان هەیە، ئەوانەن، کە لە چەپڕەوییەوە بوون بە ڕاستڕەو، ئەوانە بوون، کــە تینووی ئەوە بــوون جەنگــی ئازادیخوازی بەرپــا بکەن. ئەم بادەرەوانە، تەنانەت چوونە ریزی ڕووناکگەرە توندڕەوە نوێیەکانیشەوە.(٢٥)

لە جەنگێکیاندا دژی ئیسلامییە توندڕەوەکان، بــە ڕوونی توانییان لە شــەوو ڕۆژێکدا کلتووری ڕووناکگەرایی پەیڕەو بکەن. کەچی هەر خۆشیان دژی کلتووری ڕۆژئاوایی دەوەســتانەوە، چونکە هەمیشــە دژی جیهانگیری بوون. ڕووناکگەرایی بــوو بە باو، یان مۆدێل. بــە تایبەتی لەبەر ئەوەی بەهاکانی بە تەنها جیهانگیری نەبوون، بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆمــان بوون، ئێمــەی ئەوروپایی بوون، ڕۆژئاوایی بوون.(٢٦)

بە هەر حاڵ، ئەمە تەنها ڕەخنە نییە لەو ڕۆشنبیرە چەپڕەوە فەرەنســییانە، کە رقو کینەیان بەرامبەر بــە ڕووناکگەراییــە تونــدڕەوەکان دەردەبڕی، بەڵکــو بیــرو بۆچوونێکی فەلســەفییە، کە بۆمان روون دەکاتــەوە بۆچی لە بەشــێك لە کلتووری ڕووناکگەراییــدا توندڕەویــش هەیە. هەڵبەت لە بیرو بۆچوونی ئەو ڕۆشــنبیرە فەرەنسییانەوە، ئایین، لەبەر ئەوەی پەیوەســتە بە مێشکی تاکەوە، دەبێ دوور بخرێتــەوە لە بواری ژیانی سیاســیو تەنها عیبــادەت بێت و هیچی تر. بەڵام ئەمە لە مێژوودا بە جۆرێکی تر بەدی کراوە، بەڵکو، وەکو گشتاڵت (**Gestalt**)، یان وەکو هیگڵ (**Hegel**) دەڵێ: بۆتە بەشــێك لە پێکهاتەی بیری کۆمەڵگای مرۆڤ. لە ڕوانگەی دەستووری لیبرالانەوە، ئایین دەبێت گیان لێبووردەیی (تۆلێرانســی) تێدا بەدی بکرێت. ئایین تاکەکان بە مێشــك پۆلێن ناکاتو تاك بە تاك لە یەکتریان جیا ناکاتەوە.

پرۆســەی فێربوونی یەکتر تەواوکردن: عەقڵی ئایینیو عەلمانی

ئەم هەڵوێستە عەلمانییە پەیوەست نییە بەوەی، کە چۆن کەســێك ئەزموونی ئەوە لێك دەداتەوە، کە چــۆن مرۆڤــە ئایینپــەروەرەکانو کۆمەڵگا ئایینپەروەرەکان هێشتا خولیای سیاسەتنو ئەوەی لە کۆمەڵگای عەلمانیدا بەدی دەکرێت، لای ئەمانیش هەیە. ئێمــە بمانــەوێو نەمانــەوێ، کۆمەڵگای ئەوروپــای ڕۆژئاوایی هەر دەبێت پــێ بنێتە نێو قۆناغــی پــاش عەلمانییەتەوە. بەهــۆی قەناعەتی فەلســەفیو ئایینگەراییەوە، کۆمەڵــگا ئایینییەکان هەرگیز بە ئاسانی واز لە بیروباوەڕی ئایینی خۆیان ناهێنن، کە لە ســەردەمی بەر لە تازەگەرییەوە ئەو شێوازە بیرکردنەوەیەیان بە میراتی بۆ ماوەتەوە. ئەمە ڕاســتییەکە، کە بە ئەزموون سەلمێنراوە. بێگومان لە ڕوانگەی عەلمانییەتەوە، بە زانستکردنی بنەمای بیروباوەڕی ئایینی باسێکی تری دەوێت. قسەکردن

لەسەر میراتیی، یان نەریتی ئایینی هێشتا مشتومڕی زۆری لەســـەرە. من لە رووی زاراوەوە، کەســـی عەلمانـــی (**secular**) لە عەلمانیگەر (**secularist**) جیا دەکەمەوە. بە پێچەوانەی کەســـێکی عەلمانی، کە بە واتای کەســـێکی باوەڕ نەکەر بە خوا، یان گومڕا دێ، کەســـێك، کە هیـــچ نەزانین لەبارەی خواوە دەبەســـتێت بە ئایینەوە، (عەلمانیگەرەکان) هـــەوڵ دەدەن لایەنگریی هەڵویســـتێك بکەن، کە بکەونە مشـــتومڕەوە لەگەڵ ئەو خاوەن بیروباوەڕە ئایینییانەوە، کە دەیانەوێـــت کاریگەرییان هەبێت لەســـەر خەڵکی، ئەگەرچی بیروباوەڕەکانیشـــیان بناغەیەکی زانســـتییان نەبێت. ئەمڕۆ، عەلمانییەت، زیاتر لەســـەر بناغـــەی سروشـــتگەراییەکی پتەو دامـــەزراوە. بۆ نموونە لەســـەر بناغـــەی تیۆری زانســـتی، یان زانســـتگەرایی دامـــەزراوە. واتە بە پێچەوانـــەی کلتووری ڕێژەییەوەیـــە. لەبەر ئەوە، من لێرەدا پێویســـتم بەوە نییە ئاماژەی، یان باس لە زەمینە فەلسەفییەکە بکەم.(٢٧)

ئەوەی لێـــرەدا بـــەلای منەوە گرنگـــە، ئەو مەســـەلەیەیە، کە ئایـــا هێنانە خـــوارەوەی نرخی ئایین لـــە لایـــەن (عەلمانیســـت)ەوە رۆژێك لە رۆژان لـــە لایەن هەمـــوو (عەلمانییەکان)یشـــەوە دەبێت؟ یان عەقلییەتی عەلمانیســـتی دەبێتە بەشێك لە عەقلیەتی هاووڵاتییـــوون، بە جۆرێك، کە ئیتر بوار نەمێنێت بۆ تێگەیشـــتن لە قۆناغی کۆمەڵگای پۆست عەلمانییەت؟ واتە ئەو عەقلیەتە عەلمانیستییە لە بازنـــەی دەمارگیریدا چەق ببەســـتێ‌و ئاوڕ لە بیروباوەڕی ئایینیی خەڵکی نەداتەوە؟ ئەم مەسەلەیە شۆڕمان دەکاتەوە بۆ نێو لایەنی قووڵتر، کە هێندە لەبەر دیدمان تاریك بێت، نەزانین رووبەڕووی چ کێشـــەیەك دەبینەوە. بەڵام، دەبـــێ بیرمان نەچێت، کەوا تەنانەت عەلمانیستەکانیش نکوڵی لەوە ناکەن، کە هەمـــوو هاووڵاتیان دەبێ لە نێـــو کۆمەڵگای مەدەنیدا یەکســـانیان هەبێت. چونکە حوکومڕانیی دیموکراسی بە زۆری زۆرداری ناسەپێنرێت. چونکە دەوڵەتی دەستووری دەبێت بە ئەتیك مامەڵە لەگەڵ هاونیشتمانیاندا بکات. واتە نابێت تەنها لە سنووری یاساکاندا مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتیاندا بکات. ئەگینا ئەوسا مامەڵەکردنەکە تەنها دەبێتە سەپاندنی یاسای بە زۆرە ملێ‌و سیستمی شوانو مەڕی. بە واتایەکی تر، هەر هاووڵاتییەکی ئایینپەروەرو کۆمەڵگایەکی ئایینی نابێت بە پێوەرێکی سیســـتمی دەستووریی رووت حوکمـــڕان بکرێـــت بەڵکـــو هاووڵاتیی ئایینپەروەرو کۆمەڵگای ئایینی پێویستە شەرعیەتی دەســـتووریی ئەوەی هەبێت، کە مافی بیروباوەڕی بپارێزرێت.(٢٨)

هەڵبەت ئاشـــکرایە، کە یەکەمجار کنیســـەی کاتۆلیکی بوو، کـــە لە ڤاتیکانومی (**Vaticanum**) دووەمدا لـــە ســـاڵی ١٩٦٥ دروشـــمی لیبرالیزم‌و دیموکراسیی بەرزکردەوە. هەروەها لە ئەڵمانیاش، برۆتستانتەکان هەر هەمان دروشمیان بەرز کردەوە. بـــەڵام، ئەوەی جێی داخە، کـــە زۆر لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکان هێشتا تازە بە تازە لە پرۆسەی چوونە نێو کەشـــی لیبرالیزم‌و دیموکراســـیدان. بێگومان، لـــە جیهانی ئیســـلامیدا گەشـــەکردنێك هەیە لە لێکدانەوەی، یان خوێندنەوەی مێژووی ئیســـلام، کە لە مێژە ئیســـلام لە روانگەی قورئانەوە بڕوای بە لیبرالیزم‌و دیموکراسی هەبووە. بەڵام، قسەکردن لەسەر هەوڵدان بۆ بەئیسلامکردنی ئەوروپا دووبارە دەمانخاتەوە مەترســـییەك‌و بیرکردنەوە لەوەی، کە

ئایا تاکو چ ئاستو رادەیەك کەمایەتییە ئایینییەکان مافی ئەوەیان هەیـــە بیروباوەڕی ئایینیی خۆیان لە نێو کۆمەڵگای رۆژئاواییدا بڵاو بکەنەوە. ئایا ئەمە پرسیارمان لە لا دروست ناکات، کە بزانین باوەڕی ئایینیی راستەقینە چییەو باوەڕی ئایینیی ناڕاستەقینە چییە؟(٢٩)

ئێمە، کە بیـــر لەم گۆڕانکارییـــە دەکەینەوە، لە شـــێوازی نەریتیی چەق بەستووەوە بۆ شێوازی کرانـــەوەی هۆشـــیاریی ئایینی، هەڵبـــەت بیرمان بۆ مۆدێلـــی گۆڕانێك دەچێت، لـــە قۆناغی پاش چاکسازییەوە بگۆڕێت بۆ بارودۆخێکی مەعریفیی وەها، کە لە کۆمەڵگا مەســـیحییە رۆژئاواییەکاندا بەدیـــی دەکەین. بـــەڵام، گۆڕان لـــە عەقلییەتدا دەرناکەوێت، یان بە دیوێکی سیاسیی دیاریکراودا ئاڕاســـتە ناکرێت، یان بە یاســـا نایەتە دی، بەڵکو گـــۆڕان لە عەقلییەتدا لە پرۆســـەی پـــەروەردەو فێربوونـــەوە دێتە بەرهەم. واتـــە تەنها بەو رێگەو پرۆســـەی فێربوونەی، کە تازەگەرایی عەلمانییەتی پێ هێنایە بەرهـــەم. کەواتە، ئێمە تەنها بەو ئێتیکی دیموکراســـییەی، کە لای هاوولاتی دەبێ هەبێت، ئێمـــە دەتوانین، گرەنتی ئـــەوە بدەین، کە بتوانین سنوورەکانی مافو ئەرکی هاوولاتییان بە پێوەری راســـت دیاری بکەین. دەکـــرێ هاوولاتییان بە زۆرەملـــێ هان بدرێن بـــۆ فێربوونـــی لیبرالیزمو دیموکراســـی، بەڵام ناکرێت بـــە زەبرو زۆرەملێ هاوولاتییان ئاڕاســـتە بکرێن، کە ئێتیکیان هەبێت، یان پەیڕەوی یاسا بکەن.(٣٠)

بەڵام ئایا ناتوانین پرســـیارەکە بە جۆرێکی تر بکەین؟ ئایا پرۆسەی پەروەردەو فێربوون لە رووی ئایینیی نەریتییەوە بۆ کۆمەڵگا پێویســـتە، یاخود لە رووی عەلمانییەتەوە؟ بۆ نموونە ئێمە دەبێت لە رووی بەهای ئایینییەوە فێری ئەوە بین، کە یەکسانی ماف لـــە نێوان ژنو پیاودا بکرێت، یان لە رووی بەهای عەلمانییەتەوە؟ بێگومان پرۆسەی یەکترتەواوکردن پێویســـت دەکات. لە هـــەردوو لایەنەکەوە، واتە لـــە لایەنی ئایینـــیو لە لایەنـــی عەلمانییەتەوە. بە جۆرێك، بوار نەدرێت، هیـــچ لایەکیان زاڵ بێت بەسەر لایەکەی تردا. بێگومان دەوڵەت نابێت بوار بەوە بدات بە زۆرەملێ عەلمانییەت بسەپێنرێت، یان بـــە دیوێکی تریش، ئایین زاڵ بێـــت. ئەگینا بەمە دەرگای ململانێو پێکدادان لە نێوان گروپو تایەفە ئایینییەکان خۆیانداو یان لەگەڵ عەلمانییەکاندا روو دەدات. ئەگینا ئەو کاتە دەوڵەت دەبێتە بەشـــێکی خولقێنەر لە ململانێو پێکدادانی لەو جۆرە. ئەوجا دەبێت بە هێزی ســـەرکوتکەری ئۆپۆزیسیۆنەکان. لە دەوڵەتی دەســـتووریدا، دەبێ هەموو پێوەرەکان بە شێوەیەکی یاســـاییو بە ئاشکراو بە شەفافیەت بۆ هەموو هاوولاتیـــان دابڕێژرێت. ئەوجا دەوڵەت دەبێت هەڵوێستی تەواو بێ لایەنی هەبێت لە ژیانی سیاسیی گشـــتیدا. دەبێت خاوەنی بڕیار بێتو ئەو بڕیارانـــەش بە دامودەزگای شـــەرعیو بێ لایەن جێبەجێ بکات، لەسەر ئاستی پەرلەمانیو دادگاییو ئیدارەیـــیو فەرمـــیو هەموو ئەمانـــەش دەبێت ســـەرچاوەکانی راو بۆچوونی هاوولاتییان خۆیان بن. مەبەستیش لە جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت، ئەوەیـــە، کە هەردوو فلتەری یەکتر بن. واتە ئایین لە بواری گشـــتیو فەرمیدا ببێتە فلتەر بۆ دەوڵەت، دەوڵەتیـــش ببێتە فلتەر بۆ ئایین. لێرەدا دوو هۆکار هەیە بۆ ئەوەی ئازادی پراکتیزە بکرێت. هۆکاری یەکەمیان ئەوەیە، کە ئەو کەسانەی نە ئارەزوویان

لێیەو نە دەتوانن مۆراڵو بیرباوەڕی خۆیان دابەش بکەن بۆ دوو ئاڕاستەی عەلمانیو ئایینی، دەبێت ڕێگەیان پێ بدێت بەشدار بن لە ئیرادەی سیاسی وڵاتەکەیان، ئەگەرچی زمانی ئایینیش بەکار بهێنن. هۆکاری دووەم ئەوەیە، کە دەوڵەتی دیموکراتی نابێت سنوور لەبەردەم دەنگەکانی خەڵکیدا دابنێت، چونکە نازانرێت ئەو دەنگانە لە چ ساتێکدا دەچنە ئەم لایەنەوە، یان ئەو لایەنەی ترەوە. بە تایبەتی لە نێو ئەو گۆمەڵگایانەدا، کە پەیوەندیی تیادا لاوازە، یان نەریتی ئایینی تیادا باڵادەستە. ئەو هۆکارەی دەبێتە ڕێگر لەبەردەم عەلمانییەتدا، ئەوەیە، کە عەلمانییەکان لە نێو کۆمەڵگای مەدەنیو لە بواری گشتیی سیاسیدا کەمتر لە هاووڵاتییە ئایینییەکان هاوشان دەکرێن. هەڵبەت هاووڵاتییە عەلمانییەکان زۆر بە ترسەوە مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییە ئایینییەکاندا دەکەن، لە ترسی ئەوەی بە ئاسانی نەچنە ژێر کاریگەریی ژیانی مۆدێرنەوە. ڕەنگە لەبەر ئەوەش بێت، کە هاووڵاتییە ئایینییەکان زمانە ئایینییەکەیان لەگەڵ زمانی دنیاییدا نەگونجێت. بەڵام، ئەگەر قبوڵکردنی یەکتری هەبێت، ئەو کاتە زمانی هاوبەش لە نێوان هەردوو لادا بەبێ ترسو سڵەمینەوە دروست دەبێت. ئیتر ئەو کاتە زمانی ئیمانو زمانی عەلمانییەت بەرامبەر بە یەکتر دژوارو مەترسیدار نابێت.

**پەراوێزەکان**

(1) D. Pollack, Säkularisierung – ein moderner Mythos? (Tübingen: Mohr Siebeck, 2003)

(2) H. Joas, “Gesellschaft, Staat und Religion,” in: H. Joas (ed.), Säkularisierung und die Weltreligionen, (Frankfurt/M.: Fischer, 2007), pp. 9-43

(3) J. Hadden, “Towards desacralizing secularization theory,” in: Social Force, vol. 65, 1987, pp. 587-611

(4) H. Joas, op. cit., pp. 9-43

(5) P.L. Berger, in: Berger (ed.), The Desecularization of the World: A Global Overview, (Grand Rapids, Michigan, 2005), pp. 1-18

(6) J. Gentz, “Die religiöse Lage in Ostasien,” in: Joas (2007), pp. 358-75

(7) cf. the essays by H.G. Kippenberg and H. v. Stietencron in Joas (2007), pp. 465-507 and pp. 194-223

(8) P. Norris & R. Ingelhart, Sacred and Secular. Religion and Politics Worldwide,(Cambridge: Cambridge University Press, 2004)

(9) J.Casanova, Public Religions in the Modern World, (Chicago, 1994)

(10) J. Habermas, Glauben und Wissen (Frankfurt: special edition of edition Suhrkamp, 2001), p. 13

(11) Francis Schüssler Fiorenza, The Church as a Community of Interpretation, in: D. Browning & F. Schüssler Fiorenza (eds.), Habermas, Modernity, and Public Theology, (New York: Crossroad, 1992), pp. 66-91

(12) G. Mak, Der Mord an Theo van Gogh. Geschichte einer moralischen Panik, (Frankfurt/Main: Suhrkamp, 2005)

(13) Th. Chervel & A. Seeliger (ed.), Islam in Europa, (Frankfurt/Main: Suhrkamp, 2007)

(14) M. de Moor, “Alarmglocken, die am Herzen hängen,” in: Chervel & Seeliger (2007), p. 211

(15) For the history and a systematic analysis see the comprehensive study by R. Forst, Toleranz im Konflikt, (Frankfurt/Main:

Suhrkamp, 2003)

(16) J. Habermas, “Religiöse Toleranz als Schrittmacher kultureller Rechte,” in: my Zwischen Naturalismus und Religion, (Frankfurt/Main: Suhrkamp, 2005), pp. 258-78

(17) See my debate with Ch. Taylor, Multikulturalismus und die Politik der Anerkennung, (Frankfurt/Main: Fischer, 1993), in: J. Habermas, “Kampf um Anerkennung im demokratischen Rechtsstaat,” in: my Die Einbeziehung des Anderen, (Frankfurt/Main: Suhrkamp, 1996), pp. 237-76

(18) On the public use of reason see J. Rawls, Politischer Liberalismus (Suhrkamp), Frankfurt/Main 1998, 312-366

(19) I. Buruma, Murder in Amsterdam: The Death of Theo Van Gogh and the Limits of Tolerance (New York: Atlantic Books, 2006) (Carl Hanser Verlag), München 2006, 34

(20) Timothy Garton Ash in: Chervel & Seeliger (2007), 45f.

(21) P. Bruckner in: Chervel,Seeliger (2007), 67

(22) P. Bruckner, op. cit., p.62: “Multiculturalism guarantees all communities the same treatment, but not the persons who go to make up the communities, because it denies them the freedom to abandon their own traditions.” See: B. Barry, Culture and Equality, (Cambridge UK: Polity, 2001); and J. Habermas, “Kulturelle Gleichbehandlung und die Grenzen des Postmodernen Liberalismus,” in my Zwischen Naturalismus und Religion, (Frankfurt/Main: Suhrkamp, 2005), pp. 279-323

(23) Buruma (2006), 34

(24) The decisive critique of the proposed incommensurability goes as far back as D. Davidsons famous Presidential Address of 1973 “On the very Idea of a Conceptual Scheme (deutsch: Was ist eigentlich ein Begriffsschema? in: D. Davidson & R. Rorty, Wozu Wahrheit?, (Frankfurt/Main: Suhrkamp, 2005, pp. 7-26)

(25) Maybe the new London based Magazine “Standpoint” will become a collecting tank for this heterogenous group of intellectuals

(26) Buruma (2006), p. 34. Buruma describes the motivation of the Leftist converts as follows (p. 123f.): “The Muslims are the spoil-sports who turn up at the party uninvited... Tolerance has its limits even for the progressivists in Holland. It is easy to be tolerant towards those whom we instinctively think we can trust, whose jokes we understand and who share our use of irony... It is far harder to apply this principle to people in our midst who find our way of life as disturbing as we find theirs...”

(27) See the critique in my essays on H.P. Krüher (ed.), Hirn als Subjekt? Philosophische Grenzfragen der Neurobiologie (Berlin: Akademie-Verlag, 2007), pp. 101-120 and pp. 263-304

(28) This is the key issue for John Rawls when he calls for an overlapping consensus between groups with different world views to accept the normative substance of the constitutional order: Rawls (1998), pp. 219-64

(29) I. Buruma, “Wer ist Tariq Ramadan,” in: Chervel & Seeliger (2007), pp. 88-110; B. Tibi, “Der Euro-Islam als Brücke zwischen Islam und Europa,” ibid., pp. 183-99

(30) J. Habermas, Religion in der Öffentlichkeit, in: ders.(2005),119-154

# رۆح لە روانگەی فەیلەسوفەکانەوە

نووسینی: محەمەد قرقنجی
و.لە تورکییەوە: رەسوڵ حەسەن

سـوقرات کە یەکێکە لە فەیلەسـوفەکانی چاخی یەکەم کاریگەریەکی گەورەی لەسەر فەیلەسوفەکانی دوای خۆی بەجێ هێشتووە. سەبارەت بەمەسەلەی رۆح بیرو بۆچوونەکانی مایەی سـەرنج و رامانە. سوکرات بۆ گەیشـتن بەراستی مەسەلەکانی پەیوەست بە ژیری و دانایی هەلوەستەی لەسـەر ماهیەتی نەفسی مرۆڤ کردووە و سیستەمی فکری فەلسەفی خۆی لەسەر ئەمە بونیاتناوە. لەم لایەنەشەوە شایەنی ئەوەیە کە ناونیشانی یەکەمین فەیلەسوفی پێبدرێت.

لێرەدا دەتوانین بیرو بۆچونەکانی سوقرات سەبارەت بە بابەتی رۆح بەمشێوەیە کورت بکەینەوە:

نەفس و رۆحـی مرۆڤ لەلایەکی یەکەم جیهانی بوندا بەرلە جەستە ئامادەگی هەیە. دوای ئەوە لەگەڵ جەسـتەدا یەکدەگرێت. جەسـتە بەرگ و ئامرازی کارکردنی رۆحە. کاتێك جەسـتە تێکدەچێت و شی دەبێتەوە نەفس دەگەرێتەوە ئەو سـەرچاوەیەی کەلێی هاتووە. یەکگرتنی جەسـتەو نەفـس (رۆح) بۆ دوو

## بەگوێرەی پرەنسیبی سیستەمی ئەرستۆ، ژیان ڕۆحە. ژیانیش گوزارشتە لە جوڵە. لە کاتێکدا بۆ ئەوەی هەرجوڵەیەك جوڵەیەکی تر بەخێرایی بەدوای خۆیدا بهێنێت پێویستی بە مادەیەکی جوڵاو هەیە. ڕۆشنایی و نوریش لە مرۆڤدا لەوەدایەکە خێرایی ڕۆح و مادەش جەستەیە.




مەبەستی گرنگ لە ئارادایە.

١.تەکامول بوون

٢. بەردەوام بوون

بەبۆچوونی سوقرات مرۆڤ گوزارشتە لە ڕۆح. جەستە هیچ ماهیەتێکی نیە. تەنها ناوەندێکە بۆ کارکردنی مامۆستاکەی کە ڕۆحە، هەروەها ئامرازێکە بۆ پێکهێنانی فەرمانەکانی ڕۆح. ڕۆح خۆی لە جەستەدا دەشارێتەوە بۆ ئەوەی نەبینرێت و بەرپرسیارە لە بەکارهێنانی جەستە. جەستە کاتیە و لەناودەچێت بەڵام ڕۆح ئەبەدی و بەردەوامە.

سوکرات بەمشێوەیە وەڵامی پرسیاری "مرۆڤ بۆچی هاتۆتە دنیاوە و وەزیفەی چییە؟"داوەتەوە: "وەزیفەی مرۆڤ ئەوەیە کە دنیای خوارەوە لە زەوقە کاتیەکان پاك بکاتەوە و ڕۆحی بەرەو ئامانجە بەرزەکان ئاراستە بکات" ئەمەیە مەبەست لە هاتنە دنیای مرۆڤ. سوقرات حەشری جەستەی قەبوول کردووە پشتراستی کردۆتەوە، واتە باوەری بە زیندووبوونەوەی جەستە هەبووە دوای مردن. ئەم باوەریەی سوکرات لەوقسانە دەخوێنینەوە کە لەکاتی دادگایی کردنی لەبەردەم دادوەرەکان کردبووی "مردن کە کۆچکردنی ڕۆحە لەم دنیایەدا، لە ناوچوون نیە بەڵکو ڕزگار بوون و ئازادبوونە، بەڕاستی مردن ڕێگایەکە مرۆڤەکان لەم دنیایە دەباتە ئاخیرەت. هەموو مردووەکان لەدنیایەکی تردا سەرلەنوێ زیندوو دەبنەوە".

باگوێ لە(ئەفلاتون Eflatun-)بگرین کە فەیلەسوفێکی بە ناوبانگی دیکەی چاخی یەکەمە.

ئەفلاتوون هەبوون دابەش دەکات بۆ هەبوونی سەرو هەبوونی خواروو(اعلی و سفلی) دەڵێت: ڕۆح لە هەبوونی سەروو دایە.

ڕۆح لەسەرەتادا لەو پایە (مەقام)بڵندەدا لە (جیهانی نمونەییدا) دەژیا، لەژیان ڕازی بوو، خاوەنی زانست بوو. دووباڵی هەبوو باڵی حەق و باڵی خێر. دوای ئەوە دابەزیە سەر ڕووی زەوی

و هەردوو باڵی لەدەستدا. مەبەستی سەرەکی رۆح لەم دنیایەدا ئەوەیە کە هەردووباڵی واتە سیفەتی حەق و خێر لەنوێوە بەدەستبهێنێتەوە.

ئەفلاتون نەفسی مرۆڤ دابەش دەکاتە سەر سێ جۆر

١. نەفسی شەهوانی
٢. نەفسی خواردن
٣. نەفسی دەربرین

کاتێك «نەفس» رۆح دەربرین بێت ئەوا سەرچاوەی فکرە. سەرچاوەی توانای بیرکردنەوەیە لە مرۆڤدا. رۆح لەلایەن جەنابی حەقەوە بەبێ هۆکار خولقێنراوە. هیچ شێوەیەکی نیە، مرۆڤ ناتوانێت بەچاو ببینێ. ناوەرۆکێکی بە تەواوی جولاوە و بەبزاوتە، واتە قابیلیەتی ئەوەی هەیە کە بەویست و ئارەزوی خۆی بجولێتەوە. سادەیە پارچەنابێت و نابینریت. جەستەیی نیە، هەموو جۆرە چالاکیەکی ناوەندی «مەرکەزی»یانەیە. ئیلاهیانە و ئەبەدیانەیە.

دەتوانین بیرۆکەی سوقرات کە دەڵێت: "رۆح پێش جەستە بوونی هەیە. لەلای ئەفلاتونیش ببینین، رۆح دوای لەناوچوونی جەستەش بەردەوام دەبێت. ژیان مەغزای رۆحە. مردن جیابوونەوەی رۆحە لە جەستە، دوای ئەوەی رۆح لە جەستە جیادەبێتەوە وەکو بەشێك لە سروشت درێژە بە ژیان دەدات.

مرۆڤ بەهۆی نەفسەوە هەست دەکات و درك دەکات. لەرۆحدا دوو ئیعتیبار هەیە یەکیان مرۆڤانە و ئەویتریشیان ئاژەڵانەیە. پەیوەندی رۆح بەجەستەوە تەدبیر و هەڵس و کەوت ئاراستە دەکات. هەروەکو چۆن شێوەی مرۆڤەکان جیاوازن و لەیەك ناچن ئەوا رۆحی مرۆڤەکانیش لەیەکتر ناچن و یەکێك لە یەکێکی جیاوازە. رۆح بەکارهێنراو نیە بەکارهێنەرە.

ئالەتی موسیقی ئاهەنگێك نیە. بەڵکو مۆسیق ژەنێکی نەبینراوە ئەوەی پێی دەگوترێت جەستە دەکاتە ئالەت و ئەوەی پێشی دەگوترێت «ژیان» دەکاتە ئاهەنگ. ئەگەر بیەوێت دەتوانی بیشکێنێت و بەرش و بڵاوی بکاتەوە ئەرستۆ و ئەفلاتون لەو بیرۆکەیەدا هاوڕان کە دەڵێت: "رۆح جەستەی نیە و گەوهەرێکە". بەبۆچوونی ئەرستۆ رۆح رووداوە واتە ئەزەلی نیە. لەگەڵ جەستە بە یەکەوە دەخولقێنرێن. کاتێك جەستە لە ناو دەچێت ئینجا رۆح دەمێنێتەوە و ئەبەدی دەبێت.

بەگوێرەی پرەنسیبی سیستەمی ئەرستۆ، ژیان رۆحە. ژیانیش گوزارشتە لە جوڵە. لە کاتێکدا بۆ ئەوەی هەرجوڵەیەك جوڵەیەکی تر بەخێرایی بەدوای خۆیدا بهێنێت پێویستی بە مادەیەکی جوڵاو هەیە. رۆشنایی و نوریش لە مرۆڤدا لەوەدایەکە خێرایی رۆح و مادەش جەستەیە. هەروەك چۆن رۆح بەشێك نیە لە جەستە ئاوهاش لێی جیاواز نیە. لێرەدا ئەرستو پێی وایە کە خودی رۆح بزوێنەر نیە بەمەش پێچەوانەی بۆچونی ئەفلاتون دەوەستێتەوە بەبۆچوونی ئەرستۆ رۆح بۆ ئەوەی خۆی بجولێنێتەوە جەستە بەکار دەهێنێت و دەیوروژێنێ. جولەی رۆح وەکو ئەو مرۆڤە نیە کە لەسەر زەوی دەڕوات. بەڵکو وەکو جوڵەی ئەو مرۆڤە یە کە سواری بەلەمێك بووە. رۆح ماددی نییە و لەهەمان کاتیشدا نادیاریکراویش نییە. هەموو جوڵەیەکی جەستە رۆح پێی هەڵدەستێت و بەرێوەی دەبات . رۆح هۆکاری هەموو مەرجەکانی ژیانی جەستەیە.

ئەرستۆ دەڵێت: "رۆح خێرایی جەستەیە "، لەو باوەڕەدایە کە جەســـتە لە پێناو رۆح خوڵقێنراوە. مەبەســـت لەبوونی جەســـتە خزمەتکردنی رۆحە. جەســـتە کـــە ئالەتێکـــی رۆحە، بەشـــێوەیەکی گونجـــاو بـــۆ پێکهێنان و خســـتنەواری کرداری فەرمان دروســـتکراوە کە وەزیفەی سەرەکییەتی وەبەشێوەیەکی گونجاویش بۆ ئەمە ڕێکخراوە.

ئەرســـتۆ کـــە گوتویەتی "ژیان لە ســـایەی رۆحەوە بەرەوپێشەوە دەچێت"، پێشبینی پێنج جۆر رۆحی کردووە.

١. نەفسی خواردن
٢. نەفسی هەست
٣. نەفسی بزواتن
٤. نەفسی شەهوانی
٥. نەفسی ئەقڵا

هەروەها «دیسکارتس» سەبارەت بە مەسەلەی رۆح هەندێك تێبینی سەرنج راکێشی خستۆتە روو. "دیســـکارتس" کە بەوە دەناســـرێت گرنگیەکی زۆری بە فکر و بیـــر داوە، دەڵێت لە گەوهەری رۆحـــدا فکـــر هەیە. ئـــەوەی رۆحـــی کردووە بەگەوهەر فکرە. رۆح پێویســـتە لەم سایەوە خۆی بناســـێنێت. رۆحی مرۆڤ لەکـــوێ دەبێت بابێت دەتوانێـــت بیربکاتەوە، ئەم توانایە لەودا هەیە. جیا لە جەســـتە هێز و توانای زانینـــی هەیە. هەروەکو لەگەڵ جەســـتەدا نەهاتۆتە ئـــاراوە . ئاوهاش بە جەستەشەوە سنوردارنیە. شێوەی نیە نابینرێت. بۆیە کاتێك جەستە تێك دەچێت ئەو پشونادات. رۆحی مرۆڤ نەمرە و نامرێت.

مالیبرانچ: هەموو بیرۆکەکانی ســـەبارەت بەم بابەتە لە خوا و باوەری بەخوا وەرگرتووە. "هەموو رووداوەکان یەك بە یەك عیبارەتن لە وەسیلە"ئەمە قســـەی «مالیبرانچ»ە. لـــەو بڕوایەدایە کە رۆحی مرۆڤ درك بەکاریگەری خوا ناکات و هەســـتی پێناکات. رۆح بەتەواوی جیایە لە جەســـتە: هیچ پەیوەندیـــەك لە نێوانیاندا نیە. رۆح ســـەربەخۆ نیە لـــە چالاکیەکانیدا و بەخـــواوە گرێدراوە. ئەوەی زانیاریش دەداتە رۆحی مرۆڤ، خودایە.

لەم بوارەدا بەبێ بەبیر هێنانەوەی بیرۆکەکانی «بەرگەسۆن» تێناپەڕین کە فەیلەسوفێکی گەورەی چاخەکەمانە و ئاراســـتەیەکی بە تەواوی نوێی بە میتافیزیکیەت دا و شۆڕشێکی بەرپاکرد.

بەبۆچوونی بەرگەســـۆن: شعوری ئێمە بەرگ و بەشی ناوەوەی هەیە. بەرگەکەی توێژاڵی ئەقڵ و زیرەکی و لۆژیك و زانســـتە. ئـــەم توێژاڵە بە ئاگادارکردنەوەی کۆمەڵـــەی مەرجەکانی کاری ژیـــان پێکدێت. ئەم بەشـــە جاریـــەی گەیاندنی یاســـای چالاکیەکانە. لێرەدا ئـــازادی نیە بەڵکو دەستنیشـــانکردن هەیـــە کاتێك باس لە هەســـت «شعور»ی ناوە وە دەکەین دەتوانین ناوی بنێن «من». کاتێك تۆماری کارو لۆژیك وەك دەستنیشانکردن دەبێتە جێگای بـــاس، «من» بە تەواوی پێچەوانەی ئەمە داوای کەیف و خۆشـــی دەکات. یەکەمیان کۆمەڵە ئاگادار دەکاتەوە کە دەست نا کەوێت و جێگیر بووە بەمەش دەکەوێتە رەوشی «من» ێکی روکەشانە و کۆمەڵایەتیانە.کەچی «شعور» هەستی نـــاوەوە بەردەوام لە حاڵەتی بەیەکەوە نوســـان و توانەوەدایە. ئیدی ئەمەیە گۆڕەپانی راســـتەقینەی «من» بە بۆچوونی بەرگەســـۆن پەیوەندی ماددە و رۆح وەکـــو پەیوەندی حافیزە و دەماغ وایە. دوو جۆر حافیزە هەیە.

١. حافیزەی بنچینەیی
٢. حافیزەی میکانیکی

حافیــزەی بنچینەیی لەگــەڵ جیهانی مادی لە نێــو پەیوەندایە . حافیــزەی دووەمیش خەیاڵ و بیرەوەریەکانــە. بەرگەســۆن لــە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانــەی کــە ئەنجامی داوە گەیشــتۆتە ئەو بــاوەڕەی کە دەمــاغ خودی حافیــزە نییە. بەڵکو ئالەتێکی ئاگادارکردنەوەیە. ســەرچاوەی بیرکردنەوە حافیزەی دینامیکیە.

هیــچ کاتێك دەماغ، حاڵەتــی رۆحیی وەکو بیرکردنــەوەی نیە. خۆی لە خۆیــدا بیرو ژیری یاخود ئەو بونانەی کە ماددی نین، هیچ کاتێك لە مادده وە دروســت نابن. ئەرکی دەماغ ئەوەیە کە خزمەتی دروست کردنی پەیوەندی عونسورەکانی وەکو بیر و شعور لەگەڵ واقع بکەن، حاڵەتەکەشی عیبارەتە لە بوون بەوەســیلەی هەماهەنگی لەکاتە پێویستەکاندا.

لێــرەدا دیــار دەبێــت کە بەرگەســۆن جیا لــە فەیلەســوفە مادیەکانی تر. لەمیانی زانســتی سروشتیەوە گەشــەی بەروونکردنەوەکانی داوە و مەســەلەی درك کردنی بە تەواوی بە مەســەلەی رۆح بەستۆتەوە. جیاوازی حەقیقەت لە ناسنامەی مرۆڤدا لە میانی هیچ وەسفێك دەستنیشان ناکات و هەبوونی رۆح «معنویات» وەك بنچینەیەك قەبووڵ دەکات .

ئەم فەیلەســوفە بە ناوبانگە پێی وایە جەســتە وەکــو ئالەتێك لە ژێر فەرمانی رۆح دایە. رۆح لە دەربڕینی هزر و بیریدا ســود لەو دەبینێت. جەستە بەردەوام وەکو کرێکارێکــە. وەزیفەی بنچینەیی جەستە ئەوەیەکە کرێکار بێت.

هێزی ئــەوەی نیە کە هیچ رووداوێکی ئەقڵی بێنێتــە کایەوە، رووداوەکانــی ئەقڵ لە دەرەوەی جەستە دەرهاویشتەی هێزگەلێکن کە مادیی نین. ئیتر بەو هێزە بڵێین رۆح یا نەفس هیچ لە ئەنجامەکە ناگۆڕێــت. بەرگەســۆن لەمیانــی دامەزراندنی سیســتەمی بیرکردنــەوەی ئەوەی ســەلماندووە کــە مرۆڤ هەبوونێکە لە میانــی یەکگرتنی دوو هەبوون کە ئەویش ماددی و مەعنەویی، «رۆحی» دروستبووە. هەموو ئەمانەشــی رەتکردۆتەوە کە تەنها باوەڕیــان بە مادده هەیە یا ئەوانەی جگە لە رۆح هیچ حەقیقەتێکی تر پەسەندناکەن.

هەروەکو چۆن لەبەشــی «بەڵگە زیندوەکانی پەیوەســت بــە رۆح» ئاماژەمان پێدا. ســەبارەت بەرۆح ئەوەی خاوەنی قسەی راستە پێغەمبەرەکانن و هەروەها زانایانــی ئاینین کە میراتگری ئەوانن. ئەوان پەپشت بەستن بەوەحی «سروش» و ئیلاهیات دەڵێن ئەوەی رۆحی خولقاندووە جەنابی «حەق»ـە هەرچی بیروبۆچوونی فەیلەســوفەکانە سەبارەت بەرۆح، ئەو رێژەیەی کە لەگەڵ وەحی و ئیلاهیات دەگونجێت پەسنددەکرێت. بەڵام ناتوانرێت هەموو بیروبۆچوونی فەیلەسوفەکان پەسندبکەین بەتایبەتی کە ئەقڵ لە هەر رووبەکەوە حەقیقەتی تێدا نەبینی و هەرسی نەکات. هەریەکێك بەرێژەیەکی دیاری کراو لە»حەق» راســتی نزیك بۆتــەوە توانیویەتی بەگوێــرەی ئەقڵــی خــۆی رووبەکی راســتی «حەقیقەت» بخاتە روو. بۆیە پێویســتە قســەکانی ئەوان بە تــەرازووی ئاین و «حەق» بکێشــرێت و ئــەو بیروبۆچونانەی پــاك و خاوێن بە رێزەوە وەربگیرێن و ئەو بیر و بۆچونانەی کە چەوتیشــن پشتگوێ بخرێن.

**سەرچاوە:**

www.mehmedkirkinci.com

# فتیشیزمی کالاّ و ڕەمزەکانی

نوسینی: کارڵ مارکس
و. لە فارسییەوە: هادی محەمەدی

سەرەتا: لەم ساڵانەدا چەندین بەرهەم لە لوکاچ، گرامشی، گوڵدمەن و مارکوزە و ... کراوە بە کوردی، لە کاتێکدا کە سیستمی فەلسەفی هەموو ئەم نووسەرانە بەپێی پشتخانی فکری و مێتۆدۆلۆژیکی بیرمەندانێك وەك کانت، هێگل و مارکس پێکهاتووە، بەڵام بەدەگمەن بەرهەمێکی ئەم بیرمەندانە کراوە بە کوردی، بەهۆی گرنگی ناسینی سیستمی فەلسەفی مارکسیستی، تێکۆشام کە تیۆری فتیشیزمی کالاّ، کە بەشی گرنگ و بنەڕەتی سەرمایەی مارکس پێکدێنێ، بکەم بە کوردی.

تیۆری فتیشێزمی کالاّ کە لەخۆیدا بناغەی گشتی سیستمی فەلسەفی مارکس پێکدێنێ، بەپێی ئەم بیرە پێکهاتووە: لە جڤاتی بورژواییدا کالاّ کە بەرهەمی کاری مرۆڤە، فۆرمێکی ڕەمزی و سەربەخۆ لە ئیرادەی مرۆڤ بەخۆوە دەگرێ و، پێوەندی کالاّکان و گۆڕینەوەی کالاّکان، پێوەندی ئینسانەکان کونترۆڵ دەکات.

پرۆسەی فتیشیزم کالاّ، یانی هەموو بەرهەمێکی کاری مرۆڤ و گشت بەرهەمێکی فەرهەنگی هونەری، بەهای ڕاستین و ڕۆڵی ڕەخنەگرانەی خۆیان دەدۆڕێنن و بەشێوەی جۆرێك فتیش، بوت، دەردەکەون. وەك بڵێی ڕۆحێکی جادوویی دایگرتوون بە زرق و

**کاڵا لە یەکەم سەرنجدا وەك شتێکی سادە و ئاسایی دەردەکەوێ، بەڵام شیکاری ئێمە پیشانی دەدات کە کاڵا شتێکی ئێجگار ئاڵۆز و ڕەمزاوی و پڕ لە وردەکاری متافیزیکی و پڕ لە جوانکاری لاهوتییە.**

برقی خۆیان مرۆڤەکان شەیدا و ئەفسوون دەکەن، بەجۆرێك کە مرۆڤ دەبێتە کۆیلە و بەندەی کاڵا و ستایشی دەکا و دەیپەرستێ؛ لە کاتێکدا کە خۆی خولقاندوویەتی.

لوکاچ گرنگی تیۆری فتیشیزم بەمجۆرە راڤە دەکات: «زۆر جار وتویانە کە بەشی بەناوبانگی لۆژیکی هێگل لەمەڕ بوون، نەبوون و گۆڕان، هەموو فەلسەفەی هێگلی لەخۆیدا هەڵگرتووە. رەنگە بەمجۆرە بتوانین بێژین کە ئەو بەشەی سەرمایە لەمەڕ سروشتی فتیشزمی کاڵا، تێکڕای ماتریالیزمی مێژوویی و وشیاری پرۆلیتاریا وەك دەرکی کۆمەڵی بورژوازی (و جڤاتانی پێشوو وەك چەند قۆناغێکی پێشچوون بەرەو ئەم کۆمەڵگە)ی لە خۆیدا هەڵگرتووە.»

**وەرگێڕ**

کاڵا لە یەکەم سەرنجدا وەك شتێکی سادە و ئاسایی دەردەکەوێ، بەڵام شیکاری ئێمە پیشانی دەدات کە کاڵا شتێکی ئێجگار ئاڵۆز و ڕەمزاوی و پڕ لە وردەکاری متافیزیکی و پڕ لە جوانکاری لاهوتییە.

تا کاتێ کە وەك بەهای بەکارهێنان (**use value**) سەیری کاڵا دەکەین، هیچ شتێکی ڕەمزاوی تێدا نییە، ئێستا چ وەك شتێك ببینین کە بەهۆی تایبەتمەندییەکانی ویستێکی مرۆڤ دابین دەکات، یان ئەم تایبەتمەندییانە بە بەرهەمی کاری مرۆڤ بزانین.

وەك رۆژ ئاشکرایە کە مرۆڤ بەهۆی تێکۆشانی خۆی شێوازی ماتریاڵی سروشتی بەجۆرێك دەگۆڕێ کە سودی پێ ببەخشن. بۆ نمونە کاتێك مێزێك ساز دەکرێت، شێوازی چێو دەگۆڕدرێت. بەڵام دیسان وەك چێو دەمێنێتەوە، یانی وەك شتێکی بەرهەست و ئاسایی. بەڵام هەر کە وەك کاڵا دەردەکەوێ، دەبێتە شتێکی بەرهەستی باڵا (**transcendent**).

لەم ساتە بەدواوە ئیتر مێز تەنیا لە بان پایەکانی خۆی لەسەر زەوی ناوەستێ، بەڵکوو، لەئاست کاڵاکانی تردا لە بان سەری دەوەستێ و لە مێشکی

چێوێنی خۆیدا سـەدان بیری سـەیر دەوروژێنێ سەیرتر لەو کاتە کە دەیویست بە شایی و سەماوە لە چێو ساز بکرێت.

کەوابوو خەسـڵەتی رەمـزاوی کاڵا لە ناخی بەهای بەکارهێنانەوە سـەرچاوە ناگرێ، هەروەها بەهـۆی ئـەو فاکتۆرانە کە بەهـای کاڵا دیاری دەکەن، پێکنایەت، چونکە یەکەم، هەرچەندە کار و تێکۆشانی بەسود و بەرهەمهێنەر لێك جیاواز بن، فیزیۆلۆژی ئەم راسـتییە دەردەخات کە هەموویان بەرهەمـی ئۆرگانیزمـی جەسـتەی مرۆڤن؛ هەر کام لەم کارانە، بە هەر نـاوەرۆك و فۆرمێکەوە، بەهۆی هێزی مێشـك، دەمارەکان، ماسولکەکان، ئەندامەکان و هەسـتەکانی مـرۆڤ بەرهەم دێن. دووهەم، ئەو شـتەی کە بنەمای رێژەی بەهاکان دیاری دەکات، یان مەودایەکی زەمەنی کە هێزی کار بەکارهێنـراوە یـان چەندێتـی کار، لەگەڵ چۆنێتـی کار، جیاوازی بەرچاوی هەیە. لە هەموو بارودۆخێکـدا، زەمانی کار، کە بـۆ دابینکردنی پێویستییەکانی ژیان پێویستە، هەرچەند لە قۆناغی جیاوازی گەشەی مرۆڤدا یەکسان نییە، بەڵام کار و تێکۆشـانی مرۆڤ داگیر دەکات. سەرئەنجام، لەو کاتەوە کە مرۆڤەکان بەجۆرێك بۆ یەکتر کار دەکەن، کارەکانیان فۆرمێکی کۆمەڵایەتی بەخۆوە دەگرێ.

کەوابوو ئەی خەسـڵەتی رەمزاوی بەرهەمی کار، کـە هەر کات فۆرمی کاڵا بەخۆوە دەگرێ دەردەکەوێ، لە چی سەرچاوە دەگرێ؟ ئاشکرایە هەر لەم فۆرمەوە سـەرچاوە دەگرێ، یەکسـانی هەموو جۆرەکانی کاری مرۆڤ، وەك فۆرمی مادی یەکسـانی بەهای بەرهەمەکانی کار دەردەکەوێ؛ لە ئەنجامـدا پێوەری رادەی کاری مرۆڤ، بەپێی مـاوەی زەمانی سـەرفکراو، وەك فۆرمی رادەی بەهای بەرهەمەکانی کار دەردەکەوێ؛ سەرئەنجام، پێوەندی نێوان بەرهەمهێنەران، کە لەودا خەسڵەتی کۆمەڵایەتی کارەکانیان بەدیدێت، وەك پێوەندی نێوان کاڵاکان دەردەکەوێ.

کەوابوو خەسڵەتی رەمزاوی فۆرمی کاڵا، تەنیا بریتییە لەوە کە کاڵا خەسڵەتی کۆمەڵایەتی کاری مرۆڤ، وەك خەسـڵەتی عەینی خودی کاڵاکان و، وەك خەسـڵەتی کۆمەڵایەتی زاتی شـتەکان دەردەخـات، بەمهۆیـە پێوەنـدی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنـەران لەگـەڵ پرۆسـەی کار، وەك پێوەندی کۆمەڵایەتی نێوان شـتەکان، سەربەخۆ لـە بەرهەمهێنـەران، پیشـان دەدات. بەمجۆرە بەرهەمەکانی کار دەبن بـە کاڵا، هاوکات دەبن بە شـتی بەرهەسـتی بان بەرهەسـت، یانی وەك شـتی کۆمەڵایەتی دەردەکەون. بەمجۆرە دەماری بینایی نوورێـك کە لە شـتێك وەریدەگرێ، نە وەك بزوێنـەری دەمـاری بینایـی، بەڵکوو وەك فۆرمی عەینی ئەو شـتە، وەك شـتێکی سەربەخۆ و لـە دەرەوەی چـاو پیشـان دەدات. بەڵام ئەو شـتە کە لە کاتی دیتنـدا روودەدات ئەمەیە کە نوور لە شـتێکەوە دێت و لە چـاو دەدات. ئەمە پێوەندییەکی فیزیکییە لە نێوان دوو شتی فیزیکیدا. بـەڵام بەپێچەوانەوە، فۆرمـی کاڵایی و پێوەندی بەهایی نێوان بەرهەمەکانی کار، هیچ پێوەندییەکی بە سروشتی فیزیکی کاڵاکان و پێوەندی مادییانەوە نییە. لەڕاسـتیدا ئەوە تەنیا پێوەندی تایبەتی نێوان مرۆڤەکانە کە لێرەدا بەشـێوەی رەمزاوی پێوەندی نێوان شتەکان دەردەکەوێ. بۆ دیتنەوەی فۆرمێکی

هاوشـــێوەی لەم چەشـــنە، دەبێ سەرێك لە دنیای تەماوی دین بدەین. لێرەدا ئەو شـــتانە کە زەین و بیری مرۆڤ خولقاندونـــی، وەك چەند بوویەکی خۆرســـکاو و ســـەربەخۆ دەردەکەون کە لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ مرۆڤ لـــە پێوەندیدان. لە دنیای کاڵاکانیشـــدا بەرهەمەکانی کار و ڕەنجی مرۆڤ بەمجۆرە دەردەکەون. من ئەم دیاردەیە بە فتیشیزم (بوتکراوی) کاڵا پێناسە دەکەم، هەر کە بەرهەمی کار وەك کاڵا دەردەکەوێ، ئەم خەســـڵەتەی پێوە دەچەســـپێ و وەك سروشـــتی زاتی بەرهەمهێنانی کاڵایی دەردەکەوێ.

هـــەر وەك شـــیکاری ئێمە ســـەلماندوویەتی فتیشیزمی جیهانی کاڵاکان لە سروشتی کۆمەڵایەتی تایبەتی کار سەرچاوە دەگرێ کە کاڵاکان بەرهەم دێنێ.

ئەو شتانە کە پێویســـتی مرۆڤ دابین دەکەن تەنیا بەمهۆیە بەشـــێوەی کاڵا دەردەکەون چونکە بەرهەمـــی کاری تایبەتی کەســـانێکن کە بەجیا و ســـەربەخۆ لـــە یەکتر کار دەکەن. ســـەرجەم ئـــەم کارە تایبەتانە تێکـــڕای کاری کۆمەڵایەتی پێکدێنـــن. بۆوەی کـــە بەرهەمهێنەران ســـەرەتا بەهۆی گۆڕینـــەوەی بەرهەمی کارەکانیان لەگەڵ یەکتر پێوەندی کۆمەڵایەتی پێکدێنن، خەســـڵەتی کۆمەڵایەتـــی کارەکانیان لەنێو ئـــەم گۆڕینەوەدا دەردەکـــەوێ. بە وتەیەکی تـــر، کارە تایبەتەکان وەك بەشێك لە سەرجەم کاری کۆمەڵایەتی ئەنجام دەدرێن، بـــەڵام تەنیا بەهۆی پێوەندی و ئاڵوێری بەرهەمەکانی کار لەنێـــوان بەرهەمهێنەراندا وەك ئەڵقەی پێوەندی ڕۆڵ دەگێڕن. بەمهۆیە، پێوەندی کۆمەڵایەتی نێوان کارە جیاوازەکان، لەبەر چاوی بەرهەمهێنەران، وەك خەســـڵەتی ڕاستینی خۆیان دەردەکەوێ؛ یانـــی نە وەك پێوەندی کۆمەڵایەتی ڕاستەوخۆی نێوان کەسەکان لە جەرگەی کاردا، بەڵکوو وەك پێوەندی عەینی نێوان کەســـەکان و پێوەندی کۆمەڵایەتی شتەکان دەردەکەوێت.

تەنیـــا لە قاڵبی ئاڵوێردایە کـــە بەرهەمەکانی کار، جۆرێـــك بایەخـــی کۆمەڵایەتی یەکســـان بەدەست دێنن کە لە خەسڵەتی مادی سودمەند و جیاوازیان ســـەربەخۆیە. دابەشکردنی بەرهەمەکان بە شتی سودمەند و شـــتی بایەخدار، تەنیا کاتێك ڕوودەدات کە لە پێشـــدا پرۆسەی ئاڵوێر هێندە پەرەی ســـەندبێت و ڕۆڵـــی گرنگ بگێڕێت، کە ئەو شتانەی سودمەندن تەنیا بەمەبەستی گۆڕینەوە بەرهەم بهێنرێن، بەجۆرێك کە خەسڵەتی کاڵایی شـــتەکان تەنانـــەت لە کاتـــی بەرهەمهێنانیشـــدا ڕەچاو بکرێت. لەم ســـاتەدایە کە کاری شەخسی بەرهەمهێنـــەران جۆرێك خەســـڵەتی دوالیســـتی بەدەســـت دێنێ. لەلایـــەك، کاری بەرهەمهێنەران دەبێ وەك کارێکی بەسودی تایبەت، پێویستییەکی کۆمەڵایەتـــی تایبەت دابین بکات و پێگەی خۆی وەك بەشێك لە سەرجەم کاری کۆمەڵایەتی، وەك بەشێك لە سیستمی خۆڕسکاوی، دابەشبوونی کاری کۆمەڵایەتی، بپارێزێ. بەڵام لەلایەکی ترەوە، هەر کارێکی شەخسی بەسود تەنیا بەمەرجێك دەتوانن پێویســـتی جیاجیای خـــودی بەرهەمهێنەر دابین بکات، کە بتوانێ لەگەڵ کارێکی تری شەخســـی بەســـود ئاڵوێر بکـــرێ و وەك هاوتای ئەو کارە حساب بکرێت.

یەکســـانی نێـــوان دوو کاری تـــەواو جیاواز تەنیا بەهـــۆی جۆرێك دابڕان [یان ڕەتکردنەوەی]

نایەکسانی ڕاستەقینەی کارە [تایبەتەکان] هەموار دەبێ، یانی کورتکردنـــەوەی هەموو کارەکان بۆ جۆرێك خەسڵەتی هاوبەش: هێزی کاری مرۆڤ، کاری ئابستراکتی مرۆڤ.

لە مێشکی بەرهەمهێنەراندا، وەها خەسڵەتێکی کۆمەڵایەتـــی دوالیســـتی کاری تایبەتـــی، تەنیا بەشـــێوەی گۆڕینەوەی بەرهەمەکان دەردەکەوێ. یانی لە جەرگەی ئاڵوگۆڕدا، خەسڵەتی سودمەندی کۆمەڵایەتـــی کاری تایبەتـــی، بەشـــێوەیەك دەردەکـــەوێ کە دەبێ بۆ خەڵکی تر ســـودمەند بێت؛ بەمجۆرە، خەســـڵەتی کۆمەڵایەتی یەکسانی کارە جیاوازەکان، وەك ئەو بەرهەمانە دەردەکەون کە لەڕووی مادییەوە جیاوازن، بەڵام هەموو خاوەن بەهایەکی هاوبەشن، یانی هەموو بەرهەمی کارن.

کەوابوو کاتـــێ تاکـــەکان بەرهەمی کاری خۆیـــان بە ناوی بەها لەئاســـت یەکتر دادەنێن بە مانای ئەوە نییە کە ئەم شـــتانە تەنیا وەك پۆششی مادی کاری یەکسانی مرۆڤ دەزانن. بەپێچەوانەوە، کاتێ خەڵك بەرهەمـــە جیاوازەکانی خۆیان وەك بەها ئاڵوگۆڕ دەکەن، کاری جیاوازی خۆیان وەك کاری مرۆڤ، یەکسان دەکەن، ئەوان ئاگایان لەم شتە نییە، بەڵام ئەنجامی دەدەن.

کەوابوو چییەتی بەها لەسەر تەوێڵی نەنوسراوە. بەڵکـــو بەپێچەوانەوە، بەهـــا، هەر جۆرە کارێك وەك هیرۆگلیفێکی کۆمەڵایەتی دەردەخات. پاشان مرۆڤ تێدەکۆشـــێ مانای ئەم هیرۆگلیفە بناسێ و پەردە لە ڕووی بەرهەمـــی کۆمەڵایەتی خۆی داماڵێ. چونکە لێدانی مارکی بەها لە شـــتەکان، ڕاســـت وەك زمان، بەرهەمی کاری کۆمەڵایەتی مرۆڤە.

وەها داهێنانێکی زانستی، کە بەرهەمی کاری خاوەن بەها، تەنیا سەمەرەی کاری مرۆڤە و بەس، لـــە مێژوویی مرۆڤدا هێمای ســـەردەمێکی نوێیە. بەڵام قەت ڕواڵەت یان خەیاڵی عەینی خەســـڵەتی کۆمەڵایەتی کار ناســـڕێتەوە. ئەو شتەی کە تەنیا لەمـــەڕ ئەم فۆرمەی بەرهەمهێنـــان- بەرهەمهێنانی کاڵایی- ڕاســـتە، یانی ئەم ڕاستییە کە خەسڵەتی کۆمەڵایەتـــی تایبەتی کاروباری تایبەت کە بەجیا ئەنجام دراون، لە هاوســـانی کاری مرۆڤیدایە و لە قاڵبی بەهای بەرهەمەکانی کاردا دەردەکەوێ، چ لە پێش و چ لە پاش ئەم داهێنانەدا، لە چاوی ئەو کەسانەوە کە لەنێو پێوەندی بەرهەمهێنانی کاڵاییدا گیـــرۆدەن، هێندە حەتمی و نەگـــۆڕە، وەك ئەم ڕاستییەیە کە هەوا، چ پێش و چ پاش دابەشکردنی زانستی بەسەر توخمەکاندا وابوو.

ئەوەی کە لە پێشـــدا ویســـتی ئاڵوگۆڕکارانی بەرهەمەکان بە کردەوە بەرەو خۆی ڕادەکێشـــێ، ئەم ڕاســـتییەیە کە بزانن بە گۆڕینەوەی بەرهەمی خۆیان چەندە بەرهەمی تر بەدەســـت دێنن، یانی بەرهەمەکان بەپێـــی چ ڕێژەیەك ئاڵوگۆڕ دەکرێن. هەر کە ڕێژەکان ببن بە جۆرێك نۆرم و نەریت و سەقامگیر بن، مرۆڤ پێی وایە ریشەیان لە سروشتی بەرهەمەکانی کاردایـــە، بەجۆرێك کە بۆ نموونە، یەك تۆن ئاسن و دوو ئۆنس ئاڵتوون [هەر ئۆنس = ٢٨ گرام] دەبن بە خاوەن یەك بەها، بەچەشنێك کە یەك پۆند ئاڵتوون و یەك پۆند ئاسن، سەرەڕای جیاوازی فیزیکی کیمیاییان، وەك یەك قورســـن. لە ڕاستیدا خەســـڵەتی بەهایی بەرهەمەکانی کار، تەنیـــا بەهۆی ڕۆڵ و کارکردیـــان وەك چەندێتی یان ڕێژەیەکی بەهایی فیکـــس دەبێت. ڕێژەکان

هەمیشـــە سەربەخۆ لە ئیرادە و پێشبینی و کرداری ئاڵوویرکاران دەگۆڕێن.

ئەمان کـــردار و بزاڤـــی کۆمەڵایەتی خۆیان وەك بزاڤی شـــتەکان دەبینن، بەجۆرێك کە ئەمان دەسەڵاتیان بەسەر بزاڤی کاڵاکاندا نامێنێ و بزاڤی کاڵاکان ئەمـــان کونترۆڵ دەکات. ئەم پرۆســـەیە پێویســـتی بە جۆرێك بەرهەمهێنانی کاڵایی تەواو گەشەکردوو هەیە تا بەرە بەرە بەهۆی دابەشکاری وەها بیرێکی زانستی سەرهەڵبدات کە: کاروباری تایبەتی کە ســـەربەخۆ لە یەکتـــر ئەنجام دراون، بەڵام وەك ئۆرگانی خۆڕسکی دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتـــی لە هەموو بوارێکەوە پێویســـتیان بە یەکتر هەیە، بەردەوام بەپێـــی پێوەری گونجاوی کۆمەڵایەتـــی خۆیـــان سنوردار دەکرێن. چونکە لە جەرگەی دانوســـتانی بەرێکـــەوت و هەردەم روو لە گۆڕانی ئاڵوویری کاڵاکاندا، رادەی کاری کۆمەڵایەتـــی کـــە بۆ بەرهەمهێنان پێویســـتە، لێبڕاوانـــە خـــۆی وەك یاسای حەتمی سروشت دەســـەپێنێ، راست وەك یاســـای جازبـــە کاتێ خانوو بەســـەر کەسێکدا دەڕوخـــێ. کەوابـــوو، دیاریکردنـــی رادەی بەها بەپێی زەمانی کار، رەمزێکە کە لە پشـــت بزاڤی رواڵەتی بەهای رێژەیی کاڵاکاندایە. ناسینی ئـــەم رەمزە پـــەردەی رواڵەتی خەســـڵەتی تەواو رێکەوتی رێژەی بەهاکان لەســـەر بەرهەمەکانی کار دادەماڵێ، بەڵام قەت شێوازی مادی کاڵاکان دەرناخات.

**رۆبینســـۆن ئەگەرچی مرۆڤێکـــی رازییـــە بـــەڵام زۆر پێویســـتی جیـــاوازی هەیـــە کـــە دەبێ دابینیـــان بکات، کەوابێ دەبێ چەندین کاری ســـەمەربەخش ئەنجـــام بـــدات: دەبێ کەرەسە و ئامێری کار بســـازێت، کەرەسەی نێومـــاڵ دابیـــن بکات، لاما دەســـتەمۆ بکات، ماســـی بگرێـــت، راو بکات و ...**

بیرکردنەوە لەمـــەڕ فۆرمەکانی ژیانی مرۆڤ و، شـــیکاری عەینی ئەم فۆرمانـــە، بە رێگایەکدا دەڕوات کە تـــەواو پێچەوانەی رەوتی ئاڵوگۆڕی راســـتەقینەیە. ئەم بیرکردنەوە پاش رووداوان [post festum] و بەپێـــی ئاکامی پرۆســـەی ئاڵوگۆڕ، دەســـت پێدەکات. فۆرمێکـــی کۆمەڵایەتی کە مۆرکی کاڵا لە بەرهەمی کار دەکوتێ و لە رەوت و بزاڤی کاڵاکان لە پێشترە، لە پێشدا وەك فۆرمێکی ژیانی کۆمەڵایەتی سەقامگیر دەبینـــرێ، یانی پێش ئەوەی کە مرۆڤ تێبکۆشـــێ نەك خەســـڵەتی مێژوویـــی ئەم فۆرمە - چونکە لە پێشـــدا وەك فۆرمێکـــی نەگـــۆڕ دەیبینێ- بەڵکوو سروشـــتی دەروونی بناسێت.

بەمجـــۆرە، تەنیـــا شـــیکردنەوەی نرخی کاڵا توانـــی رادەی بەهای کاڵا دیاری بـــکات، یانی کاتێ کە هێمای هاوبەشی هەموو کاڵاکان بـــە فۆرمی پووڵ دەرکـــەوت، خەســـڵەتی کاڵایـــی ســـەقامگیر کرد. کەوابـــوو دوایـــن فۆرمی

دنیـــای کاڵاکان – فۆرمی پووڵی- لەجیاتی ئەوە کە خەســڵەتی کۆمەڵایەتی کاروباری تایبەتی و پێوەنـــدی کۆمەڵایەتی نێـــوان کرێکارانی دابڕاو ئاشکرا بکات، دەیشارێتەوە.

کاتـــێ دەڵێین پاڵتاو، پێڵاو و هتد، ئەمانە وەك کاری ئابســـتراکتی مرۆڤ، لـــە پارچەی کەتان سازکراون، ڕەهەندی پووچ و بێ مانای ئەم وتەیە بەخێرایی دەردەکەوێ. بەڵام ئەگەر بەرهەمهێنەرانی پاڵتاو، پێڵاو و هتد، کاڵاکانی خۆیان لەگەڵ پارچە یان زێڕ و زیو، وەك پێوەری گشتی، بەراورد بکەن، ئەوجـــار پێوەندی کاری تایبەتی ئەوان لەئاســـت ســـەرجەم کاری کۆمەڵایەتی، بەشـــێوەی هەمان فۆرمی پووچ و بێ مانا [یانی پووڵ] دەردەکەوێ.

چەندین فۆرمی لەم چەشنە چەمك و کاتیگۆری ئابووری بورژوایی پێکدێنن. ئەمانە چەند فۆرمێکی فکرین کە خاوەن پرستیژی کۆمەڵایەتی و عەینین و مناسباتی بەرهەمهێنانی وەها فۆرمێکی مێژوویی کۆمەڵایەتی (بەرهەمهێنانی کاڵایی) بەیان دەکەن. بەمپێیە هەر کە باســـی فۆرمێکی تری بەرهەمهێنان بکەین لایەنی پڕ ڕەمـــز و ڕازی دنیای کاڵاکان، ڕەهەندی سیحر و جادوو کە دەوری بەرهەمەکانی کاریان تەنیوە، لەنێو دەچن.

ئێســـتا کە ئابووری سیاســـی تا ئـــەم ڕادەیە ڕووداوەکانی ڕۆبینســـۆن کرۆزۆی خۆش دەوێ، وەرن با ســـەرێك لـــە دوورگەکەی ڕۆبینســـۆن بدەین و بارودۆخی ببینین. ڕۆبینســـۆن ئەگەرچی مرۆڤێکی ڕازییە بەڵام زۆر پێویستی جیاوازی هەیە کە دەبێ دابینیان بـــکات، کەوابێ دەبێ چەندین کاری سەمەربەخش ئەنجام بدات: دەبێ کەرەسە و ئامێری کار بســـازێت، کەرەسەی نێوماڵ دابین بـــکات، لاما دەســـتەمۆ بکات، ماســـی بگرێت، ڕاو بکات و ... ئەڵبەت لێرەدا باســـی دۆعا و نزا ناکەین، چونکە کاك ڕۆبینسۆنی ئێمە ئەم کارەی خۆش دەوێ و بە جۆرێك حەسانەوەی دەزانێت. بەپێچەوانەی کار و تێکۆشـــانی جیاواز بەمەبەستی بەرهەمهێنان، ئەو دەزانێ کـــە هەموو ئەم کارانە تەنیا چەند شێوازی کاری خۆین و کەوابوو بێجگە لە چەند کاری جیاجیای مرۆڤ شتێکی تر نین.

پێویســـتی ناچاری دەکات کـــە کاتی خۆی بەپێی ئەرکەکانی دابەش بکات. ئەگەر کارێك لە چاو کاری دیکە پێویســـتی بە وزە و ئنرژی زیاتر هەیە، پێوەندی بەو ئاســـتەنگانەوە هەیە کە دەبێ بـــۆ ئەنجامدانی هەموار بکرێن. ڕۆبینســـۆن بەپێی ئەزموون هەموو ئەم شـــتانە فێر دەبێت. ڕۆبینسۆن کە ســـەعات و دەفتەر و قەڵەمەکەی لە غەرقبوون نەجات داوە، بە زووترین کات وەك کەســـێك لە ڕەگەزی بریتانی هەلومەرجی خۆی دەنوسێتەوە و دەست دەکات بە مەزندە و حساب.

لە نێو دەفتەرەکەیدا لیســـتی ئەو شـــتانە کە بەدەســـتی دێنێ و هەروەها ئـــەو کارانەی کە بۆ بەدەست هێنانی بەرهەمەکان پێویستە دەنوسێتەوە، هەروەها ســـەعاتی کاری پێویست بۆ دابینکردنی هەر بەرهەمێك دیاری دەکات. پێوەندی ڕۆبینسۆن لەگەڵ هەموو ئەو شـــتانە کە سەروەت و سامانی وی پێکدێنن هێندە ســـادەیە کە تەنانەت ماکس وێـــرت لێی تێدەگات. بەڵام ســـەرەڕای ئەمەش، هەمـــوو خەســـڵەتێکی زاتی بەهـــاکان، هەر لەم پێوەندییانەدایە.

ئێستا با دوورگەی گەش و ڕووناکی ڕۆبینسۆن بەجێبێڵین و سەرێك لە ئەورووپای چاخی نێوەڕاست

بدەین. لێرەدا بەپێچەوانەی مرۆڤی سەربەخۆ، هەموو کەسێك پێویستی بە ئەویدی هەیە: جوتیار و دەرەبەگ، ئاغای گچکە و فیۆدالی گەورە، خەڵکی ئاسایی و قەشەکان.

پێویستی شەخسی مرۆڤەکان، هەم خەسڵەتی تایبەتی مناسباتی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنانی مادی و هەم تایبەتمەندی دەڤەرەکانی تری ژیان پێکدێنێ. بەڵام بۆوەی کە پێویستی شەخسی بناغەی ئەم کۆمەڵگە تایبەتە پێکدێنێ، پێویست ناکات کە کار و بەرهەمەکانی کار، فۆرمێکی رەمزاوی و جیاواز لە هەقیقەتیان بەخۆوە بگرن. کار و بەرهەمەکانی کار، لە درێژەی دانوستانی کۆمەڵایەتیدا، بەشێوەی خزمەت و بەهرەی سروشتی دەردەکەون. لێرەدا بەپێچەوانەی سیستمی بەرهەمهێنانی کاڵایی، فۆرمی سروشتی و تایبەتی کار، راستەوخۆ بەشێوەی کۆمەڵایەتی دەردەکەوێ، نەك بەشێوەی گشتی. بێگاریش راست وەك کارێك کە کاڵا بەرهەم دێنێ، بەپێی زەمان مەزندە دەکرێ، بەڵام هەر جوتیارێك دەزانێ کە بەشێکی تایبەت لە کاری وی بۆ خزمەت بە ئاغا تەرخان دەکرێ و یەك لە دەی بەرهەم کە بە قەشە دەدرێت ئاشکراتر لە بەرەکەتی دۆعای خێری قەشەیە.

کەوابوو ئەو ماسکانە کە پێوەندی کۆمەڵایەتی خەڵك دادەپۆشن بە هەر جۆرێك راڤە بکرێن، دیسان مناسباتی کۆمەڵایەتی کەسەکان لە کاتی کاردا لەگەڵ یەکتر، وەك پێوەندی شەخسی خۆیان دەردەکەون و وەك پێوەندی کۆمەڵایەتی شتەکان لەگەڵ بەرهەمی کار دەرناکەون.

بۆ تۆژینەوەی نموونەیەك لە کاری گشتی هاوبەش، یانی کارێك کە راستەوخۆ کۆمەڵایەتی بۆتەوە، پێویست ناکات بۆ فۆرمێك لە کار بگەڕێنەوە کە بەشێوەی سروشتی و خۆڕسك پێکدەهات و لە کازیوەی مێژووی هەموو گەلانی خاوەن ژیاردا دەبینرێ. نموونەیەك لەم کارە لە پیشەسازی گوندی و باوکسالاری بنەماڵەی جوتیاریدا دەبینرێ، کە بۆ دابینکردنی پێویستی خۆیان، گەنم، ئاژەڵ، کەتان و پۆشاك بەرهەم دێنن. ئەم شتانە وەك چەندین بەرهەمی جیاوازی کاری هاوبەشی بنەماڵە، لەئاست بنەماڵە دەوەستن، بەڵام لەئاست یەکتر خاوەن خەسڵەتی کاڵایی نین. چەندین کاری جیاوازی وەك کشتوکاڵ، ئاژەڵداری و رستن و چنین و دوورین، کە ئەم شتانە بەرهەم دێنن، لە فۆرمی سروشتی خۆیاندا بەشێوەی رۆڵ و ئەرکی کۆمەڵایەتی دەردەکەون؛ چوونکە ئەم کارانە ئەرکی ئەندامانی بنەماڵە پێکدێنن، کە راست وەك جڤاتی پێکهاتوو لەسەر بەرهەمهێنانی کاڵایی، بەشێوەی خۆڕسك کارەکان دابەش کراوە.

دابەشکردنی کار لە بنەماڵەدا و ماوەی کاری ئەندامانی بنەماڵە، بەپێی رەگەز و تەمەن و هەلومەرجی کار بەهۆی گۆڕانی وەرزەکان دیاری دەکرێن. بەڵام هێزی کاری تاکی کە بە پێوەری کات مەزندە دەکرێت، لێرەدا بەهۆی سروشتی کار، وەك خەسڵەتێکی کۆمەڵایەتی کار دەردەکەوێ، ئاخر هێزی کاری تاکی، بەهۆی سروشت و ناوەرۆکی، تەنیا وەك فاکتۆری هێزی کاری هاوبەشی ماڵبات رۆڵ دەگێڕێت.

وەرن با لە کۆتاییدا بۆوەی شێوازێکی جیاواز بە باسەکەمان ببەخشین گرووپێك لە کەسانی ئازاد وێنا بکەین کە بە ئامێری بەرهەمهێنانی

هاوبـــەش کار دەکەن و وشـــیارانە هێزی کاری خۆیـــان لە قاڵبی یەك هێـــزی کۆمەڵایەتیدا بەکار دێنن. تایبەتمەندییەکانی کاری رۆبینسۆن لێرەشدا دەبینرێـــت، بـــەڵام جیاوازی لەمەدایـــە کە لێرەدا گرووپێك دەبینین نـــەك تاك. هەموو بەرهەمەکانی کاری رۆبینســـۆن تەنیا بەرهەمی کاری شەخسی ئەو بوون و بەخێرایی ســـودیان پێدەبەخشی، بەڵام بەرهەمـــی کاری گرووپی ناوبـــراو، بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییە. بەشێك لەم بەرهەمە سەرلەنوێ وەك ئامێـــری بەرهەمهێنان بەکار دەبرێت و بەشـــێوەی کۆمەڵایەتی دەمێنێتەوە. بـــەڵام ئەندامانی کۆمەڵ بەشـــی دیکەی وەك ئامێری ژیـــان بەکار دێنن و کەوابوو دەبێ بەسەریاندا دابەش بکرێت.

شێوازی دابەشـــکردن، بەپێی جۆری تایبەتی سیستمی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنان و ئاستی گەشەی مێژوویی بەرهەمهێنەران، گۆڕانی بەســـەردا دێت. تەنیا بۆوەی جۆرێك هاوکێشی لەگەڵ بەرهەمهێنانی کاڵایی پێکبێنین، وایدادەنێن کە بەشی هەر تاکێکی بەرهەمهێنـــەر لە ئامێرەکانی ژیـــان، بەپێی زەمانی کارەکەی دیـــاری دەکرێت. کەوابوو زەمانی کار دوو رۆڵـــی هەیە، لە لایەك دابەشـــکردنی کاتی کار بەپێـــی پلانێکی کۆمەڵایەتی تایبەت، لە نێوان ئەرکە جیاوازەکان و نیاز و پێویستییەکاندا جۆرێك هاوکێشی ورد پێکدێنێ و، لەلایەکی ترەوە زەمانی کار وەك پێوەرێك رۆڵ دەگێڕێ کە بەشـــی هەر تاکێکی بەرهەمهێنەر لە کاری هاوبەشـــدا دیاری دەکات. لێـــرەدا پێوەندی کۆمەڵایەتی کەســـانی بەرهەمهێنەر لەگەڵ کارەکانیان و هەروەها لەگەڵ بەرهەمـــی کارەکانیان، چ لە بواری بەرهەمهێنان و چ لە بواری دابەشکردندا روون و ئاشکرایە.

دنیـــای دین رەنگدانـــەوە [رفلێکس]ی دنیای واقعیە. بـــۆ جڤاتێك کـــە بەپێـــی بەرهەمهێنانی کاڵایی پێکهاتووە، مەسیحیەت و مرۆڤی دابڕاوی مەســـیحی و، بەتایبەت فۆرمـــی بورژوایی دینی مەسیح، یانی لقی پرۆتســـتان، دئیزم [خواپەرستی سروشتی] و فۆرمی لەم چەشنە، شیاوترین فۆرمی دیـــن پێکدێنـــن. چونکە لەم جڤاتەدا، مناســـباتی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنان بەگشـــتی بریتییە لەم شتە کە بەرهەمهێنەران بەرهەمی خۆیان بە کاڵا و بەمپێیە بە بەها دەزانـــن و کاری تایبەتی خۆیان لە قاڵبی شـــتێکدا، وەك کاری یەکســـانی ئینسانی لەئاست یەکتر دادەنێن. لە شێوازی بەرهەمهێنانی کۆنی ئاسیا و سەردەمانی کەونارادا، گۆڕینی بەرهەمی کار بۆ کاڵا و بەمپێیە ژیانی مـــرۆڤ وەك بەرهەمهێنەری کاڵا، رۆڵی لاوەکی دەگێـــڕێ. بەڵام هەر چەندە کۆمۆنی هاوبـــەش بەرەو پووکانەوە دەچێ، رۆڵی کاڵایی زیاتـــر دەبێ. ئەو گەلانە کـــە بازرگانی دەکـــەن وەك خودایانی ئێپیکـــور ، یان یەهودیانی پۆلۆنی، تەنیا لە مەودای نێوان دوو دنیادا دەژین.

سیستمی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنان لە سەردەمی کۆندا ئێجگار ســـادەتر و شـــەفافترە لە سیستمی بەرهەمهێنانی بورژوایی. بەڵام سیســـتمی کۆن یان بەپێی کاڵی و پێنەگەیشتوویی تاکی مرۆڤ پێکدێ کە هێشتا بەندی ناوکی لەگەڵ سروشت و هۆزی خۆی نەپچڕاوە، یان بەپێی پێوەندی راســـتەوخۆی ئاغا و کۆیلە پێکدێت.

دۆخی ژیان لەنێو سیســـتمی سەردەمی کۆندا بەپێی ئاســـتی نـــزم و نەوی گەشـــەی هێزەکانی بەرهەمهێنـــان و ئاســـتەنگەکانی و، پێوەنـــدی بەرتەسکی نێوان مرۆڤەکان لە جەرگەی پرۆسەی

بەرهەمهێنان و بەرهەمهێنانەوەی ژیانی مادی خۆیان و، بەمپێیە پێوەندی بەرتەسك و جەبری نێوان مرۆڤ و سروشت دیاری دەکرێت. ئەم ئاستەنگ و کۆیلەتییە راستەقینە بەشێوەی ئایدیۆلۆژی لە دین و ئایینی کۆندا کە بەپێی پەرستشی سروشت و هۆز پێکهاتووە، دەردەکەوێ. بەگشتی نواندنەوە (رفلێکس)ی دینی دنیای واقعی تەنیا کاتێ لەنێو دەچێ، کە پێوەندی پراتیکی ژیانی رۆژانەی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ و، مرۆڤ لەگەڵ سروشت، لە فۆرمێکی شەفاف و ئەقڵانیدا راڤە بکرێت.

تەنیا کاتێ ماسکی رەمزاوی لەسەر روخساری پرۆسەی کۆمەڵایەتی ژیان لادەچێت، کە خۆی وەك بەرهەمی کاری خەڵکانێك دەرکەوێت کە ئازادانە جڤاتێکیان پێکهێناوە و بەشێوەی وشیارانە و بەپێی بەرنامە بەڕێوەی دەبەن. بەڵام گەیشتن بەم ئاستە پێویستی بەوەیە کە کۆمەڵ بناغەی مادی، یان کۆمەڵێك هەلومەرجی مادی ژیان، دەستەبەر بکات کە ئەویش بەرهەمی سروشتی و خۆڕسکی جۆرێك ئاڵوگۆڕیی مێژوویی درێژ و پڕ لە رەنج و ئازارە.

هەرچەند کە ئابووری سیاسی بەها و رادەی بەهای بەشێوەی ناتەواو راڤە کردووە و ناوەرۆکی شاراوەی ئەم فۆرمانەی دەرخستووە، بەڵام قەت لە خۆی نەپرسیوە کە بۆچی ئەم ناوەرۆکە بەم فۆرمە تایبەتە دەردەکەوێ، یانی بۆچی کار لە قاڵبی بەهادا پیشان دەدرێت، بۆچی بەها و رادەی کار بەپێی کاتێك کە بۆ ئەنجامدانی تەرخان کراوە مەزندە دەکرێت.

لەم فۆرمانە کە مۆرکی فۆرماسیۆنێکی کۆمەڵایەتی تایبەتیان لێ دراوە، لەجیاتی ئەوە کە مرۆڤ پرۆسەی بەرهەمهێنان کونترۆڵ بکات، پێچەوانەی ئەم راستییە روودەدات. کەوابوو ئابووری سیاسی بورژوایی، لەگەڵ شێوازەکانی رێکخستنی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی پێش بورژوازی، هەمان رەفتار دەکات کە دەسەڵاتی کڵێسا لەگەڵ دینەکانی پێش ئایینی مەسیح دەیکرد.

باس و پۆلێنێکی ناخۆش و دوور و درێژی ئابووریزانان لەمەڕ رۆڵی سروشت لە پێکهێنانی بەهای گۆڕینەوە (exchange)لە کەنار فاکتۆرەکانی تردا، پیشان دەدات کە ئەم کەسانە تا چ ئاستێك بەهۆی فتیشیزمی دنیای کاڵاکان یان بەهۆی رواڵەتی عەینی خەسڵەتی کۆمەڵایەتی کار، تووشی هەڵە هاتوون. بۆوەی کە بەهای گۆڕینەوە فۆرمێکی کۆمەڵایەتی تایبەتە بۆ نواندن و دەربڕینی کارێك کە بۆ شتێك تەرخان کراوە، ناتوانێ ماتریاڵێکی سروشتی تر لە بۆ وێنە رێژەی ئاڵوگۆڕی هەبێت.

بۆوەی کە فۆرمی کاڵا گشتیترین و گەشەنەکردووترین فۆرمی بەرهەمهێنانی بورژوایی پێکدێنێ، ئێجگار خێرا وەدەرکەوت، بەڵام نەك بەشێوەی زاڵ و بەرهەست کە ئەمڕۆ دەیبینین. کەوابوو، هێشتا بەئاسانی دەکرێت خەسڵەتی فتیشستی ئاشکرا بکەین. بەڵام کاتێ بە هەندێ فۆرمی کۆنکریتتر دەگەین، تەنانەت ئەم رواڵەتە سادە لەنێو دەچێت. خەون و خەیاڵ لەمەڕ سیستمی پووڵی لە چی سەرچاوە دەگرێ؟ لایەنگرانی سیستمی پووڵی، زێڕ و زیو لە شکڵی پووڵدا بە هەندێ شتی سروشتی دەزانن کە پێوەندی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنان راڤە ناکەن، بەڵکوو خاوەن خەسڵەتێکی کۆمەڵایەتی سەیرن. بەڵام ئایا ئابووری مۆدێرن کە سوکایەتی بە سیستمی

پوولی دەکات هەر کە باســـی ســـەرمایە دەکا بە ئاشـــکرا تووشی فتیشیزم نابێت؟ مەگەر ئەم بیرەی فیزیۆکراتـــەکان کە پێیان وابـــوو بەهرەی زەمین راستەوخۆ لە زەمین دەڕوێت، نەك لە کۆمەڵگە، لە کەیەوە لەنێو چووە؟

لێرەدا، بۆ روونکردنەوەی باسەکەمان نموونەیەك لە خودی فۆرمـــی کاڵا دێنینەوە. ئەگەر کاڵاکان توانـــای پەیڤینیان بووبا، دەیانـــوت: رەنگە بەهای بەکارهێنانـــی ئێمە بۆ مـــرۆڤ گرنگ بێت، بەڵام بۆ خۆمان گرنگ نییە چونکە ئێمە شـــتین. ئەڵبەت ئێمە بەهۆی شـــتبوونمان خاوەن بەهاین. کڕین و فرۆشـــتنی ئێمە وەك کاڵا ئەم راستییە دەسەلمێنێ. ئێمە تەنیا بەشێوەی بەهای گۆڕینەوە لەگەڵ یەکتر پێوەندی دەگرین.

ئێستا با بزانین کاڵاکان بە چ شێوازێك لە زمان ئابووریزانانەوە دەدوێن:

"بەهـــا [بەهـــای گۆڕینـــەوە/ exchange] value خەسڵەتێکی شتەکانە، بەڵام سروەت [بەهای بەکارهێنان/value use] خەســـڵەتێکی ئینســـانییە. بەمپێیە، بەهـــا تەنیا بەهۆی گۆڕینـــەوە پێکدێت، بەڵام ســـروەت نا"، "سروەت [بەهای بەکارهێنان] خەســـڵەتێکی ئینســـانییە، بەڵام بەها خەســـڵەتی کاڵاکانە. کەسێك یان جڤاتێك دەوڵەمەندن، بەڵام ئەڵماس یان مرواری پڕ بایەخن".

تا ئێستا هیچ کیمیازانێك لە ئەڵماس و مرواریدا بەهای گۆڕینەوەی نەدیوەتەوە. بەڵام ئابووریزانان کە وەها ماتریاڵێکی کیمیایان دیوەتەوە و خۆیان بە زیـــرەك و وشـــیار دەزانـــن، بەپێچەوانەوە بەم ئاکامە گەیشتوون کە شتەکان سەرەڕای خەسڵەتی مادی خۆیان، خاوەن بەهای مەســـرەفن و بەهایان لە شتبوونیانەوە ســـەرچاوە دەگرێت. ئەوەی وایان لێدەکات تا لەســـەر بۆچوونی خۆیـــان پێدابگرن دۆخێکی ســـەیر و ســـەمەرەیە کە لەودا، بەهای مەسرەفی شـــتەکان، لای مرۆڤ، بەبێ گۆڕینەوە بەدی دێت، یانی لە پێوەندی راســـتەوخۆی نێوان مرۆڤ و شتدا بەدیدێت، بەڵام ئەمە لە کاتێکدایە کە بەهای ئەو شـــتە تەنیا لە گۆڕینەوەدا، یانی لە پرۆســـەیەکی کۆمەڵایەتیدا دەردەکەوێت. هەموان لێرەدا پەندی داگبێری پیاو چاکیان بیردێتەوە کە بە سیکۆڵی پاسەوانی شەوی وت:

"جوانی و روخســـاری شەنگی مرۆڤ، کاری بەختە؛ بەڵام خوێندن و نوسین لە سروشتی مرۆڤ سەرچاوە دەگرێ."

**سەرچاوەکان:**


١. سرمایە جلد يك، کارل مارکس، ت: ایرج اسکندری، تهران ١٣٨٣، صص ١٤٤- ١٦٠.

٢. بوت وارگی کالا، ت: امید مهرگان ســـالح نجفی، سایت رخداد:

http//:www.rokhdaad.com

3. Karl Marx ,Capital Volume One ,Chapter One: Commodities ,Section _ 4 The Fetishism of Commodities and the Secret thereof ;http//:www.marxists.org/archive

# ئەم فایلە بۆ؟

سەرنوسەر

لە مانگی فێبەروەری ئەمساڵدا، شەپۆلی ڕاپەڕینێکی جەماوەریی گەورە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی هەژاند. ئەگەر چـــی ڕاپەڕینەکە کتوپڕ و بێ بەرنامەبوو. بەڵام لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا زۆربەی جەماوەری ئەو وڵاتە عەرەبیانە، بە هەموو چین و توێژ و بیروباوەڕی جیاوازەوە ڕژانە سەر شـــەقام و گۆڕەپانەکانی شار و هاواریی (ڕۆخانی ڕژێم) یان لێ بەرز بوەوە. حوکمڕانەکانی ئەو وڵاتانە، بە توانای قەبـــە و زەبەلاحی دەزگای ئەمن و پۆلیس و هەواڵگری و پاســـەوانی تایبەتیانەوە تەماشاکەرێکی وڕ و شپرزە و بـــێ وره بوون. نە ئەو بنکـــە فراوانەی خەڵکیان لەگەڵ بوو بەرگریان لێبـــکات. نە خاوەنی ئیرادەیەکی ویژدانی وابوون بێ باکانە و ڕاشکاوانە پردێکی تێگەیشتن لە نێوان خۆیان و خەڵکیدا دروست بکەن و دەسکەوتە گەورە و بەهادارەکانیان (ئەگەر هەیان بووبێت!) بە ڕوویاندا بدەنەوە.

ســـەرەتای ڕاپەڕینەکە لە تونسەوە دەستی پێکرد و بە میســـر و لیبیا و ئوردون و سوریا و یەمەندا تێپەڕی و تا ئێستایش بڵێســـەکەی نەکوژاوەتەوە. ڕاستە ڕاپەڕینەکە


ڕەووف بێگەرد

کتووپڕ بوو، بەڵام بەرئەنجامی کەڵەکە بوونی کۆمەڵێك فاکتەری ناوەکیی بوون کە لەسەروویانەوە: دەستەڵاتی ڕەها و ستەم کارانەی حوکمڕانەکان، بەرتەسك کردنەوەی مەوداکانی دیموکراسیەت و ئازادی سیاسی، پەرەسەندنی گەندەڵیەکی سەرانسەری بێسنوور و بێلێپرسینەوە، کە بنەماکانی لەسەر بەرژەوەندیی تایبەتی و پەیوەندیە نادروستەکانی دەوڵەتەوە دەست پێدەکات لەگەڵ لایەنە گومان لێکراوەکانی ناوەوە و دەرەوە، دوور لەهەر پرنسیپێکی نیشتیمانی و نەتەوەیی کە بەرەنجامەکەی مۆنۆپۆلکردنی دەسەڵات و بە تالان بردنی سامانی ولات و خەڵکە هەژارەکەیەتی. بۆیە دەبینین زۆربەی زۆری ئەو ولاتە عەرەبیانەی ڕاپەڕینیان تیا کرا خاوەن گەورەترین سامانی مرۆیی و کانزایین، تەنانەت هەندێکیان لە ولاتە هەرە دەوڵەمەندەکانی دنیان(بۆ نموونە لیبیا) کەچی بە درێژایی حوکمڕانیی زۆربەی لەو سەرکردانە کە دەیان ساڵی گوزەراندوە نەیان توانیوە نە گەشەیەکی دیار بە لایەنی ئابوری و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی ولاتەکەیان بدەن، نە دادوەریەکی کۆمەڵایەتی دروست و یەکسان سەقام گیر بکەن. زۆربەی دانیشتوانی ئەو ولاتە عەرەبیانە یان بێ کارن و لە گەڕەکە هەژار نشینەکاندا ژیان بەسەر دەبەن، یان نەخوێندەوارن و بە مەمرە و مەژی ژیانی ڕۆژانەیان بەڕێ دەکەن. بێجگە لەو ملیۆنان گەنجەی لە تەمەنیان لە نێوان ١٥-٢٩ ساڵیدایە و سێ یەکی دانیشتوان پێك دێنن و لە هەموو کەلکێکی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی بێ بەشن. ڕێژەی ئەو لاوانەی خوێندنی زانکۆیان لە هەموو ولاتانی عەرەبیدا تەواو کردوە و بێکارن دەگاتە ٩٥٪ ئەمە کاریگەریەکی نەگەتیڤی لەسەر ئەم توێژە گرنگە داناوە (بە نێر و مێوە) بۆیە دەبینین زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی داوای گۆڕان و ڕووخانی سیستەمەکان دەکەن توێژی گەنجانن.

ڕژێمە عەرەبیەکان لەبەردەم قەیرانەکەدا بێ

ئیرادەن و هیچ توانایەکی چاکســـازیان نیە، چونکە وەك وتمان نە بنکەیەکی فراوانی جەماوەریان هەیە، نە بەرنامەیەکی پێشینەی چاکسازی و نەبڕاوی خەڵکیان بەدەســـت هێناوە. بۆیە ناچـــار کەوتنە بەکارهێنانی توندوتیژی: گرتن، ئابڵووقەدان، تۆقاندن، کوشـــتن، نان بڕین. بۆ پاســـاودانی کردارە ناڕەواکانیان پەنایان بۆ هەمان ئەو تۆمەتە کۆنانە برد کە دیکتاتۆرەکانی دنیا لە کاتی ڕوودانی هەر ڕاپەڕین و شۆڕشـــێکی جەماوەریی وڵاتەکانیاندا پەنای بۆ دەبەن و دەیکەنە پاساوی سەرکوت کردن و پەلامارەکانیان. ئەوەیش تۆمەتبارکردنی خەڵك و جەمـــاوەری ڕاپەڕیو بوو بـــە ناپاك و نۆکەری بێگانە و داروودەســـتی دوژمن و تێکدانی ئاشـــتی و ئارامیـــی وڵات. هەندێك لەو دەســـەڵاتدارانە کۆیان لەوە نەکردەوە کە خەڵك بە گەوج و نەفام و تەنانەت بە مشـــك و جرج ناوزەند بکەن. ئەمە لە کاتێکدایە کە بە درێژایی ئەم هەشت مانگەی ڕاپەڕین و شـــۆڕش، هیچ لایەن و چین و توێژێکی بەشدار بوانی ڕاپەڕین، پەنایان بۆ توندوتیژی نەبردوە، دەستی یارمەتیان بۆ دوژمن درێژ نەکردوە. بەردەوام زمانی گفتوگۆیان لا پەســـەندتربوە، بەڵام داوای ســـەرەکییان ڕووخانی سیستم و بەرقەراریی دیموکراتیـــەت و خۆش گوزەرانیـــی خەڵکیی و بەشداریی کردنی گەنجان بوە لە جومگە زیندوەکانی ژیانی وڵاتەکەیاندا. هەروەها هەموو لەسەر ئەوە کۆك بوون کە ڕەمزە دەستکردەکان و بە پیرۆزکراوەکان نەمێنن، ئەوانەی دەســـەڵات لە کەسایەتی سەرۆك و میر و شا و سەرۆك خێڵەکاندا بەرجەستەیان کردبوو، کە بۆ ئەم ســـەردەمە نامۆترین دیاردەی بە پەیڕەوی لێکردنـــن. نابێت ئەوە لە یاد بکەین کە ڕاپەڕینەکە، چ لەسەر ئاســـتی کات و چ وەك داواکاریەکان و جەماوەری ناڕازیی لە یەکدی دەچن. بە تایبەتی لەو جومگەیەدا کە گەلانی عـــەرەب لەهەر کوێ بن، هەمان ئازار و خەونی یەکتریان هەیە و تێکڕا بەدەم دەسەڵاتە ستەمکارەکانی خۆیانەوە گیریان خواردوە و دەناڵێنـــن. هەر ئەو حوکمڕانانەن بوونەتە لەمپەڕی پێك نەگەیشتنی خەونی نەتەوە و تا ئێستایش لە گەلە دواکەوتوەکانی ئەم سەرزەمینەن.

پشـــکی ئەو ڕاپەڕیـــن و ناڕەزایەتیە بەر ئێمەی کوردیش کەوت، بێگومان داواکاری ئێمە لە هەمان چوارچێوەدا بوو کە پێش هەر شـــتێك لە نەهێشتنی بێـــکاری و بایەخدان بە گەنج و قـــۆرغ نەکردنی دەســـەڵات و چەسپاندنی دادی کۆمەڵایەتیدا خۆی دەبینێتەوە. بۆیە بە پێویستمان زانی فایلی ئەم ژمارەیەی گۆڤاری ســـەردەم بۆ ئەو مەبەستە تەرخان بکەین. فایلەکە بەشـــێکە لەو ڕاو بۆچـــوون و لێکۆڵینەوە و بەدواچوونانـــەی کۆمەڵێك ڕوناکبیـــر و بیرمەندی عەرەب لە ســـەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکـــەوە بەردەوام لە پەیجـــووری فاکتـــەر و بەرئەنجامەکانیدا بوون. دەشێت هەندێك لێکدانەوەی جیاواز بۆ دیاردەکان لە نووســـینەکاندا هەبن، یان لە پـــاڵ لێکۆڵینەوەی زانستیانەدا نووسەرێك بە گیانێکی حەماسەت ئامێزەوە لەباتی شرۆڤەکردن و لێکدانەوەی بابەتیانە کەوتبێتە ناو پەخشانێکی سۆزدارانەوە. بەڵام بەگشتی هەموو لەســـەر ئەوە ڕێکن کـــە ڕاپەڕینەکە بەرئەنجامێکی حەتمی ئەو سیاسەتە دژەمرۆڤایەتیەیە کە لەو وڵاتانەدا پیادە دەکرێن و پێویســـتیان بە گۆڕانێکی بنەڕەتی هەیە. هەروەها شکستی بە کۆمەڵێك نەریت و بەهای ســـونەتی هێنا کە لە بەڕەمز کردن و پاکیزەخوانی خەڵکانی دەســـەڵاتداردا خۆی دەبینێتەوە و تا ئێستا کۆمەڵگاکانی تری عەرەبیشی گیرۆدە کردوە.

# دە ئەگەر
# لەسەر یاخیبوونە
# عەرەبییەکانی ئێستا

نووسینی: ئەدۆنیس
و. لە عەرەبییەوە: هیوا قادر

یەك/ ئەمڕۆ عەرەب چـی ئەدۆڕێنێت، گەر هەموو ڕژێمە کانیان نەمێنن؟

وەڵامی ئەم پرسـیارە بەها و ئاسـتی ئـەم ڕژێمانە دەستنیشـان ئـەکات، بەلایەنـی زۆرەوە وەڵامی هەرە زۆرینەی عەرەب ئەوەیە کە ئەڵێن: هیچ شتێك نادۆڕێنین.

بەڵام ئەم وەڵامە هەر خۆی وا لەکاری گۆڕانی ئەم ڕژێمانە ئەکات لە ئاستی ڕۆشنبیریی و ئینسانیدا بکەونە بەردەم بەرپرسـیارێتییەکی مێژوویی گەورەوە. ناکرێت ئەم گۆڕانە تەنها بچوکبکرێتەوە و تایبەتبکرێت بە لایەنی سیاسی و دەسـەڵاتدارێتیەوە. بەڵکە ئەبێت گشتگیریی و ڕەگاژۆییانەبێـت، بەجۆرێك بنەمای ڕۆشـنبیریی و کۆمەڵایەتی ئەو ڕژێمانە بگۆڕێت کە لەسەری بنیاتنراون. ڕژێمی سیاسـی بەشێکە لە گشت، تەنها بە گۆڕانی ئەو ڕژێمە وەك دەسەڵات، ئەبێتە کارێکی ڕوکەشیانە، ئەمەش درەنگ یان زوو ئەمانگەڕێنێتەوە سەر هەمان کێشەکانەی پێشوو.

ڕاسـتییەکەی ئەوەیە بەدرێژایی مێـژووی عەرەب

**ڕاستییەکەی ئەوەیە بەدرێژایی مێژووی عەرەب کێشەی دەسەڵات کێشەی یەکەمیان بووە. ململانێکردنیان لە پێناوی دەسەڵاتدا هۆکاری یەکەمی فیتنە و شەڕەناوخۆییەکان بووە. تەنانەت هۆکاری سەرەکی جیابوونەوەکان و هاتنەکایەی مەزهەبە جۆراوجۆرەکانیش بووە**

کێشەی دەسەڵات کێشەی یەکەمیان بووە. ململانێکردنیان لە پێناوی دەسەڵاتدا هۆکاری یەکەمی فیتنە و شەڕەناوخۆییەکان بووە. تەنانەت هۆکاری سەرەکی جیابوونەوەکان و هاتنەکایەی مەزهەبە جۆراوجۆرەکانیش بووە. دەسەڵات لەلایەن خەڵکەوە دانەنراوە تا گوزارشتێك بێت لە ئیرادەی گەل، بەڵکە لەسەرەوە سەپێنراوە، ئەمەش بۆتەهۆی ئەوەی کە توندوتیژیی و کوشتن و برین بەشێوەیەکی نیمچە ئۆرگانی جۆری ئەو ڕەگەزانەبن کە لەگەڵی هاتوون.

ئەمە ئەوە ناشارێتەوە کە عەرەب خەلیفە و دەسەڵاتدارانی هەبوون و دەسکەوتی ڕۆشنبیریی و شارستانی گرنگیان بەدەستهێناوە. بەڵام لەهەمان کاتدا هۆکارە سەرەکیەکانی ئەو ململانێیەش ناشاردرێتەوە کە لە مێژووی عەرەبیدا هەبوون.

نموونەکان زۆرن. هەر لەسەرەتای جەنگە ناوخۆییەکانی ئیسلامەوە، لە دەستپێکی سەدەی دامەزراندنەوە، بۆ سەردەمی خەلیفە ڕاشدییەکان، تا ئەگات بە تێپەڕین بە هەردوو سەردەمی ئەمەویی و عەباسی. بێ ئەوەی هێماکردن بۆ نمونەی بەرچاوی ئەندەلوس فەرامۆش بکەین کە لەم لایەنەوە چی پێشکەش کردووین.

لە دەمەدەمی ڕوخانی خەلافەتی عوسمانییەوە، حوکمی عەرەبی لەژێر چەندان شێواز و ناودا لەسەر شێوەی خەلافەت بنیاتنرا: «پاشایەتی»، «دیموکراسی»، «کۆماری»، «لیبرالی». هەروەها نمونەی ڕێکەوتنەکان لەناو ئیسلام خۆیدا بۆ لەدەستنەدانی دەسەڵات، تا ئەگات بە ڕێکەوتنەکان لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا. ئەم نمونانە زۆرن و خەڵکانی شارەزا ئەیانزانن.

هەر لەم ڕووەوە بینومانە و ئەبینین شەیدابوون بۆ دەسەڵات، بەتایبەت لەلایەن هێزە بیانییەکان «زلهێزەکان»ـەوە، کە چۆن پشتیوانی لە دەسەڵاتی ئەم یان ئەو دەسەڵاتداری عەرەبی لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا کردووە، سەرباری قەناعەتیان بە گەندەڵی فەرمانڕەواییان، کاتێکیش

ئەبینـــن ئەو دەســـەڵاتانە لەرزەیان تـــێ ئەکەوێت، بەزوویی پشتیان تێ ئەکەن، تەنانەت ڕەنگە هەندێك جار لە ڕووی عەسکەریشەوە بەشداری ڕوخاندنیان بکەن. چونکە گرنگ لای ئەوان بەشـــداربونیانە لە یاری دەسەڵاتدا بۆ مەبەســـتێکی تایبەت، ئەویش: هێشتنەوەی هەژمونی خۆیانە بەسەر ئەو ڕژێمانەوە.

فەلەستین نمونەیەکی کارەســـاتئامێزی عەرەبە لەبەردەم شەیدابوونی بۆ دەسەڵات. حیزبە فەلەستینیەکان کە سەرچاوەیەکی «شۆڕشـــگێڕ»یان هەبووە، لەیەك خاڵدا یەکیـــان گرتۆتەوە ئەویش وەســـتانبووە دژ بەو تەنها خەتەرە چارەنووســـازە، یەکەم شتێکیش ڕوو بـــەڕووی بوونەتەوە و خەباتیـــان بۆ کردووە شەیدابونیان بووە بۆ دەســـەڵات. کێشەی هەوڵدان بۆ دەســـەڵات بە شـــێوەیەکی جەرگبڕانە کەوتۆتە ناو حیزب خۆشیەوە، هەر لەســـەرەتای ناوەڕاستی ســـەدەی ڕابردووەوە، کێشەکانی ململانێ لە پێناوی دەســـەڵاتدا، بەو دەرەنجام و نیشانانەوەی کە هەیبوو هیچی کەمتر نەبووە لە خەتەری کێشەکانی ململانێ لەگەڵ دەرەوەی داگیرکەردا: «یەمەنی دیموکراسی، عێراق، ســـوریا، نمونە بێ چەندوچوونەکانن».

دوو/ وەك پێشـــتر ئاماژەم پێدا، هەر کام لەو ڕژێمانەی لە وڵاتە عەرەبییەکاندا هەن، لە ئاســـتی پەیڕەوکردنی دەســـەڵات و ئاڵوگۆڕکردنیدا لەسەر ڕێ و ڕەسمی خەلافەت دامەزراون. ئەمەش تەنها حوکمڕان و ئەو پیاوانە ناگرێتەوە کە حوکمڕانی ئەکەن، بەڵکە بەر لە هەر شتێك ڕۆشنبیرییە: ڕۆشنبیریی بەو مانا گشتییەی لەناو سروشتدا هەیە: ئەوەش دین و فکر و ئەدەب و هونەر و بەها و ئەخلاق و کار و تێڕوانین ئەگرێتەوە. کۆکردنەوەی ئەمانە و بەرهەڵستکاریکردنیان لەڕێی سیاســـەتەوە، تەنها بە ڕوخاندنیان وەك فەرمانڕەوا و دەسەڵاتێك نابێت، چونکە ئەمە بچوککردنەوەی ئەو بەرهەڵســـتکارییە خۆیەتی و ئەشبێتە تەنها کارێکی سیاسی: گۆڕینی ڕژێمێکی بەزەبر و زەنگی گەندەڵ بە ڕژێمێکی تر، ئومێدی ئەوەی لێ ئەکرێت کەمتر بەزەبروزەنـــگ و گەندەڵ بێت. بۆیە ئەڵێم «ئومێدی ئەوەی لێ ئەکرێت» چونکە مەحاڵە دیموکراســـی بێت، ئەگـــەر هاتوو بەتەواوەتی ســـەرلەبەری بنەما ڕۆشـــنبیریی و کۆمەڵایەتییەکـــەی نەگۆڕێت. بۆیە پێویستە لەســـەر ئۆپۆزیسیۆن، سیاسیی و ڕۆشنبیریی بێت، بۆئەوەی کار بۆ گۆڕانی ئەو کایانە بکات کە ڕژێمی پێشوویی لەســـەر بنیاتنراوە کە ئەو دژایەتی ئەکات، ئەوانەش: دینیی، مەزهەبگەری، قەبیلەگەریی، تایەفەگەرییە، بەبێ ئەم گۆڕانەش، ئۆپۆزیسیۆن ئەبێت بە دەسەڵاتێکی تری وەك ئەو دەسەڵاتە زۆرانەی تر کە خۆی دژایەتیان ئەکات.

سێ/ ئەمڕۆ، بەهۆی ئەو یاخیبوونانەی کە کوڕان و کچانی عەرەب ئەیکـــەن، لەهەموو ئەو کاتانەی ڕابردوو زیاتر هەلی ئەم جۆرە گۆڕانە هاتۆتەکایەوە. ئـــەوە گۆڕانە هەلـــی کارکردن بۆ دروســـتکردنی کۆمەڵگەیەکی نوێی عەرەبی ئەهێنێتە ئاراوە، هەروەها ژیانێکی نوێ بۆ ئینســـانی عەرەبـــی و ڕزگاربوونی یەکجارەکی لەدەسەتی ڕۆشنبیریی دەسەڵاتی پێشوو دروست ئەکات.

ڕابردوو، بەهەموو شـــێوازە دینی و سیاســـی و کۆمەڵایەتییەکەیـــەوە، مەرجەعێك نییە. بەڵکە خاڵی ڕووناك کردنەوەیە. ســـەیرکردنی ڕابردوو بەچاوی مەرجەعەوە واتا بەردەوامی لەسەر پەیوەندیکردن بە مەزهەبەکان و قەبیلەکان و هەموو ئەو شـــتانەی کە ئەمانگێڕنە دواوە.

وەك هێمـــام بۆ کرد، لە ڕابردوودا، دەســـەڵات

لەســـەرەوە ئەســـەپێنرا: یان بە هۆی میراتییەوە، یان لە ڕێی خیلافـــەت و پادشـــاییەوە، یاخود بەهۆی پەلاماردانی تاقمێك بەسەر تاقمێکی تردا. لە سەردەمی نوێدا «کۆدێتای عەسکەری» نمونەی دڕندەترینی ئەو پەلامارانەیە، هەروەها کوشندەترین و جاهیلترینیشیانە.

ئەمڕۆ، ڕاپەڕینە عەرەبییـــەکان بیرمان ئەهێننەوە کە ئەکرێت دەســـەڵات لە خوارەوە دابمەزرێت: لە شەقام و خەڵکی و ژیانەوە. ئەمەش تەواو تازەیە لەناو دنیای عەرەبیدا. بۆیە پێویســـتە پێشوازی لەم گۆڕانە بکەین، پارێزگاری بکەین، یارمەتیبدەین، کایەکانی قوڵتربکەینەوە و بچینە پاڵی. ئەمە تەنها «چاندن»ێکە، گەرچی «دورینەوە» پێویســـتە بۆ ئـــەوەی بەبەرتر و داهێنەرانەتربێـــت، تا ببێتـــە خەباتێکی دوولایەنە و پێکەوەیی: دژ بەو شـــێوازە لە دەســـەڵاتداریتی عەرەبـــی کە پەیڕەویکـــردووە، شـــێوازی دینی ـ ســـەدەکانی ناوەڕاســـت، بەهەمـــوو هەمەڕەنگی و بەیەکداچوونێکییەوە.

دژ بەو ڕۆشنبیریەش کە بنیاتنراوە بۆ ئەم جۆرە لە دەسەڵات و بنجداکوتینی.

بەتایبەت لەم چوارچێوەیەدا وتومە و ئەیڵێمەوە: قبوڵی ڕۆیشتن لە خۆپیشاندانێکی سیاسیدا ناکەم کە لە مزگەوتەوە بە دروشمی سیاسییەوە هاتبێتە دەرەوە. مزگەوت ڕەمزێکـــی دینییە. هاتنـــەدەرەوە بەناوی سیاسەت و ئامانجی سیاسییەوە لێی، ئەم ڕەمزە ئەکات بە تەنها کەرەستەیەکی سیاســـی. لێرەدا جەوهەری فیکری سیاسی مەدەنی و کاری ئۆپۆزیسیۆنی مەدەنی ئەشـــێوێنێت و سیمایەك بە سەرکردایەتیکردنی دین و دینداریی ئەبەخشێت. ئۆپۆزیسیۆنێك هی من نییە ئەگەر هاتوو مەدەنـــی نەبێت و لە دەرەوەی هەموو ئاسۆیەکی دینییەوە نەبێت.

چوار/ مەســـەلەکە لێـــرەدا بانگەشـــەکردن بۆ دژایەتیکردنی خودی دین نییە، یاخود دژی دینداریی. بەڵکە خستنەڕووی ئەو ڕەفزکردنەیە بۆ بەکارهێنانی دین لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە.

مافی ئینسان بۆ ئیمان و دینداریکردن هیچ قسەی تیانییـــە. مافێکە من ئیحتیرامی ئەگرم و بەرگری لێ ئەکەم. بەڵام کۆمەڵگە بەشێوەیەکی گشتی لە ڕێگەی بەهاوڵاتیبوونی دینییەوە بنیاتنانرێت، بەڵکە لە ڕێگەی هاوڵاتیبوونی مەدەنییەوە بنیات ئەنرێت.

تەنها بەمە گەرەنتی حەقی ئینســـان لەدەرەوەی هەموو بیروباوەڕ و لایەنگیریی و ڕەگەز و بنەچە و پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتییەوە ئەدرێت.

هەموو بەکارهێنانێکی دین بە شێوەیەکی سیاسیانە، بۆخۆی شێوەیەکە لە شـــێوەکانی توندوتیژی: نەك تەنها هەر دژ بە «جەســـتە»، بەڵکە دژ بە «ڕۆح»یش. بەم شـــێوەیەش ئەمە ئەبێتە توندوتیژترین شێوەکانی سوکایەتیکردن بە ئینسان. چونکە بەر قوڵایی بونی ئینسانیەتی ئەکەوێت: بەر ویژدان و ئازادی و فکری ئەکەوێت تەنانەت بەر خەیاڵیشی.

پێنج/ پێویســـتە بەپشبەســـتن بەوەی کە هەیە، ئۆپۆزیسیۆن مومارەسەی گوتارێك بکات لەسەروی مانای «کەمایەتـــی» و «زۆرایەتی»ـەوە بێت. تەنها بە مانای سیاسی و دیموکراسی لەرێگەی هەڵبژاردنێکی ئازادی یاسادانانەوە بێت. لە دەرەوەی ئەمەوە، ناکرێت بە کارێکی دیموکراسی و حورمەتی مافی ئینسان و ئازادییەکانی لە کۆمەڵگەیەکی مەدەنیدا هەستێت. لە هەر کۆمەڵگەیەکدا سیاسەت تێکەڵ بە دین بکرێت پێچەوانەی تەواوی دیموکراسیەتە.

دیـــن دنیایەکـــی تایبەتە بە تاك خـــۆی، بەڵام مافەکانی کۆمەڵگە و ئینسان بە گشتی مافێکی مەدەنی

و کۆمەڵایەتییە. شەرعی دینی تەنها تایبەتە بە کەسی دینداره‌وه نەك کۆمەڵگە. کەواتە وەســـتان دژ بەهەر شێوەیەکی دەستێکەڵکردنی دین لەلایەك و دەوڵەت و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگا و سیاسەتکردنی و هونەر و ڕۆشنبیریی لەلایەکی ترەوە شتێکی ئاشکرایە. هیچ ئۆپۆزیسیۆنێکی عەرەبی مانای نییە بەتایبەت لە وڵاتە فرە دینەکاندا ئەگەرهاتو وەستان بنەمای یەکەم نەبێت لەبەرامبەر فکر و کارکردنەکانیدا.

پێوەری سەیرکردن بۆ ئینسان لە ڕووی دینییەوە پێوەرێکە لەسەر ئیمان و کوفر پێکهاتووە، نەك تەنها زوڵم و زۆرداری. ئەمەش بۆخۆی نائینســـانیە و دژ بە ئینسانییەتی ئینســـانە. چونکە ئامانجی ئەو پێوەرە ئینکاری ئازادی و حەقی ئەوەی بەرامبەر ئەکات کە جیاوازە.

گەر کۆمەڵگەیـــەك لە کۆمەڵێـــك دینی زۆر پێکهاتبێت بەپێی واقیعی مەدەنی و مانای قوڵی ئینسانی کۆمەڵگە نییە، بەڵکە لە جەوهەردا کۆمەڵێك ئینسانی لەیەکجیان. هەموو شـــەرعێکی دینیش بەسروشتی خۆی پێداگرتنە لەسەر ئەو لەیەك جیاکردنەوەیە.

شەش/ لەم ئاستەدا و لەهەمان ڕووەوە گۆڕان لە کۆمەڵگەدا هیچ مانا و بەهایەکی نییە، ئەگەر بێت و لە ڕووی جەوهەرییەوە نزیك نەبێتەوە لە ڕزگارکردنی ژنان لە هەموو کۆتە سەپێنراوەکان بەسەریاندا. ئەبێت مانای کۆمەڵگە چی بێت، ئەگەرهاتو ژن لە هەموو ڕووەکان و ئاستەکاندا وەك پیاو ئازادنەبێت.

ئەمـــە ئەبێت هەر لەســـەرەتاوە فکـــر و کاری ئۆپۆزیســـیۆن بێت، ســـەرکەوتن بەســـەر ئیفلیجی کۆمەڵگـــەی عەرەبی و بـــێ توانایـــدا لەڕێگەی ڕزگارکردنـــی ژنانەوە ئەبێت. پێویســـتە لەســـەر ئۆپۆزیســـیۆن ئەم ئازادییە لەنـــاو بەڵگەنامەیەك یان نوســـراوێکدا ڕابگەیەنێت، تا ببێت بە ڕاگەیاندنێکی مێژوویـــی و هاوئاهەنگبێت لەگـــەڵ جاڕدانی مافی ئینساندا.

حەوت/ لەم ڕووەوە پێویستە بەچاوێکی کراوە و ڕەخنەگرانەوە سەیری ناونانی ئەو چەمکە ئیسلامیانە و ناوبردنیـــان بین کە بەهەوانتە بەکاردێن: بۆ نموونە «ئیسلامی سیاسی» یان «ئیسلامی میانڕەو» یانی چی؟

موسڵمانی سیاسی هەن و موسڵمانی میانڕەویش هەن. بەڵام ئیسلام لەڕووی دینییەوە لە کاتی قسەکردن لەسەر کارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکان، ناگونجێت بە ئیســـلامی «سیاســـی» یان بە «میانڕەو» ناوببرێت ـ قبوڵکردنی ئەم جۆرە گوزارشـــتکردنانە ئەبێتە هۆی ڕازیبوون بە گوزارشـــتکردنەکانی تری وەك «لادەر» و «توندوتیـــژ» و «داخراو» و چەندانی تر. بەم شێوەیە خودا دێتە ناو «گفتوگۆ»وە و ئەبێت بە ئایدۆلۆژیا.

بۆ نموونە، مانای «ئیسلامی میانڕەو» لەسەر ئاستی مەدەنیەتی کۆمەڵگە، ئاستی هونەر و فکر و مۆسیقا و ژیانی جەستە و سێکس و خۆشەویستی چییە. وە ئایە ئەوە کێیە کە پلەی ئەو «میانڕەوی»ییە دەستنیشان ئەکات، چۆنیش؟

ئایە «بەها»ی ئەو میانڕەوییە لە کوێوە دێت؟ ئایە لە خوێندنەوەیەکی تایبەت و تێگەیشتنێکی تایبەتەوە دێت، بەڵام چۆن؟ ئایە شوێنی شەرع لەم میانڕەویەدا لە کوێدایـــە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە ئافرەت و ئەوانی ناموســـڵمان و ئەوەی تـــرەوە هەیە کە بە موســـڵمانی لەدایکبووە بەڵام ئەیەوێت بە یەکجاری بچێتە ناو دنیای مەدەنییەوە؟

موســـڵمان لە هەردوو ڕووی باشە و خراپەوە، قابیلی پیشاندان و گوزارشتکردنە.

ئیســـلام گوزارشـــت ناکرێت تەنها بە خۆی و بەناوی خۆیەوە نەبێت.

هەشـــت/ تابێت بەتایبەتی لەبـــەر ڕووناکایی یاخیبوونە عەرەبییەکاندا ئەوە دەرئەکەوێت کە ئیسلام، بەلای خۆرئاوای سیاسی، ئەمەریکی ـ ئەورووپییەوە، لە ڕووی دینیی و ڕۆشنبیریی و شارستانییەوە، شتێك نییە جگە لە کەرەستەیەك. ئەوەی کە بەلایەوە گرنگە: چۆن ئەم «ســـوپا» زەبەلاحەی کە ناوی ئیسلامە بە پێی پلانی سیاسی و ستراتیژی بەکاربهێنێت. ئەمەش مەسەلەکەیە.

هێڵ و ڕایەلانێك هەن کە ئیسلامی خۆرهەلاتی ناوەڕاست بە ئیسلامی ئاسیاوە گرێ ئەدات. ئەوەش ئەو «دەوروبەر»ە ئیســـلامییەیە کـــە پارێزگاری بیرە نەوتـــەکان و ســـەرچاوەکانی تر ئـــەکات. دژ بەو هەژمونەی چین ئەوەستێتەوە و بە ڕوسیاش ئەڵێت: نا.

ئەوەی کە جێی پێکەنینە ئەم خۆرئاوا سیاســـییە پێیوایە بـــەم کارەی بەرگری لە مافی موســـڵمانان ئەکات. هەروەها جێی پێکەنینیشە کە زۆرینە باوەڕ بەمە ئەکەن و هاوپەیمانی لەگەڵدا ئەبەستن. ئەوەی کە هـــەر زۆر جێی گاڵتەجارییە ئەوەیە کە خۆرئاوا هەر لە دروستبوونی ئیســـرائیلەوە بە سوکایەتییەوە سەیری ئەو مافانە ئەکات، هەروەها هانی زەوتکردن و سڕینەوەی ئەو مافانە ئەدات لە فەلەستیندا.

ئەم دوو ڕوویییەی کە خۆرئاوا لەبەرامبەر عەرەب و موســـوڵماناندا پەیڕەویی ئەکات، شـــێوەیەکە لە شێوەکانی تری ئیســـتیعماری ڕۆشنبیریی دژ بەوان، ئەمەش بۆخۆی وێرانکردنێکی ترە.

نۆ/ هەلومەرجەکە هەرچۆنێك بێت، بزوتنەوەی یاخیبوونـــە عەرەبییەکان هەر دەرەنجامێکیان هەبێت (بـــەلای منـــەوە لە هەمـــوو ڕوویەکـــەوە لە زۆر ئاســـتەوە پۆزەتیڤە)، لەســـەر هێزە پێشکەوتوخوازە دیموکراســـیەکانی ناو هەموو ولاتـــە عەرەبییەکان پێویســـتە، بەتایبەت لە ســـوریا، هەروەها لەســـەر ڕێکخراوە مەدەنیەکان، کۆمەڵەکانی دیموکراســـی گەنجان، بەتایبەتی ژنان، ڕێکەوتنێکی دیموکراسی پێکبهێنن بۆ خەباتی تیۆریـــی و پراکتیکی لە پێناو دامەزراندنـــی دەوڵەتێکـــی مەدەنـــی و ڕێکخراوە مەدەنیـــەکان و کۆمەڵگەیەکی مەدەنیدا. هەروەها لە پێناو پارێزگاریکردنی ولاتانی عەرەب لە خلیسکان بەرەو حکومەتی دینی بەناوی «ئیسلامی میانڕەو»، یان حکومەتانێکی زوڵمکەری تۆتالیتاریەوە.

دە/ ســـتندال بەو واتایە ئەڵێت: «ئەگەر ئینســـان بیەوێت کەســـێکی دیـــاری نـــاو کۆمەڵگەیەکی گەورەبێـــت، ئەبێت لە ناو کۆمەڵگەدا کەســـێکی لێهاتووبێت بۆ پێشکەشـــکردنی قوربانی بۆ ویستی گشـــتی، بەلام گەر هاتوو هەڵە بوو، ئەوا هیچ نییە و شایســـتەی هیچ شـــتێکیش نییە جگە لەوەی پێی بوترێت: «کوڕێکی وێڵ».

من بۆخۆم حەزئەکەم «کوڕێکی وێڵ»بم بەقەد ئەوەی یارمەتیدەری ئیرادەیەکی گشتی هەڵەبم.

**سەرچاوە:**

ڕۆژنامەی «الحیاة»ی عەرەبی، ڕۆژی ٢٩ی مای ٢٠١١

**www.international.daralhayat.com**

# خۆپیشاندانەکانی جیهانی عەرەبی لە کوشتنی باوکەوە بۆ شۆڕش بەسەر ڕەمزدا

نووسینی: خلود ئەلزغیر
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

بەرپابونی شۆڕشەکان لە زیاد لە دەوڵەتێکی عەرەبیدا، تەنها واقعی سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتی نەگرتووەتەوە، بەڵکو کایە ڕەمزییەکەی ئەم کۆمەڵگایانەشی گرتووەتەوەو ڕایماڵیون. بەمەش شۆڕشەکان سەلماندیان کردەیەکی مێژووینو کردەیەکی کودەتایین بە هەموو ئەو مانایانەی وشەی کودەتا هەڵگریەتیو سەرجەم ئاستەکان دەگرێتەوە. پێشتر شۆڕشەکان لە کۆمەڵگاکانی عەرەبیدا، پرۆسەی ڕوخاندنی (ڕەمز)ی بە تەواوی جێبەجێ نەکردبوو، چونکە هیچ کۆمەڵگایەك نییە بتوانێت بەبێ بوونی کایەیەکی رەمزی تایبەت بەخۆی بژی کە لێیەوە ماناکان وەردەگرێت. بەڵام ئەم شۆڕشە شڵەقانێکی خستە کایەی ڕەمزی ئەم کۆمەڵگایانە، هەروەها جێگۆڕکێی (تبدیل) بە شوێنو پێگەی ڕەمزەکان کرد.

گرنگترین ڕەمزێك کە ئەم شۆڕشانە لە سەرەتاکانیاندا ڕوخاندیان، وێنە زەبەلاحەکانی سەرۆکەکان بوو کە لە شەقامو گۆڕەپانەکاندا، چاویان بڕیبووە جەماوەر. وێنەکان هەندێجار دەستیان بۆ سەلامکردن بەرزکردبووەوە، تاکو دڵنیابێت لەوەی دەستی لەسەرو هەموانەوەیەو هەروەها

**گرنگترین ڕەمزێك كە ئەم شۆڕشانە لە سەرەتاكانیاندا ڕوخاندیان، وێنە زەبەلاحەكانی سەرۆكەكان بوو كە لە شەقامو گۆڕەپانەكاندا، چاویان بڕیبووە جەماوەر**

چاویشـــی لە هەموانە. بەڵێ لـــە ڕۆژانی یەكەمداو لەژێر قورسایی چەپڵەو دروشمو فیكەكاندا، وێنەی (بـــرا گـــەورە- الاخ الاكبر) پارچـــە پارچە كراو شۆڕشـــگێڕان ڕایانگەیاند هیچ كەسێك لە شەقامدا لەسەرو دەســـەڵاتی شـــەقامەوە نییە. وێنە ڕەمزە، پەیكەر ڕەمزە، كتێبی ســـەوز ڕەمزە، كاتێ ئەوانە تێكدرانو پارچە پارچە كران، گەنجەكان گڕوتینو حەماســـەتێكیان تێدا كەوتەگەڕ كە لە شۆڕشەكەدا بەردەوامبنو بڕۆن بۆ پێشەوە، ئەمەش دوای ئەوەی ژەمێكی (جرعە) بەهێزیان لە كوشـــتنی (ڕەمز)ی سەرۆكەوە وەرگرتبوو. ئەم حاڵەتە حاڵەتی یەكەم پیاوی ناو ئەشـــكەوتمان بیردەهێنێتـــەوە، ئەو پیاوە كاتێ نەیتوانیوە گای ناو دارستانەكە بكوژێت، ئەوا ئەو گایەی كوشتووە كە وێنەكەی لەسەر دیواری ئەشكەوتەكەی كراوە، بەمەش هەستی بە سەركەوتن كـــردووەو ئازایەتیو بوێرییەكـــەی زیادیكردووە، ئیدی پاش ماوەیەك هێندەی نەبردووە توانیویەتی لە دارستانەكەشدا بەسەر (گا)كەدا سەركەوێت.

شۆڕشگێڕەكانیش هەمان شتیان ئەنجامداو دواتر سەرۆكی (ڕەمز)یان ڕوخاند كە نیشتیمانو میللەتو ژیانی میللەتی لە خودی خۆیدا كۆكردبووەوە، وەك ئەوەی لە قوتابخانـــەكانو ڕاگەیاندندا بە میللەت دەوترایەوە. شۆڕشـــگێڕەكان ڕەمزی دەسەڵاتێكی پاتریاركی شـــمولیو باوكســـالارییان ڕوخاند كە وەك قەدەرێكی خودایی بەســـەریاندا فەرزكرابوو. ڕەمزی كەلتووری ســـەدەكانی ناوەڕاستیان ڕوخاند كە پەیوەست بوو بە خێزانەوە، خێزانێك باوكێكی پاتریارك حوكمی دەكاتو پێویستە ڕێزی بگیرێتو ملكەچی بیت. ئەوان كۆتاییان بە درێژكراوەی ئەم كەلتوورە هێنا كە باڵی بەسەر دەوڵەتیشدا كێشابوو، دەوڵـــەت كە بریتییـــە لە دەزگایەكی شارســـتانی مۆدرێن. شۆڕشـــگێڕەكان وتیان (نا) بۆ سەرۆكی باوكی خودایانە. بە ســـادەیی ئـــەو گەنجانە بە مانا ڕەمزییە فرۆیدیەكەی باوكانی خۆیان كوشت.

بـــەڵام پرســـیارەكە ئەمەیە: بۆچـــی لەمڕۆدا گەنجەكان توانیـــان ئەو كارە بكـــەن كە نەوەی

پێشـــتر نەیتوانی بیکات؟ ئەمەش هەر پەیوەستە بە مەســـەلەی ڕەمزەوە. ئەگەر تەماشـــای ئەو سیاقە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیرییە بکەین کە نەوەی ئێستا تێیدا گەورەبووە، بە ئاشکرا هەڵوەشاندنەوەی ئایدۆلۆژیـــای سیاســـی (واتە هەڵوەشـــاندنەوەی باڵادەســـتی یەك حیزبو یەك ئایدۆلۆژیا) لە ژیانی گشتیدا دەبینین، ئەو هەڵوەشـــاندنەوەیە ڕێگای بۆ فرەیی حیزبیو فرەیی ئایدۆلۆژی خۆشکرد. لێرەوە باڵادەســـتی تەنها ڕەمزەکانی یـــەك حیزبو یەك ئایدۆلۆژیا، چیتر قەناعەت بە هیچ کەسێك ناکات، بەتایبەتی بەهۆی بوونی لێکترازانێکی گەورە لەنێوان دروشـــمو ڕەمەزەکان، لەگەڵ واقعـــی میللەتو ئاواتەکانی. ئیدی نەوەیەکی گەنجی جڵەونەکراو، بەسیاسی نەکراو، بە ڕەمزنەکراو پێگەیشتووە. تەنانەت پێشـــترو لە زۆر جاردا، بڕێك لەو گەنجانە، کەم تا زۆر دەبوونـــە قوربانی ئینتیمای نیشـــتیمانی. لێرەوە ئەم پانتاییە کە بە ململانێ ئایدۆلۆژییە تەسکەکانو یەکتر ســـڕینەوەکان پیس نەکراوە، بەشـــداربوو لە دروســـتکردنی خۆپیشـــاندانێکی یەك ملیۆنی، خۆپیشاندانێك هەموو شـــەبەنگو توێژو گروپو ئینتیماکانـــی کۆکردبووەوە. چونکـــە ئامانجەکان توانی بەسەر ســـەرچاوەی ئایدۆلۆژیای تاکەکاندا ســـەرکەوێت، هەروەها چونکە ڕەمـــزی ئازادی توانی هەموو ڕەمزە لاوەکییە وردو پەرشوبڵاوەکان لەخۆبگرێتو کۆیانبکاتەوە.

دووەم خاڵی گرنگ لە بونیادی پێکهاتەی ئەم نەوە گەنجەدا کە پەیوەستە بەو سیاقە کۆمەڵایەتی/ ڕۆشنبیرییەی تێیدا گەورە بووە، بریتییە لەو جیاوازییە ئاشکراو بینراوەی لە بونیادی پەروەردەدا هاتووەتە ئاراو نەوەی تازە لەسەری گەورە بووە کە جیاوازە لەوەی نەوەی حەفتاکانو هەشتاکان لەسەری گەورە بوون. کەس نکۆڵی لە پێشـــکەوتنی شـــێوازەکانی پـــەروەردەو گۆڕانی پەیوەنـــدی نێوان کوڕەکانو باوکان ناکات، نکوڵی لـــەو کرانەوە بەردەوامەی میدیاو ڕاگەیانـــدن ناکات کە ســـەربەخۆییەکی بە منداڵانو گەنجان بەخشـــیووە، سەربەخۆیی لە بڕیـــاردانو بیـــروڕاکانو گفتوگۆکاندا، چ لەگەڵ خزمو کەسوکاردا یان لەگەڵ خەڵکانی دیکەداو لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە. ئەم پێکهاتەیە کە بە ڕادەیەکی بەرچاو کراوەو ئازادەو بەشێوەیەکی ستونی ملکەچی پلەبەندی هەرەمیەتی خێـــزان نییە، تەنها لە هەندێ خێزاندا نەبێت، ناتوانین نکۆڵی لە کاریگەرییەکانی بکەین بەسەر دروســـتکردنی ئەم نەوەیەدا: یەکەم بەوەی یادەوەری ئەم نەوەیە تا ئاســـتێك دوورە لەو کوشتارگایانەی دەسەڵاتدارانی عەرەب ئەنجامیان داوە. دووەم ئـــەم نەوەیـــە ڕۆحێکیان هەیە زۆر لە ملهوڕی دەسەڵاتداران ناترسن، بەتایبەتی دوای ئەم کرانـــەوە میدیاییە کە بە چـــاوی خۆیان لە کەناڵە ئاسمانییەکانو لەسەر تۆڕەکانی ئینتەرنێت دەیبینن. ســـێیەم کە لە دوانەکەی دیکە گرنگترە، لاوازی دەسەڵاتی باوکی پاتریارك لە هوشیاری ئەم نەوەیەدا، چونکە ئەوان کوڕوکاڵی ئەم کۆمەڵگا مۆدرێنانەی ئەمڕۆن.

گۆڕینی ڕەمزە ئاینییەکان، هیچی کەمتر نییە لە ڕوخاندنی ڕەمزی کەسایەتییەکان. پێش دوو مانگ لەمەوبەر، لە زیاد لـــە وڵاتێکی عەرەبیدا، دەهۆڵی مەترســـی لێدەدرا گوایە دیـــاردەی تایفەگەریو دەمارگیریو توندڕەویو شتی دیکەی پەیوەست بە ڕەمزە ئاینییەکان بڵاوبونەتەوە. کەچی مەیدانەکانی ئـــازادی، بە یەك جار هەموو ئەو ڕەمزانەی داماڵیو ئەم ڕەمـــزە لاوەکییانـــەی گۆڕی-بەبـــێ ئەوەی لەناویانبەرێـــت بـــەو پێیەی ئەوانە بەشـــێوەیەك لە شێوەکان دەچنە خانەی ئینتیماکردنەوە- بۆ کۆمەڵێ ڕەمزی دیکە کـــە کراوەترو مۆدرێنتـــرنو زیاتر

توانای بەشـــداریکردنو قبولکردنی ئەوی دیکەیان هەیە. ڕەمـــزە تایفییە تەســـکبینەکان کاڵبونەوە و تەنها ئاڵاو سرودە نیشتیمانییەکان بەرزکرانەوە. ئەم جێگۆرکێیە (تبدیل) لە ڕەمزدا، لە کایە ڕمزییەکەدا وایدەخوێنینەوە گۆڕینی بیرۆکەی موقەدەســـە کە ئێســـتا بووەتە نیشـــتیمانو ئازادیو دیموکراسیو کەرامـــەت. هەروەها وایدەخوێنینـــەوە کە مەیدانە گشتیو هاوبەشەکانی نیشتیمان، چیتر لەمەولا پاوانی گروپێك یان تایفەیـــەك یاخود حیزبێك نییە، بگرە هی هەمو هاولاتیانە. بەڵام شوێنی ڕەمزە تایفییەکانە، چیتر مەیدانە گشتیو هاوبەشەکانو کایەی سیاسی نییە، بەڵکو مزگەوتو شـــوێنەکانی خواپەرستیو ماڵەکانو بواری تایبەتە.

هەروەها ئەم شۆڕشانە شڵەقانێکی خستە کایەی ڕەمزی حیزبەکانو ئەو دابەشـــکردنە باوەی حیزب کە لە کۆمەڵگاکاندا ناسراوە، گرنگترین دەرکەوتەی ئەم شڵەقانە ئەوەیە بۆ یەکەمجارە میللەت ڕابەرایەتی دەسەڵاتو ئۆپۆزسیۆن دەکات. ئەمە لە کاتێکدایە پێشتر میللەت سەرکزو پێشتگوێخراوو خەسێنرابوو. بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو ڕەمزی لەلایەن دەسەڵاتو دەســـتەبژێرەوە ســـەرکوتکرابوو. ئەم شـــڵەقانە لە پرێکدا وێنەیەکی هۆشـــیاری سیاسی لای میللەت دەرخست کە بەلای ئەو دەســـتەبژێرانەوە شتێکی چاوەڕواننەکراوبـــوو، ئەوانە هەمیشـــە میللەتیان بە جەهلی سیاسی تۆمەتبار دەکرد. میللەتیش ڕەمزی خۆی هەبـــوو، وەلێ بە جیاوازییەکـــی گەورەوە: ئەگەرچی ڕەمزەکانـــی میللەتیش کۆمەڵێ کەس بوون، بەڵام ئەوان داوای (کەســـاندن- الشخصنە) ناکەن، بە پێچەوانەی ڕەمزەکانی دەســـەڵاتەوە. بۆ نمونە «محەمەد بو عەزیـــزی» ڕەمزێك بوو، بەڵام نە خۆیو نە کەســـوکارو نە خزمو خۆشەویستانی، بیریان لـــەوە نەدەکردەوە خۆیان بســـەپێنن یاخود لە ڕێگەی ســـەپاندنی هێزەوە خەڵکی ناچار بکەن وەك موقەدەســـێكو وەك خودایەك خۆشیان بوێن. هەروەها ئەو ڕەمزێك بوو بۆ ئازادیو کرانەوە بەسەر جیهانێکی نادەســـەڵاتو ناسەرکوتکەر. لێرەوە ئەو ڕەمزێك بوو بۆ تازەبونەوەو گۆڕانو ڕەتکردنەوەو قوربانیدان لەپێناو کەرامەتدا. بەمشێوەیە ڕەمزەکانی میللەت هەرگیز لە ڕەمزەکانی دەسەڵات ناچێت کە نیشتیمانیان بە (من- الانا) هەڵلوشیبوو، ئایندەیان بە مێژویەکی پێشوەخت داخستبوو.

گەلانی عەرەب لەم شۆڕشـــانەدا، ســـەرلەنوێ ڕەمزو ماناکانی ڕەمزی ڕێکخســـتەوە، بەجۆرێك لەگەڵ سەردەمەکەیو کەرامەتیو هۆشیارییەکەیدا بگونجێت. سەرەتا بەربەستی ئەو ترسەی شکاند کە لە دەسەڵاتی ئەمنو ئاسایش و ڕەمزەکانی هەیبوو، ئەوانەی ســـوتاند، ئێســـتا ئەو ڕەمزانـــە لە تونسو میسر بوونەتە ڕەمزی ســـەردەمێکی گۆڕبەگۆڕی ئازارو ئەشکەنجەو سوکایەتیپێکردن. پاشان ڕەمزی باوکی سەرۆکی خودایانەی ڕوخاند، دواتر ڕەمزە مامناوەندییە بەرتەســـکەکانی گـــۆڕی بە ڕەمزی هاوبەش و زیاتر کراوە. دواجـــار بەرزکردنەوەی وشەی (نا) ئەمەش دوای کاروانێکی دورو درێژی (بەڵێ)ی سەرشـــۆڕی. (نـــا) ڕەمزێکی زمانەوانیو دەلالـــی کەم نییە بـــۆ میللەتێـــك فێرکرابوو بڵێ (بەڵێ)، فێرکرابوو شەووڕۆژ، لەشەر شەقام، لەسەر دیوارەکان، لە گـــەڕەكو قوتابخانەو لە تەلەفزیۆن، لە ڕۆژنامـــە، لە مەمکی دایکییەوە، لەســـەر لێوی خۆشەویستەکەیو لە گیرفانە کونەکەیەوە بڵێ بەڵێ.

**سەرچاوە:**

الاوان، ١٦ ئازار، ٢٠١١

# هەندێك لە سیمای
# گشتی ڕاپەڕینی ناوچەکە

نووسینی: سادق جەلال ئەلعەزم
و. لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

بۆچی بە تایبەتـــی لەم کاتەدا؟ ئەمە ئەو پرســـیارە کلاســـیکیە چـــاوەڕوان کراوەیـــە کـــە زۆر خێراو بە دەمارگیریەکی بەرچاوەوە، ئەو ئەقڵانە بەرزی دەکەنەوە کە بەپێی تێـــوری پیلان و لێکدانەوەی سوریالیســـتیان چرکە ساتی ڕوودانی هەر کارەساتێکی سەرنج ڕاکێش هەڵدەسەنگێنن. ئیتر ڕووداوەکە لە دنیای عەرەبدا بێت یان لە دنیای ئیسلامدا بە گشتی.

ئەوەی بە ڕاســـتیی لە ڕۆژانی بەهاری ڕاپەڕیندا، کە ڕاپەڕینێکی میللی، ئاشتی خوازانە، شارستانی و شاری بوو بەسەر ڕژێمی ســـەرکوتکەری عەرەبیدا۔ من خۆم بڕوام نەدەکرد بە تەواوەتی لە ڕۆژەکانیدا بژیم و پەیجووری بم ۔ سەرنجی ڕادەکێشا، ئەو لایەنەبوو بە دەمارگیریەکی بێ وێنەو ترسێکی زۆر ئاشکراوە پەنای بۆ((تێوری پیلان)) و شـــرۆڤەکاریەکانی دەبرد کـــە ئەویش خودی ڕژێمە ســـەرکوتکەرەکان بوو نەك نێوەندە میللیە ڕاپەڕیوەکە، ئەوەی ئێمە بەردەوام پێمان دەگوت نێوەندێکە هەندێك جار تا ســـنووری گەوجایەتی شـــەیدای پاساودانەوەی

## ئەو جەماوەرە گەورە ڕاپەڕیوەی یەمەن و لیبیاو تونس و میسرو سوریاو بەحرینیان بە چەتە، ئاژاوەگێڕ، مافیای چەکدار، تیرۆرست و پیاو کوژ دەهاتە بەرچاو. ئەمە لە چاکترین حاڵەتدا، ئەگینا لە خراپەکەیدا بریتی بوون لە مشك و جرج و مارومێرو


سادق جەلال ئەلعەزم

پیلانگێڕی و سادەیی و ساکاریی خۆیەتی. ئەمە لە کاتێکدایە کە خودی ڕژێمە سەرکوتکەرەکان و ئەو دەوڵەتانەی بوونەتە پاشکۆی، هەوڵێکی بەردەوامیان داوە خۆیان وەك ناوەندێك بناسێنن کە سەنتەری ئەقلانیەت و ڕۆشنگەریی و نیشتیمانی و شارستانین. ئەمە لە کاتێکدایە کۆمەڵگای عەرەبیی لە دابەشبوونێکی ستووونیدا: خێلایەتی، مەزەبی، ئەتنی، هۆزگەرایی، بەرەبییدا دەژی کە هەموو ئەمانە کاریگەریەکی زۆریان لەسەر پارچە پارچەکردنی و دواکەوتوویی کۆمەڵگا کە هەیە. بەڵام لە پڕێکدا هاوکێشەکە ئاوەژووبوو. ئەوەی بەتەواوەتی هەڵگێڕایەوە ڕاپەڕینە میللیەکە بوو لە تونسەوە بۆ یەمەن و پاشان بۆ میسر و سوریاو بەحرەین و لیبیاو..هتد.. ئێمە بەچاوی خۆمان ئەوساتە ڕاستیەمان بینی کە چۆن ڕژێمە عەرەبیەکان، وە لە هەموو جارەکانی پێشوو تریان، دەمارگیرانەو بە شێوەیەکی میکانیکی پەنایان بردە بەر درۆی(پیلان) و هەروەها چۆن ڕێکەوتێت، خۆیان دا بەدەست پەناو پەسێویی کافکاویی بۆ لۆژیکە گاڵتەجارییەکەیان، کە هەمووی لەم پرسیارەدا کۆدەبێتەوە(( بۆچی بەتایبەتی لەم کاتەدا؟)) وەڵامی شاعیرێکی عەرەب ئامادەیە: بۆیە لەم کاتەدا: چونکە خەسڵەتی سەرکوتکاریمان، وەك ئەوانەی لێ کردوون کە بڕوایان بە شەڕ نیە تا بەرۆکی خۆیان دەگرێت.

لەبەرئەوەیش کە ئەوان بیریان لە چارەسەرکردن دەکردەوە. ئەو جەماوەرە گەورە ڕاپەڕیوەی یەمەن و لیبیاو تونس و میسرو سوریاو بەحرینیان بە چەتە، ئاژاوەگێڕ، مافیای چەکدار، تیرۆرست و پیاو کوژ دەهاتە بەرچاو. ئەمە لە چاکترین حاڵەتدا، ئەگینا لە خراپەکەیدا بریتی بوون لە مشك و جرج و مارومیرو.

لەڕاستیدا مەبەست ئەوە نییە دەست بخرێتە سەر چ پیلانێك، یان وەڵامێکی دڵکارانە و نیوە دڵکارانە بە پرسیاری( بۆچی بەتایبەتی لەم کاتەدا؟) بدرێتەوە. بەڵکوو ئەوەی زۆر مەبەستە ئەو ناوزڕاندنە خراپەیە دەدرێتە پاڵ سەربەخۆیی جەماوەری گەورەی

شۆڕشـــگێڕان و قوربانیدانەکانیان، گومان دروست کردنێکی فێڵبازانەیە لە ئەهلیەت و ســـەربەخۆیی و ئەو ئاماژە بە پێچ و پەنایانەیە لە بەرتەســـکی عەقڵی و ئاســـتی سیاسی و نیشتیمانی شۆڕشگێڕاندا. بێجگە لەو هێمایانەی گوایە ئیرادەی شەڕەنگێزی و نهێنی و نیازی ئازار پێگەیاندنی لە پشت بزاوت و ڕاپەڕینیانەوە هەیە. گوایە کەس لـــە جەوهەرەکەی ئاگادار نیەو هەست بە مەترسیی لەسەر نیشتیمان و یەکیەتیەکەی ناکات بێجگە لە(( دەستە ئەمینەکان!)) کە پارێزگاری لە ڕژێم و پاراســـتنی و دەوڵەت و دەســـەڵاتەکەی دەکات، کە ناتوانێت جیاوازی لە نێوان پارێزگاری کردن لە ستەمکاری و ســـەرکوت کردن لەلایەك و، پارێزگاری لە نیشـــتیمان و گـــەل و دەوڵەت و بەردەوامیان لەلایەکی ترەوە بکات.

**گەلی تونس ئازادە**

هەموو ئەوانەی ناڕەزاییان دەربڕی، ئۆپۆزسێون، ڕاپەڕیوەکان، ئەوانەی هـــەواداری بەهاری عەرەبی بـــوون بە جۆرێکی تر وەڵامی پرســـیاری:(( بۆچی بەتایبەتی لەم کاتەدا؟)) یان دایەوە. چ وەڵامێك لەو هاوارە ڕەوانبێژتر بوو کە پارێزەرێکی لاو، لەوانەی لەخۆیاندا شاگەشکە ببوو لە یەکێك لە شەقامەکانی تونســـی پایتەختدا کردی و وتـــی:(( گەلی تونس ئازادە)). ئەوە ئەو کاتـــە بوو کە زەین العابدین بن عەلی و خێزانەکەی لە وڵات هەڵاتبوون. هاوارێکی جیهانگیـــر کە هەمـــوو دنیا، تاڕادەیـــەك لە هەموو شوێنێکی ئەم سەر زەویەدا بیستراو بینرا. بەجۆرێکی تر، شۆڕشی یاسەمین ئەوکاتە سەری هەڵدا کە گەلی تونس ئازادبوو، نەك لەبەرئـــەوەی بوویێتە قوربانیی دەســـت پیلانێك. وەڵامی ئەو پیرەی تونســـیش لە وەڵامـــی لاوەکە کەمتر نیە کە هەموومان لەســـەر شاشـــەی تەلەفزیونەوە دیمان چۆن دەســـتی بەسەر میوە ســـپیەکاندا هێناو بەحەسرەتی تەمەنە لەدەست چوەکەیـــەوە وتی:((پیربوویـــن، پیربووین لەپێناوی ئەم چرکەساتە مێژووییەدا)) ئەو چرکەساتەی لەدوا دواییدا بەو و بە ئێمە گەیشت، بەڵام لە بەختی چاکی هەموومانـدا، پێش ئەوەی هەموو شتێك کۆتایی بێت.

وەڵامـــی ڕەوانبێژانەی ســـێیەمیش کە بەدەنگ و ڕەنگ بیســـتیمان و بینیمان. بەتایبەتی لەم کاتەدا کە((گـــەل داوای ڕوخانـــی ڕژێـــم دەکات)) بۆ ڕزگارکردنی نیشـــتیمان و خۆیشـــی، نـــەك لەبەر تێوەگلانێکـــی گەمژانەو بەڕێوەبردنێکی ســـاکارانە لەگـــەڵ پیلانێکدا کە خاوەنی((دەســـتە ئەمینەکە)) عەلی عەبدوڵا ساڵح پێداگرێ لەسەر دەکرد، کاتێك خەڵکی یەمەنی بەڕسوا دایە قەڵەم و گوایا ڕاپەڕینەکە لە کۆشکی ســـپییەوە نەخشەی بۆ دەکێشرێت و لە تەلئەبیبەوە بەڕێوە دەبرێت.

هەندێك ڕایان وابوو ڕاپەڕینی بەهاری عەرەبی لە تونس و میسرو یەمەن و بەحرەین و سوریاو لیبیا و وڵاتی تری عەرەبی، درێژکراوەی شۆڕشی ئیسلامیە لە ئێران دژی دەسەڵاتی پاشـــایەتی ئەو وڵاتە، یان چاولێکەریەکی ئـــەو بزووتنەوە میلیە دیموکراتیەی ئەندەنوســـیایە کە لە ســـاڵی(١٩٩٧ ـ ١٩٩٨)ڕژێمی سەربازیی و دیکتاتۆریی سوهارتووی هەرەس پێهێنا. یان درێژکـــراوەی ڕاپەڕینی ئورزی یەك ملیۆنیە کە ســـاڵی ٢٠٠٥ لوبنانی لە ژێر دەسەڵاتی سەربازیی و ئەمنی ســـوریا ڕزگارکرد. یان لاسایی کردنەوەی بزوتنەوەی بێزاریی و ناڕەزایی دەربڕینی ســـەوزیی ٢٠٠٩ ئێرانە، کە لە دژی دەستێوەردانی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بۆ ســـەرکەوتنی مەحموود ئەحمەدی نەژادی پاڵێوراوی ڕژێم کـــرا. هەیش بوو دەیوت

لەو ڕاپەڕینە ئاشتیخوازانە گەورەیە دەچێت کە ساڵی ١٩٨٦ لە دژی دیکتاتۆری فلیپین فردیناند مارکوس و ئیملیدای ژنی بـــۆ بەرژەوەندیی فەرمانڕەواییەکی دیموکراتی نوێکراو خەڵك پێی ڕازی بوو.

**بەهاری دیمەشق، ٢٠٠٠**

هەموو ئـــەم بۆچـــوون و گریمانە(ئەگەر چی لێپراوانەن)، کەچی هیچ بایەخێکی بەرچاو بە بەهاری ٢٠٠٠ دیمەشـــق نادەن. بەلای منـــەوە ئەو بەهارەو لەم سیاقەدا، جۆرێك بوو لە((پێشەکیەکی تیوری)) یان(( پرۆڤە))یەکی بەرایی و ئاشـــتەوایی ئەو کاتە، بۆ تەقینەوەی ڕاپەڕینی عەرەبی داهاتوو کە بریتییە لە دروشـــم و داواکاری و سکالاو بانگەوازو خەون و قوربانیدان. من وادەزانم، لەم لایەنەوە، بەهاری دیمەشق پێشەنگێکی عەرەبیە. چونکە کۆی دروشم و داواکاری و ناڕەزایەتیەکان، ئەوانەی ڕاپەڕینە میللیەکەی عەرەب لە تونسەوە تا یەمەن پاشان بە لیبیای زامداردا تێپەڕی، تا ڕادەیەك هەر هەموویان ـ بەجۆرێکی زۆر مۆدێرنترـ لەو بەڵگە سیاســـیەـ ڕەخنەییەـ چاکسازیەدا هەیە کە بزوتنەوەی بووژاندنـــەوەی کۆمەڵگای مەدەنیی لە ســـوریا، لە بەهارە کورتەکەی دیمەشـــقدا بەرزی کردبوەوە، بزوتنەوەکەی ئەوسای سوریا، هەموو ئەو داواکاریانەی خستە بەردەم گفتوگۆیەکی دیموکراتی گشتی، لە ڕێگای شەپۆلێکی بەرفراوانی وتاردان و کۆڕو گفتوگۆو دوانگەو دانیشتن و ڕۆنان و دژەکەی و ڕەخنەو هەموو ئەو نووســـینانەی لەو ماوەیەدا لە ســـوریادا بڵاوبوونەوە. کە ئومێد دەکرا لەو کاتەدا، ســـەرۆکایەتییە گەنجەکەی ســـوریا بەشداری لەو بزاوتـــە زیندووەدا بکات و بێتـــە ناو چەندو چوونە هەنوکەییەکانـــەوە. بۆ ئەوەی ببێتە ســـەرەتایەك بۆ دروست بوونی ڕای گشتی هەمەگیر بۆ ئەنجامدانی پێویستیەکانی سوریا لە فریاکەوتنێکی سەرەتایی خێرا، چاکسازیەکی مام ناوەندیی، چارەسەرکردنی ئاینده. بۆ نموونە((بەیانی ٩٩ی ڕوناکبیرانی سوریا( دیمەشق ٣٠/ ٩/ ٢٠٠٠)) و «بەڵگـــە ئەساســـیەکانی لیژنـــەی بووژاندنەوەی کۆمەڵگای مەدەنـــی» کە «بە بەیانی هەزار» (دیمەشق، کانوونی دووی ٢٠٠١) بەناوبانگە. «بەیانی پێکگەیشتنی هاریکارانی کۆمەڵگای مەدەنی» ( دیمەشـــق، ئاب،٢٠٠٢) هەموو ئەمانە زۆر بەوردی و پوختیی ئەو کێشـــەو بۆشایی و باس و ئاستەنگیانە تاووتوێ دەکەن کە لە پێناویدا ڕاپەڕیون. بۆ یەکلایی کردنەوەو چاکســـازیی کردن لە تونس و میســـر و لیبیا و یەمەن و ســـوریا و بەحرەین لە ساڵی ٢٠١١ کە لە ســـەرووی هەموو ئەمانەوە پاراستنی ئازادی و کەرامەتی خەڵکە.

بێگومان ئەوەی بەهاری دیمەشـــق دەیویست و چـــاوی تێبڕیبوو نە ڕوویداو نـــە هاتەدی، بەڵکو بە تـــەواوی پێچەوانەکەی ڕوویدا. دەزگا ئەمنیەکان وردە وردە گفتوگۆکانی بەهاری دیمەشقیان لەناوبرد، تا گەیشـــتە ئەوە کە پێش ئەوەی چ گوڵێکی دەم بکاتەوە زینـــدە بەچاڵ کرا. بەهاری دیمەشـــقیان ســـەرکوت کرد: چونکە بەئاشـــکرا هەســـتی بەو کێشـــە کەڵەکە بوانەی وڵات کرد بێ ئەوەی خۆی دەستێکی تێدا هەبێت. هەروەها زۆر بەڕوونی هەستی بەو بەربەســـت و خەفەکردنانە کـــرد کە ڕژێمەکە لەژێریدا دەینالاند. لەکاتێکدا کە خۆی چ دەستێکی لە دروســـت کردنیدا نەبوو. ئـــەو حاڵەتی داچوونە گشـــتیەکەی کۆمەڵگاکەیشـــی دەبینی کە خۆی بەرهەمی نەهێنابوو. بەهاری دیمەشق لەبەردەم دەردی بێ دەرمان و گیروگرفتە بەربلاوەکانی وڵاتدا دەبوو هەڵچێت. چونکە ئەو دەستی لە دروست کردنیاندا

نەبوو. بۆیە هەر لەو کاتەدا خوێنە پاکژەکان ڕژانە نێو شەقام و شارو گوندەکانی سوریاوە نەك لەبەرئەوەی ڕاپەڕیوەکانی سەرانسەری وڵات پیلانە دەرەکیە دۆزەخیەکان جێبەجێ دەکەن بۆ ئەوەی سەقامگیری و توانای نیشتیمان بخەنە مەترسیەوە!

ترسی گەورە لەوەدایە کە سیاسەتی خۆگێل کردنی فەرمیی لەم مەسەلانە، سیاسەتی مامەڵەکردنی ئەمنی لەگەڵ هەموو خۆپیشاندان و ناڕەزایی دەربڕیندا، ناوزەدکردنی داواکاریە ئاشتیخوازیەکەی خەڵك بە فیتنەو یاخی بوون و ناپاکی، هەموو ئەمانە برینێکی قووڵن لەنێوان ڕژێمی دەسەڵاتدارو کۆمەڵگای سوریا بەگشتی کە لە ئایندەی نزیکدا چارەسەر ناکرێن. چونکە ئەو جۆرە سیاسەتە ـ ئەگەر ڕانەگیرێت ـ دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی تیرەگەری و تایەفەپەرستیەکی بەربڵاو لە وڵاتدا، تەنانەت ئەگەر هەروا بە شاراوەیی بمێنێتەوە تا ئەوکاتە دیسان دەتەقێتەوە.

## سروشتی ڕاپەڕینەکان

ڕاپەڕینە هەنووکەییەکانی بەهاری عەرەب بە شۆڕشی گەنجان ناونراوە، شۆڕشی تەکنەلۆژیای بەرزی پەیوەندی و زانیاریەکان، وەك ئەنتەرنێت، کۆمپیوتەر، مۆبایل، فەیسبوك، تویتەرو یوتیوب، ئەو کەناڵە ئاسمانیانەی سات بە سات و چرکە بە چرکە بەدوای گۆڕانی ڕووداوەکانەوەن. ئەمانە بزاوتێکی چۆنایەتی گەورە بوون و ڕۆڵێکی هەرە کاریگەر و یەکلاییکەرەوەیان هەبوو لە بەرژەوەندیی جەماوەرە شۆڕشگێڕەکەدا. هەروەها پشتیوانیی شۆڕشەکەیان کرد کە بەرەو ئاقاری ئاشتیانە بجووڵێت و سیمای شۆڕشێکی هۆشیارانە و ڕوناکبیرانە لەخۆ بگرێت کە توانای بەسەر تازەترین دەستکەوتی ئەم سەردەمەدا بشکێت لە بواری تەکنەلۆژیای پەیوەندیەکان و ئاڵوگۆڕی زانستی و گوێزانەوەی زانیاری و پەیوەندیە هەنووکەییەکان بەشێوەی گشتی.

لە هەمان کاتدا، ئەو بزاوتە چۆنایەتیە، ڕژێم و دەزگا ئەمنیەکانی بە دواکەوتویی هێشتەوە کە توانای گەیشتنە کاروانی نییە، چونکە هیچ شێوازێکی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەو بارودۆخە تازەیەدا نەبوو بێجگە لە خۆپاراستن لە دوای ئەو تایبەتمەندیانەوە کە وەك دەزانین هەر دەوڵەتێکی عەرەبی لەویدی جیادەکاتەوە. پێداگرتنە کوتوپڕەکەیشی لەسەر هەرشتێك کە وڵاتێکی عەرەبی لە دراوسێکەی یان لە وڵاتەکانی تری عەرەب جیادەکاتەوە.

لێرەوە، بانگەشەو هەراو زەنا فەرمیەکەی حکوومەت، لە سەردەمی ڕاپەڕین و شۆڕشدا، کە گوایە میسر تونس نییە، لیبیا میسرو تونس نییە، سوریا نە تونسەو نە میسرەو نە لیبیایە...ئەمە لەکاتێکدا کە میسر، ڕۆژێك لە ڕۆژان، لەسەر ئاستی واقیعی شۆڕشی ئێستا، لە ئێستا زیاتر لە تونس و بەحرەین و لیبیا نەچوە وەك چۆن هاووڵاتیەکی ڕاپەڕیوی بەحرەینی چاکسازیەکی دەوێت کە لە ڕێگای دەستوورێکی ڕاستەقینەوە شایەکی بۆ دابنرێت و سەرۆك وەزیرانێکیش کە کۆشك داینەنێت بەڵکوو لەناو خەڵکەوە بێت، هاووڵاتیەکی ڕاپەڕیوی میسری و سووریش چاکسازیەکی دەوێت کە سەرۆك کۆمارێکی ڕاستەقینەی دەستووری بۆ دەستەبەربکات، سەرۆك وەزیرانێکیش لە کۆشکەوە دەستنیشان نەکرێت بەڵکوو لە نێو گۆڕەپانێکی زۆر دیموکراتیانەی وڵاتەکەی خۆیەوە بێت.

بۆیە دەڵێم: هاوڵاتی عەرەب، تا ئەندازەیەك زۆر دەمێکە، هەستی بەم نزیکبوونەوەو لێکچوونەی ئێستای کۆمەڵگای عەرەبی نەکردوە، ئێستای سەردەمی بەهاری

عەرەب، کێشـــەو تەنگەژەکان، ڕیسك و داخران و ستەم و بزاوت و دەرگاو چارەسەرەکان. تەنانەت لەم بەهاری عەرەبی شۆڕشەدا، هەست بەهەمان هاوکێشە کۆنە ڕۆمانســـیەکەی نەتەوەی عەرەب دەکات کە دەڵێت: (یەکیەتی ئـــازارو ئامانجەکانی نەتەوە) ئەمە بۆ ئێســـتا مانایەکی بەرجەســـتەتری لەجاران هەیە. لەبەرئەوەی، بۆ نموونە، زۆر ڕوون و ئاشـــکرایە کە ئازارو ئامانجی گەلانی تونس و میســـرو ســـوریا و لیبیاو بەحرەین، هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان وەك ئەمڕۆ یەکگرتوو ڕۆمانسی و لەیەکچوو و ئەبستراك نەبوون. ئەمانـــە تاڕادەیەك لە داواکاری ناڕەزایی دەربڕینی و دروشم و ڕەفتاری خۆپیشاندەراندا، لە هەموو وڵاتە عەرەبیەکاندا دەرکەوتووە.

بەهاری عـــەرەب، جۆرێکـــی تری((یەکیەتی عەرەب))ی دەرخست، ئەوەیش لە جۆری بەرنامەو مامەڵەکردنی ڕژێم و دەزگا ئەمنیەکاندا دەرکەوت لەگەڵ دۆخە میللی و شۆڕشگێڕیە نوێکەدا. هەموو ئەوانە ســـەلماندیان کـــە ڕژێـــم چ ڕێگایەکی بۆ نەماوەتەوە بێجگە لە پەنابردنە بەر ســـەرکوتکردن و توندوتیژی و ڕاوی دور بەدورو ڕێژنە بارانی گولەی خەڵکانی مەدەنی، هەروەها پەلاماردانی خۆپیشاندەرو ناڕازیەکان لەلایەن چەقۆکێش و پیاوە دڕندەکانەوە. بۆیە دەتوانیـــن بڵێین یەکیەتیـــە ئەمنیەکەی ڕژێمە عەرەبیەکان، لێکچوونی ستەمکاریەکەیان لە زوڵم و زۆری سەر وڵات و گەلەکەیان، هەرگیز وەك ئەوەی لە بەهـــاری عەرەبی پیرۆزدا دەرکـــەوت لەوەوبەر نەبینرابوو.

پێویستە لێرەدا هەڵوێستەیەك لەسەر ئەو ڕایە بکرێت کە دەیەوێت شۆڕشـــی بەهاری عەرەب و ئەو شتە تازانەی لەخۆی گرتووە تەنیا لەوەدا چڕبکاتەوە کە پەیوەندی بە تەمەنی زاڵی لاویەتیەوە هەیە، هەروەها تەکنەلۆژیای پەیوەندیە باڵاکان بەشێوەیەکی بەرفراوان بۆ ئاسانکاری بەکارهێنراوە. گەل سەرچاوەی شۆڕش و ڕاپەڕینەو هەرخۆی دروستیان دەکات.

هەر مرۆڤیشە خۆپیشـــاندان دەکات و بێزاری و ناڕەزایەتی دەردەبڕێ و هەموو جۆرە کەرەسەیەکی تەکنەلۆژیا کە دەستی لێ گیربێت بەکاری دێنێت. گومان لەوەشدا نیە کە لاوان گەورەترین و فراوانترین توێژن لە پێکهاتەی دیموگرافـــی گەلانی عەرەبدا بەگشتی. بۆیە، هیچ سەیر نیە کە ئێستا ڕاپەڕینی گەل بەلای شۆڕشی کچ و کوڕی لاودا بشکێتەوە. هیچ سەیر نییە لاوەکانی تەکنەلۆژیای سەردەم بەکاربهێنن کـــە بەتەواوی لەژێـــر کۆنترۆڵیاندایە، وەك چۆن لە

**هەموو ئەوانە سەلماندیان کە ڕژێم چ ڕێگایەکی بۆ نەماوەتەوە بێجگە لە پەنابردنە بەر سەرکوتکردن و توندوتیژی و ڕاوی دور بەدورو ڕێژنە بارانی گولەی خەڵکانی مەدەنی، هەروەها پەلاماردانی خۆپیشاندەرو نارازیەکان لەلایەن چەقۆکێش و پیاوە دڕندەکانەوە.**

ڕابوردودا شۆڕش و ڕاپەڕینەکان کاسێت و ڕادیۆو ترانزیستورو ڕۆژنامەو بلاوکراوەو نامیلکەو تەنانەت کۆتری نامەبەریان بەکاردەهێنا. ئەمە تەنیا بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکەی و ڕاژەی ئەجێنداکەی.

### دابڕان لە سەرکردایەتی کاریزمی

لەهەمانکاتدا، لاویەتی ئەم ڕاپەڕینانە، لە بنەڕەتەوە خۆی لەو نەریتە عەرەبیە چەسپیوە دابڕی کە دەرکەوتنی سەرکردەی کاریزمییە، ئەوەی خودی جەماوەری شۆڕشگێڕ لە دەوری سەرکردایەتیەکەی کۆدەبێتەوە وەك مەرجێکی سەرکەوتن و بەدیهاتنی داواکاریەکانی. کاریزمای چرکەساتی شۆڕشگێڕیی لەو سەنتەرەوە کە تاکێکی پێشەواو سەرۆکێکی بلیمەتە، گوێزرایەوە بۆ ناو جەماوەرە ئاپوورەکەی ڕاستەقینەی شۆڕش و گۆڕان. بە دڵنیاییەوە ئەمە وەرچەرخانێکی تازەو گرنگە بۆ ئێمە. لەبەرئەوە مەیدانی ئازادی و گۆڕان لە تونس و قاهیرەو سەنعاو مەنامەو بەنگازی، بوون بە نموونەی هاوبەشیەکی مەدەنی زۆر چڕی ژن و تاڕادەیەکیش منداڵ و کچ و کوڕ لە شارو کۆمەڵگا زۆر پارێزکارەکاندا. هەروەها بەشداری کردنی هونەرو شێوازەکانی تری دەربڕینی داهێنەرانە وەك موزیك و گۆرانی و نواندن و سەماو باڵۆن و درود خوێندن، تا کاریکاتێرو توانجی گاڵتەجاڕی و نووسینی گرافیتی ڕەخنەیی، هەموو ئەمانە بەڕوویەکی خۆشەوە بەگشتی لەگەڵ بوونی چەقۆکێش و پەلاماردەران و تۆقاندن و سەرکوتکردن و ڕێژنەی فیشەکیشدا. ئەمانە دیمەنگەلێکی تازەی گەنجانە و داهێنەرانە بوون کە پێشتر لە خۆپیشاندان و ناڕەزایی دەربڕین و ڕاپەڕینەکانماندا نەماندیبوون و بەردەوامیش ڕوویەکی مۆن و گرژیان لەخۆگرتبوو. ڕوویەکی زۆر توورەی دوژمنکارانە کە مەیلی سووتاندنی ئالاو ئاگر بەردانە کتێب و بلاوکراوەو پەلامارداني سەفارەت و هەڵگرتنی دروشمی توندوتیژو هەڕەشەو بەڵێندان بوون.

لە ڕاستیدا، زۆربەی ئەم دیمەنە دزێوانە، بۆ یەکەمجار، تەنیا لە ڕوخساری خودی ڕژێمە سەرکوتکەرو ستەمکارەکان و ڕەفتاری دەزگا ئەمنیەکانی و پیاوە چەقۆکێش و تۆقێنەرەکان و((دەستە ئەمینە!))کانی ئەوانەوە دەرکەوتن نەك لە کەسانی ترەوە.

چرکەساتی کاریزمای ڕاپەڕینی بەهاری عەرەب ئەوەی سەلماند کە هێندە گەشەداربوە توانیویەتی هەموو سیناریۆ ئاسنینەکانی ڕژێم ببەزێنێت کە بەردەوام بانگەشەی بۆدەکرد. سیناریۆکەی ڕژێم کۆمەڵگای لەبەردەم دووڕیانێکی سەختا ڕادەگرت کە ئەلتەرناتیڤیان نییە، وەك: لەلایەکەوە بەردەوام بوون لەسەر ستەمی دەوڵەت و فەرمانڕەوایی سەربازیی و حاڵەتی نائاسایی و مانەوەی دەزگا ئەمنیەکانی ئێستا. یان لە لاکەی ترەوە فەرمانڕەوایی هێزە ئیسلامیە ئوسوڵیە تاریك بینەکان کە دەیانەوێت بەناوی فەرمانڕەوایی خودایی و بەپێی یاسا عورفیە تازەکان کە پێی دەڵێن شەریعەتی ئیسلام و یاسای سزادانە ناسراوەکەی، هەموو مێژووی نوێمان هەڵوەشێنێت. لای سێیەمیش وردوخاش بوونێکی ستوونی تایەفەگەری و مەزەبی و ئەتنی و بەرەیی و عەشایەری و خێلایەتی وڵات و دەوڵەتەکەیە کە لەگەڵ خۆیدا وێرانی و فیتنەو شەڕی ناوخۆ بەرپادەکات.

لە ڕاستیدا، ڕژێمە عەرەبیەکان سیاسەتێکی فێڵبازانەیان لەگەڵ شۆڕشدا بەکارهێنا، لەسەر ئاستی ناوخۆ پشتی بە بەرژەوەندیە تەسك و ڕوخێنەرەکان بەست کە ئامانجی سەرەکیی هەرەس پێهێنانی گشت ئیحتیمال و تواناو ئەلتەرناتیفەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بوو. بەجۆرێك کە گەل تەنیا لەبەردەم ئەو سێ گریمانە دزێوانەی سەرەوەدا ڕابگرێت و هیچ ئیختیارێکی تری نەبێت و ناچاربێت لە هەرسێ خراپەکە چاکەکەیان

هەڵبژێرێت. بەو مانایەی بێدەنگ و ملکەچ بێت و بە هەموو شتەکان قایل بێت بە قێزە ونەکانیشیانەوە. بەڵام برای سەرکردەمان عەقید موعەمەر قەزافی لەوە زیاتر ڕۆیشت و هەڵبژاردنێکی شەمشونیانەی خستە بەردەمی گەل: ((یان من..من..من..و منـــداڵ و خێزانەکەم لە دەسەڵاتدا دەبین، یان پەرستگای نیشتیمانی لیبیا بەسەر هەمووماندا دەڕوخێنم))

ڕاپەڕینی جەماوەریی ئەم سیناریۆ هەڕەشەئامێزەی هـــەر لە ســـەرەتاوە ڕەتکـــردەوە، ئەوەیش بەهۆی ژیاریە شەفافەکەی، هاونیشتیمانیبوونی ڕەهای، وڵات پەروەریە کراوەکەی، مرۆڤایەتیە پڕ لە لێبوردنەکەی و دیموکراتیەتە نەوزادەکەیەوە. هەوڵدان بۆ کاراکردنی ئەم پێش دەستیەو پشتیوانی لێکردنی و تەواوکردنی ڕەگەزەکانی، هەروەها کارکردن بە سروشتی بەهاو خەسڵەت و ئەو ئایدیایانەی لەڕێی پراکتیکی ڕۆژانەوە کە لە چرکەساتی کاریزماییە دەزگاییەکەیدا بەدەستی هێنابوو. هەر ئەوە بەهۆی ئەمانەوە بتوانێت هەواداری دەمارگیری و مەزەبیاتی میللی لە ژێر سایەی مەدەنیەت و نیشتیمان پەروەری کۆمەڵگاکەماندا کۆنترۆڵ بکات. هەر ئەوە بتوانێت جڵـــەوی بگرێت و بیتوێنێتەوە لە ڕێگای ئاراستەکردنێکی نیشـــتمانیانەی باڵاوە. هەر ئەویشـــە بتوانێت مامەڵە لەگـــەڵ دیموکراتیەت و میکانیزمی دەستووریی و هەڵبژاردندا بکات. ئەوەیش بەشێوازێك بێت کە هیچ زۆربەیەکی سیاسی -ئینتخابی هەرچۆنێك بێت، نەتوانێت دیسانەوە لە وڵاتدا دەست بەسەر دەسەڵات و ستەمکاریدا بگرێت. ئەمەیش بەوە دەبێت کە مافی کەمینەی سیاسی -ئینتخابی بپارێزرێت و ڕۆڵی دیموکراتیانەی ئۆپۆزسیۆنی لەناو کۆمەڵگاو دەوڵەتدا هەبێت. لە ئایندەدا مافی ئەوەیشـــی هەبێت لە ڕێگای دیموکراتیەتەوە خۆی بکات بە زۆرینەی فەرمانڕەواییەکەری تازەی وڵات. چونکە ئەو کەسەی وتویەتی زۆربە دەســـت بەکاری سروشتی خۆیەتی، هەرگیز ڕەفتاری زۆردارانە لە خۆی و گەل و دەوڵەت و کەمایەتیەکانیدا ناکات. هەر ئەویشە بتوانێت توانای زیاتر بۆ کۆمەڵگای مەدەنی و هێزو بزاوتی دەستەبەر بکات و ڕێســـا بۆ مامەڵـــە جیاوازەکانی بدۆزێتەوە. هەروەها مکوڕی بکات لەسەر فراوان کردنی مانای مەدەنیەتی دەوڵەت و بێ لایەنی لە دەزگا و پلەو یاساو کارەکاندا. لەوانەیش جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و سەربەخۆیی دەسەڵاتی قەزایی. دەستەبەرکردنی لانی کەمی ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و هاونیشتیمانی و هاوڵاتی بوون و تێکڕای ئازادیە تایبەتی و گشتیەکان لە سەرو هەموویانەوە ئازادیی ویژدان و پڕکردنەوەو بیروباوەڕ دەربڕین و پەرستن.

لەدواییـــدا ئیمانی هاوســـەرم پێـــی وتم ئەگەر شـــکۆمەندیی یەکەم پزیســـکی شۆڕشی یاسەمینی تونس بە محەمەد بوعەزیزی بکەوێت؛ کاتێك ناڕازی بوونەکەی بە سووتاندنی خۆی شکایەوە نەك خەڵکی تر. ئەگەر شکۆمەندیی پزیسکی ڕاپەڕینەکەی میسر لە گۆڕەپان و مەیدانەکاندا بەر خالد ســـەعیدی لاو بکەوێت کە دوای دەســـگیرکردنی لەلایەن دەزگا ئەمنیەکانی میسرەوە لەژێر ئازاردا گیانی لەدەست دا،

ئەوا شـــکۆمەندیی یەکەمین پزیسکی ڕاپەڕینی جەماوەری لە ســـوریا، بێ ســـێ و دوو کردن، بەر ئـــەو لاوانەی شـــاری درعا دەکەوێـــت کە دوای دەســـتگیرکردنیان نینۆکیان دەرهێنـــان و ناولەپیان سووتاندن.

**سەرچاوە:**

منبر الحوار والابداع.

٢٠١١/٥/١٧

# وێنەی دیکتاتۆر لەکۆتاییەکەیدا

نووسینی: عمر قدور
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

دیکتاتۆر ناترسێت، بگرە لە ڕاستیدا ئەو سوکایەتی بەوە دەکات کە ڕوودەدات. لەوانەیە باوەڕ بەوە نەکات کە دەیبینێ یاخود دەیبیستێ، ڕاستتر بە تەواوی باوەڕ ناکات. پێیوایە ئەم نەهامەتییە بە خۆڕاگریو ورەیەکی بەرزەوە تێدەپەڕێنێتو کاتی ئەوە دێت، لێپرسینەوە لەگەڵ چڵکاوخۆرەکانی بکات لەسەر ئەوەی لە سەرکوتکردندا کەمتەرخەم بوون.

(سەرۆك بگەڕێرەوە ئێمە گاڵتەمان لەگەڵ کردی)، ئەوە دروشمێك بوو خۆپیشاندەرێکی میسری، دوای ڕوخانی موبارەك، بەرزی کردبووەوە. دیکتاتۆر بە مانای تەواوی وشە، باوەڕ بەو دروشمە دەکاتو باوەڕ بە ئاماژە گاڵتەجاڕییەکەی ناکات. لە هەموو ئەو دروشمو هاوارانەی باسی (بڕۆ) یان دەکرد، باوەڕ بەو دروشمەی سەرەوە دەکات. هیچ شتێك قەناعەت بە دیکتاتۆرەکان، هەر دیکتاتۆرێك بێت، ناکات کە (ڕەعیەتەکەی) توانا یاخود هێزیان هەیە. چونکە ئەو تەنها بە ملکەچی بینیونی، لەسەر ئەوە ڕاهاتووە ئاپۆرای

**هیچ شتێك قەناعەت بە دیكتاتۆرەكان، هەر دیكتاتۆرێك بێت، ناكات كە (ڕەعیەتەكەی) توانا یاخود هێزیان هەیە. چونكە ئەو تەنها بە ملكەچی بینیونی، لەسەر ئەوە ڕاهاتووە ئاپۆرای جەماوەر تەنها بۆ پیاهەڵدانی ئەو كۆبونەتەوە و ئەمیش لوتبەرزانە لێیان بڕوانێت**


عمر قدور

جەماوەر تەنها بۆ پیاهەڵدانی ئەو كۆبونەتەوەو ئەمیش لوتبەرزانە لێیان بڕوانێت. دیكتاتۆر پێیوایە هەڵەیەك لە مەسەلەكەدا هەیە یاخود موئامەرەیەك لەئارادایە، چونكە بە بڕوای دیكتاتۆر ناكرێتو ناچێتە عەقڵەوە (ئاژاوەگێڕەكان) هەروا لە خۆیانەوە تەحەدای بكەن.

دیكتاتۆر لەسەر تیۆرەی موئامەرە ڕادەوەستێت، چونكە ئەم تیۆرەیە تەواو لەگەڵ لاساریيەكانی خۆیدا دەگونجێت، هەروەها لەگەڵ هێزگەلێكدا ڕووبەڕووی دەكاتەوە كە شایەنی ئەون، نەك لەگەڵ ئەم (پیسوپۆخڵانە) كە داوای ڕوخانی دەكەن: قالۆنچەكان.. ئەسپێ لەسەرەكان. قەزافی وای گوتو لەمەشدا زۆر لەوانی پێشخۆیو دوای خۆشی ڕاشكاوانەتر قسەی كرد. قەزافی حەقیقەتی ناخی خۆی ئاشكرا كردو چەندین ناوو ناتۆرەی ناشرینی گرتە میللەتەكەی كە هەمیشە لە قوڵایی دەرونیدا بووە. میللەتێك لە مێرو یان خشۆك، وەك ئەوەی بەڕێزیان پێیوایە، هیچ پێویست ناكات چاوپۆشییان لێبكەیتو بە مانای تەوای وشە لەناویان نەبەیت، ئەوان زیاتر شایەنی لەناوبردنن نەك ئازادی كە بانگەشەی بۆ دەكەن.

لە تێڕوانینی دیكتاتۆردا، میللەت وەلائی خۆی گۆڕیوە، میللەت ناگاتە ئاستی ئەو بەهایانەی داوای دەكات، كەواتە دیارە میللەت وەلائی خۆی بەخشیوە بە سەرۆكە تازەكان. ئەم سەرۆكانە دروشمەكانیان بەسەردا دەسەپێننو چۆنیان بوێت ئاوا دەیانجوڵێننو بەپێی بەرژەوەندیەكانی خۆیان، نەك بەرژەوەندی میللەت، دەیانهێننو دەیان بەن. لانی كەم میللەت درك بە بەرژەوەندییە ڕاستەقینەكانی خۆی ناكات، بۆیە ناپاكن، ئەمەش دواهەمین پلەیە ئەوانەی لەژێر ڕكێفی ملكەچیدا دەچنە دەرەوە پێیدەگەن. پاداشتی ناپاكیش كوشتنە. كەواتە كوشتن چەند ئاسانە!

وەك ئەوەی هەموو دیكتاتۆرە عەرەبییەكان

له هەمـــان قوتابخانەوە فێربوبـــن، کەچی لەگەڵ ئەوەشـــدا لێکچونی ڕەفتارو هەڵسوکەوتی یەك لە دوای یەکیان، جێگای سەرسوڕمانە. هیچ یەکێکیان ســـود لە وانەی (درس) پێشـــخۆی وەرناگرێت، ڕەنگـــە ئەمە بۆ ئەو متمانـــە کوێرە بگەڕێتەوە کە دیکتاتۆرەکـــە هەیەتیو پێیوایە ئـــەو جیاوازەو لە هاوشـــێوەکانی دیکەی ناچێت. لەوانەشە لە ناخی دڵیەوە گاڵتەیـــان پێ بکاتو بەڵێنـــی ئەوەبدات نمونەیەك لەســـەر خۆڕاگریو مانەوە پێشـــکەش بـــکات، ئەوانی دیکـــە نەیانتوانیوە پێشکەشـــی بکـــەن. بەڵام یەکەم هەنـــگاوی نمونەیی، لەوێوە دەستپێدەکات کە بوونی قەیرانەکە ڕەتدەکاتەوە، لەســـەر شاشـــەی تەلەفزیۆنەکەوە دەردەکەوێو گوتارێك پێشـــکەش دەکات، بـــاوی نەماوەو بۆ زەمەنـــی ڕابـــردوو دەگەڕێتەوە. بـــەزۆر خەندە دروستدەکات یاخود پێدەکەنێت، تاکو خۆڕاگری خۆی لەبەرامبـــەر گومانکاراندا بســـەلمێنێت. لە هەموو ئەوانـــەش گرنگتر ئەوەیە بە هیچ جۆرێك باس لەوە ناکات کـــە لە واقعدا ڕوودەدات. ئەوە گوتاری یەکەمە، گوتاری ڕەتکردنەوەی تەواوەتی لەگەڵ ڕاوەشـــاندنی پەنجەکانی دەســـتی، تاکو بیرمان بخاتەوە ئـــەو خاوەنی مەچەکەو دەیەوێت بە جوڵاندنی دەســـتی، دڵنیایی یاخود گوێپێنەدانی خۆی دەربڕێت.

دیکتاتۆر دوای دەســـتپێکردنی ڕاپەڕینەکان، لەیەکـــەم دەرکەوتنی ئاشـــکرایدا، ڕوخســـاری ئـــەوە دەردەخات چەند دوورە لـــە واقعو چەند بە واقع نامۆیە، وادیـــارە ناتوانێت ئینتیمای بۆ ئەو چرکەساتە هەبێت، بە شێوەیەك دەیبینین کە پێشتر بەو شێوەیە نەمانبینیوە، وێنەیەکی زەردهەڵگەڕاوی زەمەنێکـــی کۆنی بەســـەرچوو. وەك ئەوەی ئەو چەند ڕۆژە کەمەی دوای ڕاپەڕین، حسابی (ڕۆژ) یان بـــۆ نەکرێت، بۆیە هەســـتدەکەین عەیامێکی دوورو درێـــژەو دیکتاتۆریش لە کۆشـــکەکەیدا زەمەنـــە تایبەتەکەی خۆی دەژی، بە هەموو تواناو دەســـەڵاتەکەیەوە دەژی، بێ ئەوەی هەست بەو کـــونو درزانە بکات کە خەریکـــە دایدەڕزێنن‌و بێ ئەوەی هەست بەو جەماوەرە بەرفراوانە بکات کە بۆ هەتاهەتایە لێی جیابونەتەوەو جارێکی دیکە ناگەڕێنەوە. تەنانەت دامودەزگا هەواڵگرییەکانیشی هەســـت بە هەمان نامۆیی دەکەن، لە سەرەتادا وا هەســـتدەکەین ئەو داموودەزگایانە ڕاستی ئەوەی ڕودەدات لـــە دیکتاتـــۆر دەشـــارنەوە، بەمەش دیکتاتـــۆر لـــە ئینکارکردنەوە دەگلێنـــن، بەڵام دواتر هەســـتدەکەین زانیاریو شێوازی مامەڵەی ئـــەو دەزگایانە، تەواو هەڵـــەنو چیتر لە توانایاندا نییـــە دەرك بە مەســـەلەکان بکـــەن. دیکتاتۆرو دارودەســـتەکەی، تەنها ئەوە دەزانن کە ڕاهاتوون لەســـەری بیزانن، ئەو زەمەنە دەناسن کە لە ترسدا نیشـــتەجێیە، تا ژمارەی خۆپیشاندەران زیاتر بێت، دیکتاتۆرو ڕژێمەکەی بۆ ڕابردوو دەگەڕێنەوە.

دیکتاتـــۆر لە گوتاری دووەمیـــدا، هەوڵدەدا بـــە جۆرێك دەرکەوێت وەك ئـــەوەی دەرکی بە قەیرانەکە کردووەو لە پەیامی شـــەقام تێگەشتووە. پاشـــان هەنـــدێ چاکســـازی ڕادەگەیەنێت کە بەســـەرچووە یان لە بنەڕەتدا هیچ کەسێ داوای ئەو جۆرە چاکســـازییەی نەکردووە! دوای ئەوەی دارودەســـتەکەی لـــە میانەی چەنـــد ڕۆژێکدا، بە ئارەزوی خۆیـــان ترسو تۆقاندنو کوشـــتن ئەنجامـــدەدەن، دیکتاتـــۆر دێـــتو زیرەکانـــە

بەرپرســـیارەتیەکە دەخاتـــە ئەســـتۆی کۆمەڵێ فەرمانبـــەری نەشـــارەزای نابەرپرســـیار. لێـــرەدا دیکتاتۆر وێنەکـــەی وەك فەرمانڕەواو وەك پیاوی دەوڵەت لەدەســـتدەداتو لە وێنەی بازرگانێکی بچـــوك نزیك دەبێتـــەوە، بازرگانێـــك خەریکی ئاڵوگۆڕی زۆر بچوکە کە شـــوێنی سەرسوڕمانەو خودی جەستەشـــی لاواز بووە کە ئەویش شوێنی سەرســـوڕمانە. تەنانەت جەســـتەی لەسەر ئاستی فیزیك، گۆڕانی بەرچاوی بەسەردا هاتووە، نازانین ئاخۆ لەژێر قورسایی قەیرانەکە هاتوەتەوەیەكو بۆ نمونە کورتتر بووەتەوە؟ تەندروستی خراپ بووەو چاوی چووە بە قوولا؟ یاخود ئەو هەمیشە وابووە بەلام ئێمە وەك حەقیقەتی خۆی نەمانبینیوە؟

وەلامی ئەو پرســـیارانە هەرچییەك بن، ئەوەی گومانـــی تێدانییە ئەوەیـــە وێنـــەی دیکتاتۆر لە ســـاتەوەختی هەرەســـهێنانیدا، جیاوازە لە وێنەی سالانی دەسەلاتو حوکمڕانییەکەی کە لەسەری ڕاهاتبوین. وێنەکە لە چرکەســـاتی ئاشکرابونیدا، جیاوازییەکەی زۆر لەوە گەورەترە کە پێشبینیمان دەکرد. ئەو وێنەیەی لەســـەر ملهوڕیو دەسەلات بنیاتنرابوو، وا نەماوە. لەو چرکەساتانەداو بە هۆی ڕاهاتنو ترســـێکی قووڵەوە، لەوانەیە دیکتاتۆر بە ڕوخســـارێکی جوانتر لـــەوەی هەیەتی ببینرێتو لەوانەیـــە کراوەتـــر دەرکەوێـــت. ئەگـــەر هەر کەموکوڕییەك وێنەکەی تێکدابێت، ئەوا پاکانەی بۆ دەکات. بگـــرە لەوانەیە ئەو کەموکوڕیانە وەك ئەوەی هەندێ ســـیفەتی نایاب بن، لەقەڵەمدەدات کە تەنها ئـــەو هەیەتیو ئەوانی دیکە نیانە. هەموو ئەوانە تایبەتن بـــە زەمەنـــی دیکتاتۆریەتەوە کە هـــەر هێندەی تێمـــان پەڕاند، وێنـــەی دیکتاتۆر بەبـــێ دیکتاتۆریەت دەبینین، وێنەیەك لە زەمەنێك دەپاڕێتەوە کە بەسەرچووەو چیتر وەك وێنەیەکی گاڵتەئامێزی کاریکاتۆری دەمێنێتەوە، وێنەیەك هیچ بوونێکی نەماوە.

دیکتاتۆر لـــە زەمەنی هەرســـهێنانیدا، ڕۆڵی دیکتاتـــۆر دەبینێـــتو ناتوانێت وێنـــە کۆنەکەی کۆبکاتـــەوەو ناتوانێـــت وەك خەڵکانـــی دیکە ببێتە کەســـێکی لاوازو ســـادە. ئەو مەحکومە بەو میراتەی کە هەیەتیو لەناکاو نایمێنێت. لەبەر ئەوە هەڵەیە پێشـــبینی ئەوە بکەیـــن وێنەیەکی جیاواز لەو وێنەیەی کە پێشـــتر هەیبووە ببینین. بەلام ئەم گریمانەیە ئەوە ڕەتناکاتەوە کە ســـتمگەری بگاتە قۆناغێکی کوێرو کەڕ کە تێیدا ستەمکار هەموو لۆژیکێك تێدەپەڕێنێـــت، ئیدی تەنها خۆی دیلی ستەمکارییەکەی دەبێت.

لە ڕاســـتیدا ئەوەی لە ڕەوتی خۆپیشـــاندانە عەرەبییەکانـــدا تاکو ئێســـتا بینیومانە، یەك جۆری داخـــراو لـــە دیکتاتۆریەت نیشـــاندەدات، بۆیە چرکەســـاتی هەرەســـهێنانەکانیش یەك جۆر وێنە دەردەخات. گـــەر بە خەیاڵماندا هات بپرســـین: ئەگەر خۆپیشـــاندانێکی تازەی عەرەبی بەرپابێت، ئایـــا فەرمانڕەواکە هەر لە ســـەرەتاوە لە وانەکە تێدەگات، تێدەگات کە سەرەتاکە کۆتاییەکەیە؟ تا ئێستا وەلامی ڕاست ئەمەیە: نەخێر.

**سەرچاوە:**

الاوان، یەکشەممە ١٩ حوزەیران ٢٠١١
**http://www.alawan.org**

# دوای ڕاپەڕین

نووسینی: کێنان مالیک
و. لە سویدییەوە: دەزگای مەریوانی

ئایندەی میسر دوای موبارەك لە واشینتۆن، لۆندۆن یان بریسل یەکلاناکرێتەوە. کێنان مالیك**Kenan Malik** مەترسی سازشکردنێکی نهێنی لە پشتی خۆنیشاندەرانەوە و بێ بەشداری ئەوان دەبینێت.

چۆن دەکرێت سەرۆك کۆماری میسر حوسنی موبارەك وازبێنێت بێ ئەوەی فەوزایەکی بەرفراوان بەرپابێت یان دەروازە بۆ ئەخوان ئەلموسلیمین نەخرێتە سەر گازی پشت؟

پرسیارێکە فرەگەلێك لە سەرۆکانی ڕۆژئاوا ئائێستا دەستەوئێخەی بوونەتەوە. دیدەنیگایەکی هاوبەش، کە خەریکە تەشەنە دەسێنێت، پێدەچێت وا بەباشی بزانن ئەوەی میسر پێداویستێتی، بە گوتەی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا هیللەری کلینتۆن، «ڕاگوێزانێکی مونەزەم» بێت بەرەو پۆست-موبارەك-میسر و جێگری سەرۆك کۆماریش عومەر سولەیمان بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆی.

بیرۆکەی ڕاگوێزانێکی مونەزم کە موبارەك

**دیكتاتۆریه‌تی توندڕه‌وی موباره‌ك 30 ساڵانی ره‌به‌قه بێ قه‌ید و شه‌رت كۆمه‌كی ده‌كرێت، ئیدی پێویست ناكات باسی ئه‌و هه‌موو حه‌مكه چه‌كی پاره چه‌ورانه‌ی حوكومه‌تانی ئاوروپایی و ئامریكا بكه‌ین.**

دووربخاتــەوە بێ ئــەوەی بەناچاری پێویســت بکات پەنــا ببرێتە بەر توندوتیژی ناپێویســت و بڵاوبوونــەوەی فەوزا کارێکە وادێتە بەر گوێیان کە هەقە گشتمان پێشــوازی لێبکەین. لێ دەبێت ئێمە بەگومانەوە لەو پێشنیارانەی کە لە واشینتۆن، لۆندۆن و بریســلەوە دەردەچن بڕوانین — لانیکەم نــەك تەنیا لەبەر ئەوەی لە واشــینتۆن، لۆندۆن و بریسلەوە دێن بەڵکو چونکی لە قاهیرەوە نایەن.

پرسیارێك کە لەبەردەم بیرۆکەی راگوێزانی مونەزەم خۆی قوتدەکاتەوە ئەوەیە:

داخۆ راپەڕینگەلێك کە لەســەر شــەقام و مەیدانانــی قاهیــرەوە بەرپایە لــە بەرژەوەندی و خزمەتی کێدایە؟ رۆژئاوا؟ یاخود خەڵکانی میسر؟ ئەم دوو بەرژەوەندیە بە حوکمی پێویست یەکانگیر نین. هەر لەبەر ئــەوەی کە ئەم دوو بەرژەوەندیە هەرگیز یەکانگیر نین بۆیــە ملۆنانگەلێك مەردم لەو هەفتانەی دواییدا شەقامەکانی قاهیرە، سوێز و چەندەها شوێنگەلی تریان گرتوە.

دیکتاتۆریەتی توندڕەوی موبارەك ٣٠ ساڵانی رەبەقە بێ قەیدو شەرت کۆمەکی دەکرێت، ئیدی پێویســت ناکات باسی ئەو هەموو حەمکە چەکی پارە چەورانەی حوکومەتانی ئاوروپایی و ئامریکا بکەین.

ســەرۆکانی ئاوروپــا چاویــان لەهەمبــەر رەتکردنەوەی موتڵەقی موبــارەك بۆ هەڵبژاردنی گشتی ئازادو بێ فڕوڵ فێڵ، یاساخکردنی پارت و رێکخرای سیاسی و دەوڵەتێکی پۆلیسی چەوسێنەر لە ژێر دەسەڵاتی ئەودا دەقوچان — بۆ؟ چونکی ئەو «ســەقامگیری»، بە قەولی وان سازدەکرد، گەمەی لەتەك بزوتنــەوە رادیکاڵەکاندا دەکرد تا نەکرێت لە شوێن خۆیان ببزوێن، جا چ سێکۆلارەکان یان ئیسلامیستەکان بانایا، بەرقەرارگرتنی ئاشتی لەتەك ئیسرائیلدا و کۆمەککردنی ئەمەریکا تا سووربێت لەسەر سیاسەتی خۆی کە لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا

گرتویەتەبەر.

تەمەنـــای ســـەقامگیریە زیاتـــر وەك لـــە دیموکراتیزەکـــردن کـــە وا دەکات ســـەرکردە رۆژئاواییـــەکان جڵەوی متمانـــەی خۆیان بدەنە دەســـت ســـولەیمان. وەك بەڕێوەبەرێکی پێشوی دەزگای ئاسایش، لێ بەڕێوەبەرێکی فرە ترسێنەرو تۆقێنەری ئـــەو دەزگایە، ماوەیەکـــی دوورودرێژ ســـولەیمان گرێبەندی رژێمی موبـــارەك بووە بە حوکومەتە جیاوازەکانی USAـ وە.

ئـــەو پیاوی هـــەرە ســـەرەکی CIA بووە لە قاهیرەو بەرپرســـی ســـەرەکی رێکخستنی بڕیارە نائاساییەکانی USA بووە لە کێشەی رادەستکردن و ناردندا کە لە سایەیدا CIA بۆی دەرەخسا ئەوانەی گومانی تیرۆریســـتیان لێدەکرا لە سەرانســـەری دونیادا قۆڵبەســـت بکـــەن و بیاننێرنە میســـر یان ولاتانگەلێکی تر تا لێپێچینەوەیان لەتەکدا بکرێت و ئەشکەنجەبدرێن.

ئـــەودەم کەســـێکی وەك ســـولەیمان ئاغا لە «راگوێزانی مونەزەم» تێڕادەمێنێ، دیموکراتیزەکردن دوا شتێکە کە خەیاڵی ئەو تەی بکات.

بنەمـــای داخوازی راگوێزانـــی مونەزەم لەو ترســـەدا خـــۆی دەبینێتەوە کە بۆشـــاییگەلێك - دەســـەڵات دوای موبارەك رووبـــەڕی دەبێتەوە - نەکا هەلێك بڕەخسێنێ ئیخوان ئەلموسلیمین تێیدا دەسەڵات بۆخۆیان بقۆزنەوە. لێ USA ئەزموونێکی درێژی لە سەروسەوداکردنی ئیخوان ئەلموسلیمیندا هەیە بە شێوازگەلێك بۆ ئەوان لەباربێت.

بـــە گوتەی مێژونووســـی ئامریکای باکور ئیان یۆهانســـۆن Ian Johanson، سی ئای ئەی CIA لە ٥٠ـ و ٦٠ـــەکاندا پشتیوانی لە سەرکردەی ئیخوان ســـەعید رەمەزان دەکرد (بابی موسوڵمانی سویســـری تاریق رەمەزان) تا مزگەوتەکان بخاتە ژێر دەســـەڵاتی خـــۆی، چونکی ئەویـــان وەك سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتووی ئەنتی کۆمۆنیست تەماشا دەکرد.

ئیتـــر پێشـــهاتی ١١ ســـەپتەمبەریش دێتـــە گۆڕێ، یۆهانســـۆن دەنوســـێت، «بەڕێوەبەرایەتی بوش ســـتراتیژیەکی وایان سازکرد کە بەگوێرەی پەیوەندیەکی چڕوپڕ لەتەك ئەو گروپە موسڵمانانەی ئەوروپا کە لە رووی ئایدۆلۆژیەوە نزیکی ئیخوان بوون دابمەزرێنن، بـــە ئومێدی ئەوەی بەڵکو ببێتە سەرتۆپی گفتوگۆ لەتەك گروپی رادیکاڵتردا».

ســـەرکردەکانی میســـریش شـــوێن پێـــی ســـتراتیژیەتێکی ئا لەو جۆرەیان گرتووە کاتێك هەم بێ بەزەییانە ئیسلامیستەکانیان دەچەوساندەوە و هەم لەژێریشـــەوە (هەندێجار بەئاشکراو ئاوەڵا) ئەوانیان لـــە ئامێزگرتووە تا بزوتنـــەوە رادیکاڵە ســـەکولێرەکانیان پـــێ کەناربخـــەن. جەمـــال عەبدولناســـر لـــە ٥٠ـ و ٦٠ـــەکانـــدا بەهەزاران ئیخوان ئەلموسلیمینی لە زیندان ناو سەید قوتوب کە سەرکردەی ئەوان بوو لە سێدارەدا.

ئەنـــوەر ســـاداتیش، کاتێك شـــوێن جەمال عەبدولناســـری گرتەوە لـــە ٧٠ـکاندا، خۆی لە ئیخـــوان نزیك کـــردەوە، ئەندامەکانی ئەوانی لە زیندان ئازادکرد و هانیـــدان خۆیان تەیارو جەم بکـــەن دژی چەپیزمێـــك کە ئـــەو وەك دوژمنی راستەقینەی خۆی دەیناســـین، کەچی خۆشی لە دواییدا بە دەستی ئیسلامیستێك لە ١٩٨١ دا کوژرا.

موبـــارەك کـــە شـــوێنی ســـاداتی گرتەوە باڵانســـی نێوان چەوســـاندنەوەو هاریکاریکردنی

ئیخوانی راگرتووە بەوەی کاتێك رێکخراوەکەیان یاساخکراوەو فرەگەلێکی سەرکردەکانیانی لە زیندان ناوە - بەڵام ئەمە رێگرنەبوە لەوەی کە وجودیان لە قوژبنێکی کەنارو نادیاردا هەبێ و ئەودەم پێویستیش بووبێت بەرەڵایانی کردون تا بنیشنە سەر گیانی رادیکاڵە سێکولاریستەکان.

ئاکامی سیاسەتێکی ئا لەوجۆرە ئیخوانی بەهێزکردووە، بەتایبەتی کاتێك دەزگای چاودێری موبارەك سەرنەکوتوە لەوەی پەل بۆ مزگەوتەکان بهاوێت.

هەر بۆیە مزگەوتەکان بوونەتە سەنتەرگەلێك بۆ چالاکی سیاسی و خودی ئیسلام بۆتە زمانی بەرگری تێیاندا.

وەلێ هاوکات چۆن ئیسلام رەگو ریشەیەکی بەهێزی لە کۆمەڵگای میسردا هەیە لیبرپالیزمیش بەهەمان شێوە. لەسەرەتای چەرخی ١٨٠٠ —دەوە بزوتنەوەی بەهێزی سەکولاریسم و مۆدێرنیتێت هەبوون. هەر لەم زەمینگەلەدایە کە ناسر تین و گوڕی خۆی دەهێنێت، هەرچەندە بە شێوەیەکی دیکتاتۆری حوکمی دەکرد. هەر لە هەمان زەمینگەلە مێژووەوەیە ئەم راپەڕینەی ئێستاش تین و گوڕی خۆی دێنێت.

**"بەڕێوەبەرایەتی بوش ستراتیژیەکی وایان سازکرد کە بەگوێرەی پەیوەندیەکی چڕوپڕ لەتەك ئەو گروپە موسڵمانانەی ئەوروپا کە لە رووی ئایدۆلۆژیەوە نزیکی ئیخوان بوون دابمەزرێنن، بە ئومێدی ئەوەی بەڵکو ببێتە سەرتۆپی گفتوگۆ لەتەك گروپی رادیکاڵتردا"**

میسر ترادیسۆنێکی بەهێزیشی لە بزوتنەوەی کرێکاراندا هەیە. راپەڕینە میللیەکانی ساڵانی دوایی بەبارتەقای بەهێزیی راپەڕینی حاڵیحازر بوون — ١٩٧٧ سەندیکاکان ملیۆنان مرۆڤیان تەیارو ئامادەکرد تا برژێنە سەر شەقامەکان کاتێك سادات کۆمەکی ماددی دەوڵەتی لە نرخی نان بڕی. دوای دەیانگەلێك لە چەوساندنەوەو راونان بزوتنەوەی کرێکارانی ئێستاش هێندەی بەبەرەوە ماوە بێتە وەڵام.

«پاش ١٩٩٨»، مێژونووس جۆل بێینین **Joel Beinin** سەرنجی خۆی لەمەڕ رووداوەکان رێنوسدەکات، کە « شەپۆلێکی زۆری مانگرتن هاتوونەتە گۆڕێ، مانگرتنی دانیشتن، خۆنیشاندان و چەندەها دەرکەوتی ناڕەزایی لە نێوان کرێکاراندا دەرکەوتووە« کە تێیاندا « زیاد لە دوو ملیۆن کرێکار بەشداریکردووەو زیاد لە ٣٠٠٠ شێوەی جیاوازی دەرکەوتی ناڕەزایی هەرەوەزی/ کۆلەکتیڤی لەخۆ گرتووە«.

راپەڕینی مەیدانی تەحریر هەروەك ئیخوانی، ئاواش قاهیرەو واشینتۆنی لە شیرینی خەو راپەڕاند. لە سەرەتاوە دژی راپەڕین بوون، تا دوایی کە بینیان و زانیان نەخێر راپەڕین گەردنی نەوی ناکات تا سەرکوت بکرێت ئەوجا

ناچار ملیانداو پشـــتیوانیان لێکرد، ئێستاش تا بۆیان بلوێت دەیانەوێت جڵەوی بگرن و لەدەستی نەدەن.
ترســـی گەورە لەکن خۆنیشاندەران ترس نییە لەوەی ئیسلامیســـتەکان لەو بۆشایی سیاسیەدا کە بەدوای کەوتنی موبارەکدا دێتەگۆڕێ دەســـەڵات بگرنە دەست و میسر بەرەو تیۆکراتی بەرن، بەڵکو ترســـە لەوەی ئیسلامیســـتەکان لەتەك سولەیمان ئاغادا و لە ژێر چاودێری راســـتەوخۆی واشینتۆندا سازشـــێك بکەن ئیدی ئا بەوجـــۆرە رادیکاڵترین داخوازیەکانی خۆنیشـــاندەران تـــوڕدەن بە ناوی «راگوێزانێکی مونەزم» و — رێکەوتن- سازشێك کە میلیتێرەکان/ لەشکرتارەکان کە چالاکانە هەر لە کۆدێتاکەی ناســـری ١٩٥٢ حوکمی میســـریان کـــردوە، ئیدامە بەدەســـەڵاتیان لە پشـــتی پەردەو کەوالیسەکانەوە بدەن.
جا گەر مێژووی تەواوی لایەنە سیاســـیەکان بەهەند وەربگرین — حوکمی لەشکرگری، ئیخوان ئەلموســـلمین و **USA** — و ئەمـــە وێڕای ئەو ١،٣ میلیـــاردە دۆلارەی کە میلیتارەکان لە واشـــینتۆن وەریدەگرن، ئەم ترسە حەتمەن بێ ڕیشە نیە.
هـــەروەك فەرید زەکریا، بـــۆ نمونە لە **Time** و **Newsweek**-دا دەنوســـێت، ئاماژەی پێداوە کە ترسی راستەقینە ئەوە نییە میسر ببێتە ئێرانێکی نوێ بەڵکو ببێتە پاکســـتانێکی تـــر: « بەڕواڵەت کۆلکە دیموکراتی و دەسەڵاتی راستەقینەش لە راستیدا لە کن ژەنەڕاڵەکان کە لە باگراوندی بەڕواڵەت زڕکە دیموکراتیەکەدا دانیشتون و حوکمدەکەن».
فرەگەلێـــك بە ئومێـــدی راگوێزانێکن بەرەو دیموکراتیزەکردنی میســـر کە تێیـــدا تا بکرێت کەمترین توندوتیژی بەکاربهێنرێت و خوێنبڕژرێت.



لێ ئەمکارە پابەندی سیاســـەتمەدارانی واشینتۆن، لۆنـــدۆن یان بریســـل نییە تـــا هەلومەرجی چۆن سەردەگرێت یان چۆن دەکەوێتەوە دابنێن.
کارێکـــی ئا لەو جۆرە موڵکی میســـریەکان خۆیانە. خۆ گەر بۆیان نەچێتەســـەر، ئەودەم دەبینە شایەدحاڵی توندوتیژیەکی راستەقینە، خوێنڕژان و جۆرەها نیگەرانی تر.

**کێنان مالیك**

• نوســـەرێکی بەریتانیـــە، بەڕەچەڵـــەك هیندزادەیە لە نێوەڕاســـتی ٦٠ـــکاندا هاتۆتە دونیاوە، ئێســـتا نیشـــینگەی ئەمریکایەو بۆ فرەگەلێك گۆڤارو رۆژنامە دەنوسێت، پەخشی یەکەمی ١٠ فابریوەری ٢٠١١.

**سەرچاوە:**

**Efter revolten**
**kenan Malik**
**www.expressen.se**

# شۆڕشی عەرەب و ئاسۆ ترسناکەکان

نووسینی: مونسیف ئەلمەرزوقی
و. لە عەرەبییەوە: فەرهاد

. لە سەرەتاوە خاڵێکی یاسایی: کەسانێك زاراوەی(شۆڕشەکانی عەرەب) بەکاردەهێنن کە نادروستە. دەبێت تەنیا قسە لەسەر یەك شۆڕشی عەرەبی بکرێت. واتا زاراوەکە لە کۆوە بکرێت بە تاك: لەبەرئەوەی:

ـ هۆکارەکانی شۆڕش یەکێکن کە بریتین لە زاڵبوون و دەسەڵات پەیداکردنی تاك و بەرەوا دانانی گەندەڵیەکانی. فەرمانڕەوایی دەزگاکانی پۆلیس، تەرخان کردنی دەزگاکانی دەوڵەت بۆ ڕاژەی تاك و چەتەکان لە بری ڕاژە بە نیشتمان و گەل.

ـ ئامانجەکانی شۆڕش یەکێکن. لەبەرئەوەی کەس داوای دامەزراندنی دەوڵەتی کرێکارو جوتیار یان خەلافەت ناکات. بەڵکو هەموو گەلی عەرەب لەسەر ئەو دروشمە کۆکن کە لە تونس و سەنعاو مەنامەو قاهیرەو بەنگازی بەرزکراوەتەوە((گەل داوای ڕووخانی سیستەمەکە دەکات)) هەروەها پێکهێنانی ئەنجومەنێکی دامەزراندن کە دەستەبەری دروستکردنی

**ئایا ئەزموونی ئەو گەلانەی کە لەپێش ئێمەدا شۆڕشیان کردوە، دەست گیرۆیی ئەوەمان دەکات بزانین شۆڕشی عەرەب چی بەسەردێت؟ کێشەکە لەوەدایە کە ئەم ئەزموونانە گەشبینیمان پێ نابەخشن، بەڵکو وێنای ئایندەیەکی زۆر تاریکمان دەدەنێ ڕەنگە لەوانەی کە چەشتوومانە سەخت و ترسناکتر بێت.**

دەوڵەتێکی شارستانی و کۆمەڵگایەکی ئازاد بێت و هیچ پردێك لە نێوان خۆی و سەپاندنی دەسەلاتدا نەهێڵێتەوە.

ـ هەمــوو هۆکارەکانــی شــۆڕش یەکێکن، ڕاپەڕینێکــی ئاشــتیانە ئەگەرچــی ڕووبەڕووی فیشەکی تاوانباران کرایەوە.

ـ سروشــتی شۆڕشــەکە یەکێکە: شۆڕشێکی میللــی، شارســتانی، گەنجانــە، بــێ ئــەوەی ســەرۆکایەتێکی مەرکــەزی و ئایدۆلۆژیەتێکی هەبێت.

لەبەردەم ئەم ناوکۆییە هاوبەشانەدا چ گرنگیەك بۆ جیاوازیە هەرە سووکەڵەکان نامێنێتەوە.

کەواتە با ئەو کەسانە واز لە زاراوەی شۆڕشەکانی عەرەب بهێنن، مەسەلەکە یان هەڵەیەکی بەدەست ئانقەست نەکراوەو چاك دەکرێت، یان هەڵوێست و داکۆکی کردنێکی هۆشیارانەیە بۆ دابەشکردنی عەرەب تەنانەت لەسەر ئاســتی ناوهێنانیشی وەك ئــەوەی ئەمریکییەکان ئەنجامــی دەدەن. کاتێك ڕەفزی بوونی عەرەب دەکات و وەك (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاســت) و((باکــووری ئەفریقــا)) مامەڵەی دەکات.

یەکەمین پرســیار: تەنانەت ئەگەر شۆڕشەکە تا نووسینی ئەم دەقە سێیەکی نەتەوەی عەرەبیشی نەگرتبێتەوە کەواتە: بەرەو کوێ دەچێت؟

لەمەودای کــورت و ناوەندو دووردا ڕووی لە کوێیە؟

دەشــێت وای دابنێیــن کە ئاســەوارەکەی بڵاوبوونەوەی شۆڕش بێت لە دەرەوەی سنووری وڵاتانی عەرەبدا. تووڕەیی ئــەم ڕۆژانەی وڵاتی چینیــش بەڵگەی فراوان بوونی شۆڕشــەکەیە بۆ شوێنگەلێك کە چاوەڕێ ناکرێت.

بەڵام گومان لەوەدا نییــە کە هەموو وڵاتانی عەرەبی دەگرێتەوە. ئەگەر کەسێکیش لە مەغریب و ســعودیەو ســوریاو جەزائیــر بیەوێت خۆی

بەوە بخەڵەتێنێت کە ڕژێمگەلێکی ســـەقامگیرن. دەبێت ئەوە لەیادنەکات کـــە ڕژێمەکانی تونس و میســـرو لیبیایش سەقامگیربوون. ژنە فەیلەسوفی ئەڵمانی هانا ئارینت ڕاســـت دەکات کە دەڵێت: تایبەتمەندیی دیکتاتۆریـــەت لەوەدایە کە تا دوا چارەکی ســـەعاتی کۆتایـــی وا دەزانێت هەموو شتێك هێورو لەسەرخۆیە.

لە ڕاستیدا ئێمە لە سەرنشینانی کەشتییەکی هێمن دەچین بەســـەر زۆنگاوێکی بۆگەنەوە کە لەپڕێکا کەشتیەکە ڕووبەڕووی زریانێکی دزێوبێتەوە. لەو چرکەســـاتەدا کەس ناتوانێت پێشبینی ئەوە بکات کـــە ئاخۆ ئێمە هەمووومان نقوم دەبین یان دەگەینە کەناری ڕزگاربوون، ئەوەیش نازانین کە سروشتی کەنارەکە چۆنە!

ئایا ئەزموونی ئەو گەلانەی کە لەپێش ئێمەدا شۆڕشیان کردوە، دەست گیرۆیی ئەوەمان دەکات بزانین شۆڕشی عەرەب چی بەسەردێت؟ کێشەکە لەوەدایـــە کە ئـــەم ئەزموونانە گەشـــبینیمان پێ نابەخشن، بەڵکو وێنای ئایندەیەکی زۆر تاریکمان دەدەنێ ڕەنگە لەوانەی کە چەشتوومانە سەخت و ترسناکتر بێت.

با باس لـــە هەندێك لەو شۆڕشـــانەی مێژوو بکەیـــن بەڵکوو بیانکەین بە ڕێســـایەك. هەندێك جـــار ماوەیەکی زۆری دەوێت شـــۆڕش بتوانێت ئامانجەکانـــی بهێنێتەدی، ئەگـــەر بتوانێت بەدی بهێنێت:

ئامانج لە شۆڕشـــی فەرەنســـی ســـاڵی ١٧٨٩ بنیاتنانـــی کۆمەڵگایەکـــی برایەتـــی و ئازادی و یەکســـانی بوو. واتا بنیاتنانی سیستمی کۆماری و دیموکراتی. کەچی چوارساڵ تێپەڕی پێش ئەوەی پاشایەتی نەهێڵن. پاشان لەڕێی ناپلیونەوە کە ساڵی ١٨٠٤ نەك بە پاشـــا بەڵکوو خۆی بـــە ئیمپراتۆر ناوزەدکـــرد، دیکتاتۆریەت ســـەری هەڵدایەوە. دوای ئەویش لە ســـاڵی ١٨١٤ دیســـانەوە ڕژێمی پاشـــایەتی لەڕێی لویسی هەژدەوە هاتەوە گۆڕێ. دوای ئەویش شـــارلی دەیەم لە ساڵی ١٨٢٤ هات کە ســـاڵی ١٨٤٨ شۆڕشی بەســـەردا کرا. لەگەڵ ئەمەیشدا جارێکی تر دیکتاتوریەت ساڵی ١٨٥٢ لە بەرگی ناپلیونی سێیەمدا گەڕایەوە. ئیتر ڕژێمی کۆماری تا ساڵی ١٨٧٠ دروست نەبووەوە کاتێك لە شەڕی دژی پروسیادا تووشی شکست هات. مانای وایە بەدی هاتنی ئامانجەکانی شۆڕشـــی فەرەنسا نزیکەی سەدەیەکی خایاند. ئەمە ئاوارتە نیە بەڵکو یاســـایە، ڕەنگە جیاوازیی لە ماوەی هەڵکشـــان و داکشانەکەدا هەبێت.

### هیچ شۆڕشێك بێ دژە شۆڕش نییە

ئەوانەی دەســـتەڵات لەدەست دەدەن نە دەبن بە هەڵم و نە وەك شـــەکریش لە ئاودا دەتوێنەوە. بەڵکـــوو ئەچنە پشـــت پەردەی پیـــلان گێڕانەوە تـــا ئەو سیســـتمەی لای بـــردون ئەوانیش هەڵی بگێڕنەوە و لەنـــاوی بەرن. ئەگەر ئەوەیان نەتوانی هەمـــوو هەوڵێکیان دەخەنە گەڕ بۆ ئەوەی ڕەوتی شۆڕشەکە بشێوێنن یان لای بدەن. بەتەواویی ئەمە لە تونسدا دەبینین. پاشماوەی مافیاکانی ڕژێمی بن عەلی هاوکاریی پاشـــماوەکانی پۆلیسی سیاسی و پارتە لەکارخراوەکەی جـــاران دەکەن بۆ ئەوەی ئاڵـــۆزی و توندو تیژی لە وڵاتدا بڵاوبکەنەوە. بەو هیوایە کە نائومێدی و پەشیمانی لە دڵی خەڵکیدا بچێنن و خۆزگە بەو ســـەردەمی ئاشتییە بخوازن کە لـــە ســـەردەمی دەوڵەتی پۆلیســـدا هەیانبوو.

بێگومان قێزەونترین دوژمن ئەو کەسانەن کە لە دواچرکەساتدا پەیوەندیی بە شۆڕشەوە دەکەن بۆ ئەوەی لە ناوەوەدا بەرهەڵستی بکەن و ناوەرۆکەکەی بەتاڵ بکەنەوە. ئەوانە دەردی بێ دەرمانن.

**شۆڕش باجی گەورەی هەیە**

بێجگە لەو هێزە ڕوخێنەرەی شۆڕشی چەواشە دەیجوڵێنێت. لەناو خودی شۆڕشا هێزی کاریگەر هەن ڕەوتی شۆڕش بەرەو پشێوی و توندوتیژی و ناسەقامگیری دەبات. لەسەر شۆڕشگێران پێویستە بە گیوتین و سێدارەو زیندان ڕووبەڕووی ئەو دوژمنانە ببنەوە. لەو کاتەدا شێوازە دۆزەخیەکەی دەمکوتکردنی سیاسی لەگەڵ هەموو ئەو تەشەنەکردنە کلاسیکیەکەدا کەلەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت سەرهەڵدەداتەوە. یەکەم بەرهەمیش ئابڵوقەدانی خودی شۆڕشگێڕەکانە.

شۆڕشی فەرەنسیی، لە قۆناغێکی زۆر ترسناکدا، هەزاران کەسی تیا سەربڕا. پاشان سەری ئەوانەیان بڕی کە سەری کەسانی پێش خۆیان بڕیبوو. لە هەرە بەناوبانگەکانیان روبسپیرو دانتونە. ئەمە نەفرەتی ئەو پشیلەیەیە کە بەچکەکانی خۆی دەخوات. هەروەها داواکاریە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان، ئەوانەی لە سەردەمی زوڵم و ستەمدا نەهاتبوونەدی، دەتەقنەوە. داواکاریەکن مەحاڵە هیچ سیستمێکی سیاسی بتوانێت بەدی بێنێت. ئەمە لەکاتێکدایە کە خەونە شەخسی و بەرەیی و پارتایەتی ـ ڕەوا و نارەوایان ـ بە سەختی دێنە گۆڕێ و ململانێ شەریف و ناشەریفەکانیش لەسەردەسەڵات دەتەقنەوە.

**شۆڕشگێر بەرهەمی شۆڕش ناچێنێتەوە**

لەدوای شۆڕگێڕانەوە ئینجا قۆناغی دووفاقەکان( ئینتیهازی)ە. لەدوای داستانەوە قۆناغی نائومێدیە. هەژاری گەڕەکە هەژارنشینەکان دەگەڕێنەوە لای هەژارییەکەیان. دانیشتووی گۆڕستانەکانیش دەچنەوە ناو گۆڕەکانیان. هیچ چارەیەکی بنەڕەتیی بۆ کێشەکانیان نەکراوە، بەڵکوو بەڵێنی زۆریان پێ دراوە کە دەشێ بێنەدی یا نا. بەڵام ئەوەی تاڵانی گەورەکەی بەردەکەوێت

**شۆڕشی فەرەنسیی، لە قۆناغێکی زۆر ترسناکدا، هەزاران کەسی تیا سەربڕا. پاشان سەری ئەوانەیان بڕی کە سەری کەسانی پێش خۆیان بڕیبوو. لە هەرە بەناوبانگەکانیان روبسپیرو دانتونە. ئەمە نەفرەتی ئەو پشیلەیەیە کە بەچکەکانی خۆی دەخوات**

بورژوازیەتە، ئەوەی لە سەردەمی ڕابووردویشدا هەر لە خۆشیداو ئاستی ژیانی ماقووڵ بووە. بەڵام لە سەردەمی زوڵم و ستەمی دەسەڵاتدا کە سەرکوتی ئازادی کراوەو گەندەڵیی بڵاوبۆتەوە ژیانی ئەوانیشی ژەهراوی کردوە. نیشتمان لە زۆر و ستەم ڕزگاری بووە، ئێستا بۆرژوازیەت دەڵێت ڕزگاربوونەکە بەهۆی ئەو قوربانیانەوە بووە کە هەژارو بێ نەوەکان داویانە و ئەوانیش لە پاڵ مافە ئابوری و کۆمەڵایەتیەکەیاندا مافی سیاسیشیان

بـــۆ گەڕاوەتەوە کە جاران لێیـــان قەدەغەکرابوو. لە کاتێکدا خـــودی چینە هەژارەکان تەنیا ئازادی سیاسیان دەست کەوتوە کە نە قەڵەویان دەکات و نە برسیەتیەکەیان دەڕەوێنێتەوە.

ڕەنگە یەکێك بپرسێت((ئەی چار چیە؟)) ئایا دەبێت ئێمە سەدەیەك چاوەڕێ بین بۆ بەدی هاتنی ئامانجەکانی شۆڕش، ســـەدەیەکی پڕ لە ئاژاوەو توندوتیژی و نائومێـــدی، دەرفەت هێنانی زێڕینی زیاتری دووفاقەکانیش؟

ســـەرکۆنەم مەکە، ئەمە خوێندنـــەوەی نیوە بەتاڵەکەی پێکەکەیە. بـــۆ بەرزکردنەوەی ورە با خوێندنەوەیەك بۆ نیـــوە پڕەکەی بکەین. ئەویش سێ دەستکەوتی گەورەیە بۆ شۆڕشی عەرەب.

یەکەم دەستکەوتی گەورە: دروستکردنەوەیەکی تری ئینســـانی عەرەبی، کـــە لەپڕێکداو بێ هیچ پێشـــەکیەك دابڕان لەگەڵ قۆناغێکدا دروست بوو کە مرۆڤی عەرەب تیایدا مێگەلی شـــوانێك بوو. دەشێت یەکێك بپرسێت: ئەی ئەو عەرەبە ترسنۆك و بێ توانـــاو داماوە چی بەســـەرهات؟ ئەی ئەم لاوە شۆڕشگێڕو ئازاو سەرکێشە لە کوێوە هات؟ لەوانەیە وەڵامەکە ئەوەبێت کە ســـەرکوتکردن و گەندەڵی و ســـووکایەتی پێکردن و ساختەکاریی ڕژێمـــە کـــە گیانێکی پێداگریانـــەی وجودی لە مرۆڤی عەرەبیدا دروست کردبێت: من هەم یا نیم، بڕیاریدا ببێت. لەبەر هاوسەنگیی هێزەکانیش بڕیاری دابوو ڕۆژگارێك بێدەنگـــی هەڵبژێرێت، بەڵام بە بیرکردنەوەو چاودێریکردنی ئەو چرکە ســـاتەی پەلاماری جەلادەکانی دەدات. دیارە گەوجەکان ئـــەم چاوەڕوانیە درێژەیان بە سەرشـــۆڕکردن و خۆ بەدەســـتەوەدان دادەنا. بـــەڵام با حاکمەکانی عەرەب، ئەوانەی تا ئێستا گیرۆدەی ئەقڵی کۆنن، ئەوانەیش کە لەمەودوا دێن، ئەو ڕاستیە بزانن کە ئێستا لە بەرانبەریاندا مرۆڤێکی نوێ هەیە، مرۆڤێکە کەرامەتی خۆی بەدەســـت هێناوەتەوە، بڕوای بە خۆی و گەلەکەی هەیەو ئیتر ڕێگا بەکەس نادات سووکایەتی پێ بکات. بۆ لەمەودوایش ئەو کەسە گەورەیە کە نموونەیەکی باڵا دەبەخشێت نەك ئەو کەسەی فەرمان دەردەکات.

دووەم دەستکەوتی گەورە: دروستکردنەوەیەکی تری نەتەوەی عەرەب.

دیکتاتۆریەت لەوەدا سەرکەوتووە کە لەگەڵ کەسانێکدا دەژی لێی دەترسن و خۆیشیان لەیەکدی دەترسن. هەموو هاودەنگیەك لە ژێر دەستی خۆیدا نەبێت قەدەغەیە. ستەمکارە دزێوەکەی ئێمە وای کردوە. بەڵام ئەو کەســـانەی لـــە یەکدی تەریك کەوتبوون شـــۆڕش لەخۆیدا تواندنیەوە. کۆمەڵە مرۆڤێکی لێ دروســـتکردن کـــە بڕوایان بەیەکتر هەیەو پێکەوە بەســـراونەتەوە. لـــە یەك ڕیزدا، بۆ چەســـپاندنی مافی ژیانێکی شەریفانە، بەرەنگاریی مردن دەکەن. لەمەیش ترســـناکتر ئەوەیە کە ئەم کۆمەڵەیەی ئاگری شۆڕشـــیان هەڵگیرساند زانیان تواناو هێزیان چەندە، بەجۆرێك دەتوانن ملهوڕەکان لەناوبەرن و فڕێیان بدەنە نـــاو تەنەکەی خۆڵەوە. لەم دۆزینەوە مەزنەدا هەســـتی فەخرو شانازی و بەدەربەست بوونەوە(ئینتیما) لەدایك بوو. بەم جۆرە شۆڕش بوو بە چرکەســـاتی دروستکردنەوەیەکی نوێ، کە لە یـــادەوەری نەوەکانی ئایندەدا، وەك ڕەگەزێکی ســـەرەکیی بۆ دروستکردنی شوناس ئەو سەرکێشیەی لە سەردەمە تاریکەکاندا تەنیا بە چاوێك خەوی لێکەوتبوو کە ئەویش: گەلە.

سێیەم دەستکەوتی گەورە: دروستکردنەوەیەکی تری نەتەوەی عەرەب.

دەبێت ئەوە لەبیـــر نەکەین کە دیکتاتۆریەت عەرەبی وا لێکردبوو هەر یەکەو ڕقی لەوی تر بێت، ئەوەیش بە دروستکردنی ناکۆکی لە نێوانیاندا. بۆ نموونە عەرەبی جەزائیـــر دژی عەرەبی مەغریبە، کوێت دژی عێراقیەو لوبنانی دژی سوریە...هتد..لە کاتێکدا ئەمە شەڕی ڕژێمە شەڕئەنگێزو گەمژەکان و لەســـەر دەســـەڵات و پاوانکاریی شەخسیە، چ پەیوەندیەکی بە بەرژەوەندیی گشتیەوە نییە. خەونی یەکیەتی عەرەبیان لە بەرچاوی گەلەکانیان خست کاتێك کـــە یەکێتیەکەیان بەم دەســـەڵات و بەو دەستەڵاتەوە بەســـتەوە. هەموو پرۆسەیەکی نزیك بوونەوەیان کرد بە مەحاڵ، چونکە دیکتاتۆریەت یـــەك ناگرێ بەڵکوو شـــەڕی یەکـــدی دەکات. دیکتاتۆر چ خەمێکی نییە بێجگە لە دەســـتدرێژی کردنە سەر کێڵگەو مێگەلی ئەوی دی. لە هەموو ترســـناکتر ئەوەیە کە وای کـــردوە عەرەب ڕقی لـــە خۆی بێت، کاتێك دەبینـــن پارچەپارچەو بێ تواناو دواکەوتوون، لەسایەی داگیرکەری ناوخۆ و دەرەوەیشدا تا بێت کارەساتەکە بەردەوامە.

هەموو ئەمانە لەگەڵ شۆڕشی پیرۆزدا تەقینەوە. لە ئێستادا، لەناو تونسدا، کەس ئاگای لەوە نیە چی لە تونســـدا دەگوزەرێت، هەموو چاومان لە لیبیاو ڕووداوەکانیەتی، پێش ئەو هەموو دەستمان لەسەر دڵمان بوو کە شۆڕشـــی میسر شکست نەخوات. لە یەمەن خۆپیشاندەرەکان ســـروودی نیشتیمانی تونسیان دەوت کە چەند بەیتێکی شاعیری نەتەوە ئەبوقاسم شابی تێدایە.

کێ دەتوانێت نکوولّی لـــەوە بکات کە ئێمە نەتەوەیەکیـــن یەك دڵمان هەیە. بەڵێ ڕووداوەکان کۆمەڵێك وڵاتی عەرەبیـــی دیموکراتی دەخاتەوە کـــە لـــە داگیرکەرەکانی ناوخـــۆ ڕزگاری بوەو ســـەربەخۆیی دووەمیان بەدەســـت هێناوەتەوە. بە هەرەسهێنانی دیکتاتۆریەت گەورەترین ئاستەنگیی لە دژی یەکیەتی سیاسی نەتەوەیەك نامێنێت کە لە لایەنی کلتووری و ویژدانەوە یەکگرتووە وەهمی یەکگرتنێکـــی بەزۆریش لە ئـــارادا نامێنێت کە بەردەوام بەشێك بوە لە کێشەکە نەك لە چارەسەر، نەتەوەی عەرەب لەســـەر ئەو شـــێوازە -بەڵکوو لەوەیش چاکتـــرە- یەکیەتیـــی گەلانی عەرەبی ئـــازاد دادەمەزرێنێت. لەو کاتـــەدا عەرەب دەبێتە سێیەم کۆمەڵەی مرۆڤایەتی لەدوای هیندو چینەوە. کرانەوەی فەزایەکی عەرەبیی لە زەریای ئەتڵەسەوە تـــا کەنداو بۆ جوولـــەی مرۆڤەکان لە ســـایەی سیستەمگەلێکدا کە بەرەنگاریی گەندەڵی و ستەم دەکات، گیانێکی تازە بە نەتەوەکەمان دەبەخشێت

**سەدەی هەژدە سەدەی شۆڕشی فەرەنساو ئەمریکا بوو. سەدەی بیست سەدەی شۆڕشی ڕوس و چین بوو. بەڵام سەدەی بیست و یەك مێژوونووسان ناوی سەدەی شۆڕشی عەرەبی لێدەنێن.**

که گەلانی دی سەرسام دەکات. ئەوکاتە توانای ئەوەمـــان دەبێت ئەو ئاینده تاریکــە نەهێڵین کە ڕاپۆرتـــی ٢٠٠٩ ڕێکخراوی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ گەشەسـەندن پێشـبینی دەکات. بەڵکو دەبینه یاریکەرێکی سـەرەکیی لە نێوان پێنج یان شەش هێزەکەدا ئەمە دارشـتنەوەیەکی تری ڕێکخستنی کاروباری دنیایە کە گــەورە پلاندانەرەکانی دنیا بەخەیاڵیاندا نەهاتووە.

نزیکەی سی سـاڵ لەمەوبەر بە دیاریکراویی لە ساڵی ١٩٨١، یەکەم کتێبم لە تونس بڵاوبووەوە، ناونیشـانی کتێبەکەم بەم جۆرە بوو(کەی عەرەب پێدەنێتــە سـەر ئەسـتێرەی مەریـخ؟) کتێبەکە سەرکۆنەکردنی ئەوانەبوو کە بە سووکی تەماشای نەتەوەکەمان دەکەن. ئیتر هی ناوخۆ بن یا دەرەوە. بانگەوازیی بڕوابوونی ئەوەم کردبوو کە وزەیەکی زۆر گەورەمان تێدایەو نزیـك یان دوور وزەکە دەتەقێتەوە.

ڕاسـتە ئێمە بـۆ بەدیهێنانـی ئامانجەکانمان ڕووبەڕووی مەترسـیی ئاژاوەو شۆڕشی چەواشەو گەڕانەوەی زوڵم و ستەم دەبینەوە، بەڵام ئەوەیش ڕاسـتە کە ئەمڕۆ ئێمە زۆر لەو مەریخەوە نزیکین کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە خەونمان دەزانی. مەریخی ئازادی و دیموکراتی و پێشـکەوتن. جا بۆ نابێت ڕۆژێك لە ڕۆژان لەباتی خەون پێ بخەینە سـەر ئەو ئەستێرەیە. بەتایبەتی کە بوویێتن بە نەتەوەیەك خەڵکانی دی پێکەنینیان بە نەزانیمان نەیەت.

سـەدەی هەژدە سەدەی شۆڕشـی فەرەنساو ئەمریکا بوو. سـەدەی بیست سـەدەی شۆڕشی ڕوس و چین بوو. بەڵام سـەدەی بیسـت و یەك مێژوونووسـان ناوی سـەدەی شۆڕشی عەرەبی لێدەنێن.

ئایا ئەم شۆڕشــە بــەرەو لووتکەمان دەبات یان لەنێو چاڵ و چۆڵێکمـان دەنێت کە خۆزگە بە ڕابردوو بخوازیـن، وەك چۆن لە گوندەکانی ڕوسیادا، پیرەمێردو پیرەژنان خۆزگە بە سەردەمی ستالین دەخوازن؟

ئەمـە پێداگیریەکی گەورەیە لـە ڕووماندا، ئێمەیش لەبەردەم دووڕیانێکی پڕ لە مەترسـیداین کە نزیکەی پانزە سـەدەیە ئەم نەتەوە گەورەیەی پێدا تێدەپەڕێت. با پشـت لە ئاژاوەو نائومێدی و توندوتیژی بکەین، با هەنگاومان بەرەو لووتکەی شـکۆمەندی بێت. با عەرەب شـیاوی ئاییندەی خـۆی بێت، لە ژوانی داسـتانێکی تازەکەرەوەدا بێـت، هۆکارەکەی بڕوابوون بـە خواو بە خودو بەو توانایە بێت کە ئێمەیش دەتوانین شتێك بەدی بێنین کە پێشینانمان نەیانتوانیوە بەدی بهێنن.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری المستقبل العربي

اراء و مناقشات

# بۆچی گەلانی عەرەب ڕادەپەڕن؟

هاشم سالّح
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

یەکەم لایەنی باشەی ڕاپەڕینەکانی عەرەب، بریتییە لەوەی سیستمە پۆلیسییە شمولییەکانی ناچار کرد، بێ ویستو حەزی خۆیان بکرێنەوە. ڕاپەڕینەکان بۆ یەکەمجارە ئەو سیستمانەی تۆقاندو وایلێکردن لە لووتبەرزیو ملهوڕی خۆیان، گەرچی کەمەکێکیش بێت، بێنەخواریّ. ناچاریکردن بۆ یەکەمجار لە مێژوویاندا مانای گفتوگۆو دانوسان بزانن، تەنانەت ئەگەرچی لانی کەم ئەو گفتوگۆو دانوسانە لەگەڵ خودی خۆشیاندا بێت!

ئایا بیستوتانە باوکی خێزانێکی عەرەبی یان شێخی عەشیرەتێك، گفتوگۆ لەگەڵ ماڵو منداڵەکانیدا بکات؟ شورەییە، نابێت، ئەوە لە ناوبانگو شانوشکۆی کەمدەکاتەوە. ئەگەر ئەوان وابن، ئیدی دەبێ سەرۆك یان سەرکردە یاخود ڕابەر چۆن بێت؟! من بۆ خۆم لە ئێستادا ناتوانم لە جیهانی عەرەبیدا، گفتوگۆ لەگەڵ هیچ کەسێکدا بکەم، لەوە دەترسم جنێوم پێبدات یان زۆر بە سادەیی تیرۆرم بکات! لەبەر ئەوە تەنها لەگەڵ

**لێرەوە بۆ ئەوەی ببین بە دیموکراسی، تەنها ئەوە بەس نییە، بەهۆو بێ هۆ، بە بۆنەو بێ بۆنە، وشەی دیموکراسی بڵێینەوە. بەڵکو پێویستە بزانین چۆن مومارەسەی دەکەین: واتە چۆن بەرگەی جیاوازییەکانی تۆ لەگەڵ خۆمدا دەگرم، بەبێ ئەوەی لەسەر کورسییەکەم هەستم و کورسییەکە لەسەرتدا بشکێنم!**

خـــودی خۆمدا گفتوگۆ دەکەم. بـــەڵام تەنانەت لەگەڵ خودی خۆشـــمدا، ڕەنگە ببم بە دوو یان سێ کەسو یەك ئەوی دیکەیان تۆمەتبار دەکاتو ململانێو شەڕ تا ئاستی شەکەتبوون دەستپێدەکات. بە کورتیی لە مێژوی ئێمەدا کەلتوری گفتوگۆی دیموکراسی بوونی نییە.

ئـــەوە حەقیقەتـــە، لێرەوە تازەتریـــن تیۆرەی فەلســـەفی هاپرمـــاس دەربـــارەی گفتوگۆیەکی کارلێکەری بەردەوامی دیموکراســـی شارستانی، لای ئێمـــە پراکتیـــزە ناکرێـــت. لـــە بنەڕەتـــدا هاپرمـــاس ئەو تیۆرەیـــەی لە میانـــەی ئەزمونی گەلانی پێشـــکەوتو گەڵاڵەکردو لەپێناو ئەوانیشدا ئەنجامیدا. چونکـــە تەنها عاقڵە ڕۆشـــنگەرەکان دەتوانن بەهێمنی گفتوگۆو دانوســـان بکەن. وەلێ ئەوانی دیکە، دەســـت دەدەنە یەخـــەی یەکترو سەروگوێلاکی یەکتر دادەگرنەوە، تەنانەت لەژێر چەتری پەرلەمانیشدا! تەماشای ئۆکرانیا بکەن کە نمونەیەکە لە چەندین نمونە.

لێرەوە بۆ ئەوەی ببین بە دیموکراســـی، تەنها ئەوە بەس نییـــە، بەهۆو بێ هۆ، بە بۆنەو بێ بۆنە، وشەی دیموکراسی بڵێینەوە. بەڵکو پێویستە بزانین چۆن مومارەســـەی دەکەین: واتە چۆن بەرگەی جیاوازییەکانـــی تۆ لەگەڵ خۆمـــدا دەگرم، بەبێ ئەوەی لەســـەر کورسییەکەم هەستمو کورسییەکە لەسەرتدا بشـــکێنم! یەکەم هەنگاوی دیموکراسی لێرەوە دەســـتپێدەکات. دیموکراسی پرۆسەیەکی دورودرێژە ناکرێ بـــە تەنها تەکانێك فێری ببین. کەواتە با لە خاڵی سفرەوە دەستپێبکەین.

کاتێ ڕۆشـــتم بۆ فەرەنســـا، بـــۆ یەکەمجار سەرســـامبووم بە جیاوازی نێـــوان تێڕوانینەکان، مامۆســـتاکە پێش ئەوەی بڕیـــاری خۆی بدات، یەك یەك ڕاوێژی پێدەکردین، تەنانەت بۆ مەسەلە زۆر ســـادەو ســـاکارەکانیش. من لەگەڵ خۆمدا قســـەم دەکردو دەمگوت: بۆچی کاتێ خۆی بە

هەموو ئەم شـــتانەوە بەفیـــرِۆ دەدات؟ ئێمە کێین تاکو ڕاویژمـــان پێ بکات؟ بۆچی بیروڕای خۆی بەخێرایی ناســـەپێنێت بەســـەرمانداو مەســـەلەکە کۆتایی پێبێـــت. هۆکاری ئەو بیرکردنەوەیەی من ئەوە بـــوو کەلتوری دیموکراتی لە ژیانمدا بوونی نەبوو. تا ئێســـتاش نازانم وشەی دیموکراتی مانای چییە. ئەوەندە لەســـەر ســـتمگەریو کۆیلایەتیو ملکەچی ڕاهاتووم، توانای تێگەشتنم نەماوە. بگرە واملێهاتـــووە تام لە چێژی ئازادی وەرناگرمو چێژ لە سەرشۆڕشیو ماسۆشیەت وەردەگرم.

پێویستە بزانین سیستمە ستالینییەکان، گفتوگۆ لەگـــەڵ گەلەکانیان ناکەن، بەڵکـــو حوکمڕانییان دەکەن، چونکە ئەو سیستمانە بەوپەڕی سادەییەوە خاوەنی حەقیقەتی ڕەهان. پێویســـت بە قسەکردن ناکات کە هەندێ لە سیستمەکانمان، تێکەڵەیەکە لەسەر شـــێوازی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتی سەردەمی قۆناغی ســـتالینیەت: یەك حیـــزب، یەك ڕۆژنامە، یەکێتی قوتابیان، لاوان، ژنـــان، تەنانەت یەکێتی نوسەرانو ئەدیبانیش، هەر هەموویان لە چوارچێوەی زمانێکی کرچوکاڵو وشـــك و برینگی ســـواوی ناســـراودا، دەســـتەمۆکراون. وەك توتییـــەکان بە درێژایی ڕۆژەکان هەمان قســـەی سواوو بێزارکەر دەڵێنـــەوە. ئەو سیســـتمانە دوای کەوتنی دیواری بەرلین لە ساڵی ١٩٨٩، ڕەشەبای ئازادی ڕایماڵین.

لێـــرەوە ڕاپەڕینی گەلانی ئێمـــە دژ بە هەمان ئەو جۆرە سیستمانە، لە ڕاســـتیدا لە چاو وڵاتانی دیکەی جیهان، نزیکەی بیســـت ساڵ دواکەوت. هۆکارەکەشی روونو ئاشکرایە: ئیسرائیل لەبەردەم دەرگاکاندایە، بۆیە ئامادەســـازی گشـــتی لەپێناو فەلەســـتین، کاری یەکەمە. بەڵام گرفتەکە ئەوەیە ئێمـــە نە فەلەســـتینمان ڕزگارکرد نە خۆشـــمان ڕزگارکرد، بۆیە لەسەر ئاســـتی هەردوو بەرەکە دۆڕایـــن. خەریکـــە دەڵێـــم لەیەککاتـــدا دنیاو ئاخیرەتمان دۆڕاندووە. توڕەیی گەورەی گەلانی عەرەب لێـــرەوە دەســـتپێدەکات. ئـــەو توڕەییە ســـاڵانێکی دوورو درێژە خەفەکـــراوە، بۆیە وەك بومەلەرزە یان وەك گڕکان تەقییەوەو گڕتاوەکەیو پارچەکانی بەڕوی چەواشـــەکاریو ستمگەریو گەندەڵیدا فڕێدا.

جگە لەوە گەنجانی عەرەب بەوانەی بڕوانامەی بەرزیان هەیە یاخود ئەوانەشیان کە بڕوانامەیان نییە، لەناو بێکاریو ئاســـۆیەکی داخراو و بێزارییەکی کوشـــندەدا دەســـوڕێنەوە. گەورەتریـــن تاوانی مرۆڤایەتـــی دەرهەق بە گەلە باشو پاکەکانمان ئا لێرەدایە. بەرپرسیارەتی ئەوەش دەکەوێتە ئەستۆی سیســـتمە باوەکان. ئێمە ئەمە دەڵێینو ڕێژەی ئەو گەنجانەی تەمەنیان لە بیســـتو پێنج ساڵ کەمترە، لانی کەم دەگاتە لە ســـەدا شەســـت: واتە بەشی زۆری گەلانی ئێمە گەنجن، بە پێچەوانەی گەلانی شارستانیەتی ئەوروپاوە کە پڕە لە پیرو بەساڵاچوو. هەندێ لە دەســـەڵاتدارەکان نـــەك تەنها خۆیانو خێزانەکانیـــانو دارودەســـتەکانیان، ســـتمگەرو دەوڵەمەندن، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە لێهاتونینو ناتوانن مومارەســـەی حوکمڕانیەکی باش بکەن. ئیدی قەبارەی ئەو زەرەرە بیهێننە بەرچاوی خۆتان کە لە هەموو ئـــەوەوە بەرهەمدێت. کەڵەکەبوونی ئەم هـــۆکارە زۆرانەو هـــۆکاری دیکەش، بووە هۆی تەقینـــەوەی گەلانی عەرەب. کەواتە ئەگەر هۆکارەکە زانرا پێویست بە سەرسامبوون ناکات.

قســـە زۆر لەســـەر کەمتەرخەمـــی یـــان

بەشـــدارینەکردنی ڕۆشـــنبیرانی عـــەرەب لـــەم ڕاپەڕینانـــەدا کرا، یاخود پێشـــبینی نەکردنیان بۆ ڕوودانـــی. دەڵێن جان جاك ڕۆســـۆ لانی کەم بە چارەکە ســـەدەیەك پێـــش بەرپابونی شۆڕشـــی فەرەنسی، پێشـــبینی بەرپابونەکەی کردووە. بگرە بە کۆمەڵێ پەرەگرافی زۆر ورد پێشبینی کردووە کە بووەتە شوێنی سەرسوڕمانی هاوسەردەمەکان. بەڵام خەڵکـــی هەموویان جان جاك ڕۆســـۆ نین! چۆنـــی بینی؟ چـــۆن پێش ڕودانـــی ڕووداوەکە کەوت؟ چۆن ئەوەی بینی کە نابینرێت؟ ئەو زۆر بەسادەیی (ڕادارێکی ناوەکی) هەبوو، بەپێچەوانەی ئێمەی خەڵکانی ســـادەو ســـاکار. ئەم ڕادارە کە تەنها پێغەمبـــەرەکانو بیرمەندە گەورەکان هەیانە، ئەوەی لەتوانادایە نەبینراوەکان ئاشکرا بکات، ئەو کارلێکە قوڵانە ببینێت کە لە ژێرەوە کار دەکەنو کۆمەڵگاو شـــتەکان هەڵدەگێڕنەوە. بەڵام ناهەقییە سەرزەنشتی تەواوی ڕۆشنبیرانی عەرەب بکرێت. چونکە هەندێ ڕۆشنبیر بە نوسینەکانیان، کە تێیدا ڕەخنەیان لە دواکەوتوییو ستمگەریو تاریکبینی گرتووە، ڕێگایان بۆ ئەو ڕوداوە بومەلەرزە ئاسایە خۆشـــکردبوو. ئەوانـــە کۆمەڵێ بیـــروڕان، زیاد لەوەی ئێمـــە وێنای دەکەین لە نێوەندی گەنجانی ڕاپەڕیودا بڵاوبوەتەوە، لەپێناو ئازادیو حەقیقەتو دادپـــەروەری کۆمەڵایەتی، ئەمە لەلایەك بەڵام لە لایەکی دیکـــەوە نابێت ژمارەی ئەو ڕۆشـــنبیرو ڕۆژنامەنوســـانە لەبیـــر بکەیـــن کە لـــە زۆربەی وڵاتانی عەرەبـــیو ئیســـلامیدا، زیندانیکران یان ئەشکەنجەدران یاخود کوژران.

لێرەوە قسەی ئەوەی ڕۆشنبیران هیچ ڕۆڵێکیان لـــەم خۆپیشـــاندانانەدا نەبووە، قســـەیەکی هەڵەو ناڕەوایە. ڕۆشـــنبیران بە مانا بەهێزەکەی وشەکە، چرا ڕۆشنەکانی گەلانو ویژدانە زیندووەکەیانن، بەڵام ئەو قسەیەش ڕاستە کە هەندێ لە ڕۆشنبیران پەیوەســـت بوون بە سیســـتمەکانەوەو دەســـتیان لەگەڵدا تێکەڵ کردبوونو سودیان لێوەرگرتبوون، بگـــرە هەندێکیان بـــە ئاســـتێك دەوڵەمەندبوون تەنانەت لـــە باڵاترین پایتەختەکانـــی خۆرئاوادا، خانوو ئاپارتمانیان هەیە. کەواتە ڕۆشـــنبیر هەیەو ڕۆشنبیریش هەیە.

ماوەتەوە دواهەمین قسە بکەم: ئەم خۆپیشاندانانە کۆتایی هەموو شـــتێك نییە، بەپێچەوانەی ئەوەی وا دەزانیـــن، بەڵکـــو ئەمە ســـەرەتاکەیەتی. ئەمە ڕێگە بۆ خۆپیشـــاندانێکی ڕۆشـــنگەرانەی گەورە خۆشدەکات کە دواتر لەســـەر خاکی عەرەبو ئیســـلام ڕوودەدات. لەو کاتەدا، تەنها لەو کاتەدا دەکرێ بڵێـــن عەرەب پێیناوەتە ناو ســـەدەیەکی تازەی دیکەوە.

**سەرچاوە:**

لاپەڕەی ڕۆشـــنبیری، الشـــرق الاوسط، ٢٠ / ٧/ ٢٠١١ ژمارە ١١٩٢٢

# ریپۆرتاژێك سەبارەت بەسەرهەڵدانەکان لە دنیای عەرەبی لەگەڵ ڤیجای پراشاد

سازدانی: پۆتیك گۆش
و. لە تورکییەوە: رەسوڵ حەسەن

ڤیجای پراشــاد زانایەکی مارکسیستی بەناوبانگی باشووری ئاســیایە. پرۆفسیۆرە لەکاری نێونەتەوەیی و مێژووی باشووری ئاسیا، نوسینی گرنگ و بەرفراوانی لە گۆڤــارە ئەکادیمــی و بەناوبانگەکان ســەبارەت بەپەیوەندیــە نێــو دەوڵەتیەکان نووســیوە. دواهەمین پەرتوکی بە ناوی

**the darker nations: apeples history of the third world**

لەساڵی ٢٠٠٧دا بڵاوکردۆتەوە.

بیرۆکەکانی ســەبارەت بە «مێــژووی جیهان» و «جیهانی ســێهەم» بۆتــە جێگەی ســەرنج و رامانی خوێنــەران، خەلکێکــی زۆر بەبایەخــەوە ســەیری نوسینەکانی دەکات.

**پۆتیك گــۆش:** ئەوەی لەم ماوەیــەدا لە جیهانی عەرەبیدا روودەدات لە چ روویەکەوە دەتوانرێت پێی بگوترێت «شۆڕش»؟ جیاوازی چی یە لەگەڵ شۆرشە جۆراو جۆرەکانی ئەم بیست ساڵەی دوایدا؟

# ئیخوان موسلمین لە كاتێكدا گرنگی بەوە دەدات كە بە ئاشكرا نەجولێتەوە، ئەگەر خاوەنی رێگەی ئاسان نەبێت لە دیاریكردنی سەرۆكەكانی گەل وە تەندروستی «ئەیمەن نور»یش باش نەبێت ئەوا لەوانەیە بەرادعی ئەو ئەركە بكرێتە ئەستۆ.


ڤیجای پراشاد

**ڤیجای پراشـــاد:** هەموو شۆرشەكان وەكو یەك نین. شۆرشـــە جۆراوجۆرەكانی باشوری ئەفریقیا خێرایەكی جیـــاوازی هەبوو. لەهەمان كاتیشـــدا خاوەنی كاراكتەرێكی چینایەتی جیاواز بوون. جگە لەمە ئەگەر مرۆڤەكان لەژێـــر ناوی بەرژەوەندی چینایەتی و نەتەوایەتیـــش بجولێنەوە ئەوا هەر لە نێو گونجانێكدان لەگەڵ ئەمریكای ئمپریالیست. بۆ نموونە شۆرشی «گوڵ» لە گورجستان و شۆرشی «تورونج» لە ئۆكرانیا. لـــە نێو ئەمانەدا بزوتنەوەی «پـــورا» لەلایەن ئەنســـتوتی كۆمەڵگەی كراوە و ئەنیســـتیتۆی نەتەوەیی دیموكراتیانەی حكومەتی ئەمریكا پشـــتگیری كرا. هەرچی پارەی روسیاشە گەیەنرایە هەردو لا. ئەم شۆرشـــانەی باشـــوری ئەوروپا لەراســـتیدا بەهۆی ئەو برینەی لە گۆرانی دەوڵەتی سۆسیالیزمی بۆ ســـەرمایەداری تالانكەر دروست بوو تا ئیســـتاش بۆتە شەڕێكی سیاسی، وەكو ئەوەی لە ناوچە تەنگژاوێكانی دنیادا هەیە.

هەرچی ســـەرهەڵدانەكانی دنیـــای عەرەبیە. رەوشێكە نزیك لە رەوشی ساڵانی ١٩٦٨ لە دنیای عەرەبی. ٦٠٪ی دانیشتوانی عەرەب لەخوار تەمەنی ٣٠ســـاڵیدان. لە میســـر لە ٪٧٠ی خوار ٣٠ ساڵیە. دروشـــمەكانیان ســـەبارەت بە كەرامەت و كارە. نەعلەتی دەوڵەمەندیتی وڵات تەنها خۆشگوزەرانی بۆ بەشـــێكی كەمی كۆمەڵگە هێناوە، بەڵام تەنها كەمێك پێشـــكەوتنی ئابوری فەراهـــەم كردووە. تەنها هەندێك توێژی دنیای عەرەبی پێشـــكەوتنی كۆمەڵایەتی تێدا درووست بووە.

لە تونس رێـــژەی ئەوانەی دەتوانن بخوێننەوە بنوسن٧٥٪ ە لە میسردا لە ٧٠ لەسەرەوەیە. لە لیبییا ئەم رێژەیە ٩٠٪ە . چینی خوارو و ناوەند و چینی ناوەندی لاوان كاریان دەست ناكەوێت. زنجیری ســـوككردن مرۆڤ ئەو گەنجانەی هێناوەتە سەر شەقام: كارنیە، دەوڵەتی فشار وستەم هیچ رێزێكی بۆمرۆڤـــەكان دانەناوە. جگە لـــە هەموو ئەمانەش

هەســـتکردن بەوەی هاوولاتی پلە دوون لەئاستی نێوخۆو دەرەوە زەحمەتی و فشـــارێکی دەروونی دروســـتکردووە. بـــوون بە پلە دوو لـــە بەرامبەر ئەمریـــکا و ئیســـرائیل و ئەوانی تر فشـــارێکی زۆری دروســـتکردووە و دەتوانین بڵێین هۆکاری تەنگژەکان بەگشتی فشاری زۆرە.

**پۆتیك گۆش:** ئایا شۆرشی یاسەمین دەتوانێت سیاســـەتی رکابەرانـــە لە مەغریـــب و رۆژئاوای ئاسیا، کاراکتەری سیاسەت و نایدۆلۆجیای فشار، ناسنامەی ئیسلامیانە وەرچەرخێنی بۆ رێکخستنێکی سیاسیانەی چینی کرێکار؟ ئەو مانگرتنانەی کە لە ناوچەکەدا وەك ئەوەی ئاگـــر لە پوش بەربوبێت بڵاوبوونەوە، لە چ رەوشـــێکدا دەتوانێت بگۆرێت بۆ دژایەتی کردنی دەسەلات؟ یاخود بەبۆچوونی ئێوە چەپەکان حەز دەکەن نوێنەری هەندێکی تر بن لە دەرەوەی ناوچەکە؟

**ڤیجای پراشـــاد:** لەوە دەترســـم کە لەجێگەی کەسانی تر قســـە بکەین. لاوان و چینی کریکار و چینی ناوەراســـت دەستیان بەتێکۆشان کردووە. دیارنیـــە کـــە بـــە چ ئاراســـتەیەکدا دەڕوات. با لەیەکچونی شۆرشـــەکان بخەینـــە لاوە. چونکە روودانـــی گۆرانگاریـــەکان بەرێژەیەکـــی زۆر رێککەوتە.

جوڵانەوەی رەمەکیانە جەماوەر «بنکە» دەخاتە ناو لەیەکخشـــان و تانەلێدانەوە. رێکخستنی چینی کرێکار لە رێکخستنی بلۆکی تیوکراتی لاوازترە، لایەنی کەم لە میسردا وەهایە. لە خاکی عەرەبەکاندا گۆرانکاری کۆمەڵگە بە ئاراستەی پێشکەوتن زیاتر لەسەر دەستی ئەفسەرەکاندا بەدیهاتووە.

تێکۆشـــانی کرێـــکاران لە هیـــچ ولاتێکدا نەگەیشتۆتە ئەنجام. لە ١٩٥٠ بزوتنەوەی کرێکاری لە عیراق پێشکەوت، دواتر لەلایەن سوپاوە دەستی بە ســـەرداگیرا و دوای ئەوەش لە نێوان خۆیاندا رێگەوتنێکی بێدەنگیان ئەنجامدا.

ناتوانیـــن بڵێین بە دڵنیایی چـــی روودەدات. شۆرشی مەکسیك لە ١٩١١ دەستی پێکرد، بەلام لە نووسینی دەستووری ١٩١٧دا و «کارنز» بۆ پۆستی سەرۆکایەتی بەرزکرایەوە، بەلام تا «کاردیناس» لە پارتی دەستوری ساڵی ١٩٣٤ نەهات وەرچەرخان لە رژێمدا رووی نەدا.

لە هەردوو کیشیاندا چەپ وەك پێویست پێنە گەیشتبوو. هەرەشـــەی راستڕەوەکان بەردەوام لە ئارادابوو، کاتێك دەوڵەتـــی «فیراڤون»یش وەکو دەوڵەتـــی «پۆرفیرۆ دیاز» لە هێزکەوت، لادێیی و کارکەرەکان توانیـــان لەدەرەوەی جولانەوەیەکی رەمەکیانەوە بگەنە دەسەلات و زیاتر بەشێوەیەکی رێکخراوانە دەربکەون. واتە جولانەوەی رەمەکیانە باشە بەلام ئەگەر بەشێوەیەکی کاریگەر دەسەلات نەگرێتە دەســـت. ئەوا شۆرشـــی دژ دەتوانێت بە شێوەیەکی کاریگەر و باوەڕبەخۆبوونەوە بەرپابێت.

**پۆتیـــك گـــۆش:** بەبۆچوونـــی ئێـــوە ئەگەر وەرچەرخانێکی بەمشـــێوەیە روونـــەدات ئەوا ئەو مەترسیانە چیین کە لەوانەیە رووبدەن؟

**ڤیجای پراشـــاد:** ئومێدم وایە کەوانەبێت بەلام ئەگەر وەرچەرخانێکی بەو شێوەیە روونەدات. ئەوا لایەنی کەم سێ بژار لە ئارادایە:

یەکەم: لەمیسردا ســـوپا، چینی بالا دەست لە ژێر فشاری ئەمریکا دەخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی. لە راســـتیدا لەبـــەر ئەوەی بـــژاری دووەم خۆی نەخستۆتە روو بۆیە لە تونس ئەمە لە نێو ئەگەر و

لێکدانەوەکاندانیە.

دووەم: ئەندامانی بەرەی باڵا دەسەڵات دەتوانن لــە ڕێگەی زنجیرەیــەك قەرزی خێــرا ڕێگەی بڵاوکردنــەوەی جەماوەر بگرنە بەر. لەڕاســتیدا تیوکراسی کەسە سەمبولیەکانی لە دەسەڵات دێنێتە خــوارەوە. ڕەوانە کردنی بن عەلی بۆ ســعودیە. وادەکات موبارەك وازلە دەســەڵات بێنێت، بەڵام موبارەك هەوســاری دەوڵەت بە ئەمانەت دەداتە عومەر ســلیمان کە یەکێکە لە سێ هاوبەشەکەی و دەستی بەخوێن سوورە. موبارەك ئەمەی لەگەڵ «احمد شفیق» تاقی کردەوە بەڵام دەیتوانی لەگەڵ «تەنتاوی»ش تاقی بکردایەتەوە. هەموویان نزیکی موبارەکن و جەنەراڵی باوەڕپێکراون لەلایەن بلۆکی باڵا دەستەوە. شای ئێران وەکو دوا چانس «شاپور بەختیار» دەکاتە ســەرۆك وەزیران. ئەمە بەکەڵك نەهــات. دوای ئەوە یاخی بوون زۆر خێراتر بڵاو بۆوە. ئەگەر ئەوە بەکەڵك نەیەت ئەوا:

ســێیەم: ســەفیری ئەمریکا گڵۆپی سەوز بۆ «محەمەد بەرادعی» دادەگیرســێنی وپەیامێکی پێ دەدات محەمەد بەرادعی پاڵێوراوێکە کە لەلایەن «ئیخوان موسلمین»یشــەوە و باوەری پێدەکرێت کاتێــك لە٣٠ی مانگی ١ قســەی بــۆ جەماوەر کرد گوتی کێشــەکە لە چەند ڕۆژێکدا چارەسەر دەکات. ئایا ئەمە بەواتای ئەوەدێت کە بەهاوکاری «ئیخوان موسلمین» و توێژەکانی هاوکاری موبارەك دەبێتە سەرۆکی دەوڵەت؟. بەڵام ئایا ئەمە بەسە بۆ جەماوەر؟

لەوانەیــە ناچاربن بەوەندە رازی بن؟ بەرادعی یەکێکــە لــەو کەســانەی لەســەر کار لادانی ســەرۆکایەتی کردنی بۆ ئاژانســی نێو دەوڵەتی وزەی ئەتۆم لە واشنتۆن توڕەبووە. نابێتە پارویەکی ئاســان. لەلایەکی تریشەوە شــیمانەی زۆر هەیە کە سیاســەتی ئابوریانەی موبارەك پەیرەوبکات. رۆژهەڤەکەی بریتی یە لە ریفۆرمی سیاسی، بەرادعی داوای بەرێوەبردنێکی باشی کرد لە میسردا، بەڵام شــەقام زیاتر لەمە داوا دەکات. ئەمــە یا دەبێتە ئاگربەستێکی لە ناکاو یا هەروەکو «جاڤێز» گوتی: هەر ئێستا.

**پۆتیــك گــۆش:** ئیســلامیە رادیکاڵەکانــی سەرەڕای باڵادەستی گەورەیان لەبواری سیاسی و ئایدیۆلۆجی لە ناوچەکەدا، ســەرنەکەوتن لەوەی وەکو هێزێکی کاریگەر و ڕێکخراو پێشوازیی لە ڕووداوەکان بکەن. بە تایبەت «ئیخوان سلمین» لە میسر، بەبۆچوونی ئێوە هۆکاری ئەمەچییە؟

**ڤیجای پراشاد:** «ئیخوانی مسلمین» لە شەقامەکانن. تەنها بێ دەنگیــان بۆ ئایدلۆجیای خۆیان فەراهەم کرد. ئەمە زۆر روونە جەمال ناصری وتەبێژ گوتی: «ئەوان تەنها بەشــێکی بچوکــی مانگرتنەکانیان پێکهێناوە، ناڕەزاییەکانیشیان سەبارەت بەمەسەلەی ئیسلام نیە بەڵکو ســەبارەت بەمەسەلەی میسرە» . ئەمە زۆر ژیرانەیە. ئەمە هەمان شتە کە مەلاکان لە ناڕەزاییەکانی ١٩٧٨-١٩٧٩لە ئێران گوتیان. ئەوان لە ئامادەباشــیدا چاوەروانیان کرد تا کۆبونەوەی خەڵك بۆ روخاندنی شــا لــە زیادبوندابێت دوای ئەوە هێرشــیان کرد. ئایا «ئیخوان موسلمین»یش هەمــان شــت دەکات؟ هەڵبەتە ئەمە راســتە کە بگوترێت ئەمە شۆرشــێکی جەماوەریە و هێزێکی ڕێکخستنی نیە. بەڵام تەواو نیە. دەتوانرێت خەڵك بجولێنرێــت و خەڵکیش بکەوێتە جوڵە. بەڵام ئایا ئەگەر خەڵك ئامراز و بونیادێکی نەبێت دەتوانێت

دەسەڵات بگریتەدەست و بەڕیوەی بەبات؟

ئەمە ئەو جێگایە یە کە عونســـوری ڕێکخراو تیایـــدا کەوتۆتە نێـــو گەمەکـــەوە. ئەگەر هیچ ئەلتەرناتیفێکـــی گونجـــاو نەبێت ئـــەوا ئیخوان موســـلمین دەســـەڵات دەگریتە دەست. وەستانی ئیخوانی موســـلمین لە پشـــت بەرادعی بەو واتایە دیت کە نایەوێت یەکسەر بکەوێتە ڕەوشێکی دژ بە ئەمریکا. نۆرەی ئەمەش دێت.

**پۆتیك گۆش:** دەرکەوتنـــی کارەکتەرەکانی هاوشـــێوەی ئەلبەرادعی بە واتای چی دێت؟ ئایا بەراستی ئەمانە سەری سیاسی ژیانەوەن هەروەکو لە میدیا نێو دەوڵەتیەکان ئاماژەی پێکرا؟

**ڤیجای پراشاد:** بەرادعی کارتێکی باوەڕپێکراوی هەیە. لە ساڵی ١٩٦٠لە حکومەتی جمال عبدالناسر لـــە وەزارەتـــی پەیوەندیەکانـــی دەرەوە کاری کـــردووە. دوای ئەوەش لەحکومەتی اســـماعیل فەهمی لەوەزارەتی دەرەوە کاری کردووە. کاتێك ســـەرۆکی میسر دەچێتە قودس ئەو لە کابینەکەی ســـادات دەســـت لە کار دەکێشـــێتەوە. فەهمی لایەنگرێکـــی بیرۆکەی جمـــال عبدالناصر بوو. بەرادعی بە درێژایی ســـاڵێك لەگەڵ بوترس غالی لە وەزارەتی دەرەوە کاری کردووە. سەرەتای ئەم پەیوەندیانە وەهابوو. هەردوکیان بۆ بیرۆکراسیەتی نەتەوە یەکگرتـــووەکان ڕایانکرد. بوترس غالی لە فەهمی نەرمتربوو. لەو بـــاوەڕەدام بەرادعی زیاتر لەسەر هێڵی فەهمی بوو. گوشارەکانی ئەمریکاش لە ئاژانســـی نێـــو دەوڵەتی وزەی ئەتـــۆم بەژنی نەچەمانـــدەوە لـــە کاتێکدا دەســـەڵاتی موبارەك ســـاڵانی هەرە نابودی خۆی لـــە دەرەوەی قاهیرە بەرێدەکات، ئەو کارتی بـــاوەڕی خۆی فەراهەم دەکات و دەپارێزێـــت. یەکێکی وەکو بەرادعی دەیتوانی بەشـــداری لە بەڕێوەبەرایەتی حوســـنی موبارەك بکات، بەڵام ئەو لە دەرەوەی دەســـەڵات مایەوە و دوور لەبەرەی دەســـەڵات هەلوەســـتەی کرد، ئەمەش جیاوازیەکی گەورەیە.

ئیخوان موســـلمین لە کاتێکـــدا گرنگی بەوە دەدات کە بە ئاشکرا نەجولێتەوە، ئەگەر خاوەنی ڕێگەی ئاسان نەبێت لە دیاریکردنی سەرۆکەکانی گەل وە تەندروستی «ئەیمەن نور»یش باش نەبێت ئەوا لەوانەیە بەرادعی ئەو ئەرکە بکرێتە ئەستۆ.

**بۆتیـــك گـــۆش:** چەند دەیەیـــەك لەمەوبەر لەم بەشـــەی جیهـــان چینی کرێـــکار و چەپی سۆســـیال دیموکـــرات زۆر بە هێزبـــوو، بەڵام لەبەرچاو ون بوون. ئایا هۆی ئەمە فشـــاری ڕژێمە دەسەڵاتدارەکانی وەکو سەدام حوسێن و موبارەك و حافزئەســـەد بوو یا بوونی گروبە ئیسلامیەکانی وەکو ئیخوان موســـلمین؟ یا هەر لەسروشتی ئەم گروپـــە چەپانەدا ناتـــەواوی و نەبوونی داخوازی بووەتە هۆی لاوازبونیان؟

**ڤیجای پراشاد:** بارۆلی گوشار کەم نەکەینەوە. لە بوودجەی ساڵی ٢٠٠٦ی میسر یەك ملیارد و نیو دۆلار بۆ پاراستنی ناوخۆ جیاکرایەوە. یەك ملیۆن و نیو پۆلیس هەیە، هێزی ســـەربازیش چوارقاتە. دەڵێن بۆ هەر ٣٧ کەس پۆلیســـێك هەبووە. ئەمانە ژمـــارەی لەرادەبەدەرن ئـــەو هاوکاریەی بەبڕی ١/٣ملیار دۆلار لەلایـــەن ئەمریکاوە پێیدرا نیوەی ئەم سەیرو سەمەرەیە تێر دەکات.

چینی کریکار لە میسر لە ساڵی ١٩٧٧گەیشتە لوتکە. ئەمە ڕاپەڕین بوو بۆ نان. لەســـای سەری ساداتەوە بەبزەیەك ســـندوقی دراوی نێو دەوڵەتی

له دژی دەرکەوت، دەست کرا به هەنگاونان بەرەو «بازاری ئازاد»، واته»انفتاح» له سێ ڕێگەوه حیسابەکانی خۆی هاوسەنگ کرد. ڕەزامەندی لەسەر کرانەوه سەبارەت به هەندێك لقی ناوەندی هەناردەکردن. له گۆڕەپانی ئاینیەوەش ئیخوان موسلمین بنكۆل کردنی گرته ئەستۆ. سعودیەش پارەکەی بۆ تەرخانکرد. لەبەر ئەوەی ڕێككەوتنیشی لەگەڵ ئیسرائیل ئەنجام دا ئەوا داوای پارە(مخصصات) ی له ئەمریکا کرد. لەمیانی پێشخستنی سیستەمی پاراستنی خۆی زیاتر دەرفەتی سەرکوتکردنی بزوتنەوەی کرێکاری فەراهەم کرد.

کات و شوێن هەبوو بۆ ئەوەی بیر له ڕێگەی داهێنەرانه بکرێتەوه بۆ پێشخستنی مەسەلەی رزگاری کرێکاران؟ ڕۆشنبیری وا هەبوو که ئەمه ئەنجام بدات؟ بیر لەکاتی ڕێكەوتنی سەندیکاکانی کۆمۆنیست لەگەڵ ڕژێمەکەی جەمال عبدالناصر بکەنەوه که له مارتی ١٩٥٤ ئەنجامیاندا. لەبەرامبەر هەندێك دەسكەوت هاوکاری ڕژێمی نوێیان کرد. ئەمه سەربەخۆیی سەندیکاکانی له نێوبرد. سەندیکاکان پشتگیری نەتەوەیان کرد له دژی یاخود له بەرامبەر چینی کرێکار که چینی خۆیان بوو. ئەمه بەتێپەڕینی کات بووه هەڵەیەکی کوشندە. بەڵام چینی کرێکاری وەك ڕێكخراو بچوك بوو. له «کرێکارانی نیل» چەندین کرێکار له ستوندی هەواڵگری و هەواڵنێری کاریان دەکرد. باشترین کار که «وافد» و پارتی کۆمۆنیستی کردیان ئەوەبوو که له بزوتنەوەی نەتەوەییدا کریکاران ڕۆڵێکی ناوەندیان گێرا. ناسر و کۆمیتەی کۆنسەی شۆڕش هەستیان بەمەکرد بەڵام بێ دەنگ بوون.

ئەوان سوپایان به دروستکەری مێژوو دادەنا. ئەمه پێش بینی ئەوان بوو.

**پۆتیك گۆش:** «گیلپیرت ئاچکار» له نوسینێکدا دەڵێت؛ کاری هەرەسەرەکی وەکو ئەرکێکی دیموکراتیانه ئەوەیه ئاین و دەوڵەت له یەکتری جیابکرێتەوه، ئەم ئەرکه لەوڵاتانی ئیسلامدا بەتایبەتی له ڕۆژهەڵاتی ناوەراستدا ئەمەنده قورس و گرانه تەنانەت دکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاش زەحمەتی بینی لەوەی که ئەم ئەرکه جێبەجێ بکات. شۆرشی «یاسەمین» دەتوانێت بێیته ئاماژەیەکی باش لەم ڕووەوه؟ ئەگەر وانەبێت بەبۆچوونی ئێوه هێزی چینی کرێکار له ناوچەکەدا دەبێت چی بکات بۆ ئەوەی زمانێکی ئایدیۆلۆژی کاریگەر دروست بکات؟

**ڤیجای پراشاد:** حەزمان له گەورەکردنی دەسەڵاتی پیاوانی ئاینیه، یا لایەنی کەم وا هەڵسوکەوت دەکەین که ئەمه ئەبەدیه یاخود سروشتی یه. بێگومان لایەنگرانی پیاوانی ئاینی له ١٩٧٠بەدواوه له سایەی ناودارانی نەتەوەیی و بۆگەن بوونی ڕژێمه عەلمانیەکانی دنیای عەرەبی له ساڵانی ١٩٥٠ کانەوه هەڵکشایه ژوور (دەوڵەتی نوێش لەمیانەی گواستنەوەی بیرۆکەی ناسری بۆ عیراق دروست بوون)، ئەمه پەیوەندیەکی زۆریان بەتێکچونی پرۆژەی جیهانی سێهەم «بەتایبەتی پارچەپارچه بوونی ئۆپیك له هاوینی ١٩٩٠ـەوه دەستی پێکرد و ڕێگای لەبەردەم داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوه کردەوه» هەروەها بووه هۆی ئەوەی که دنیا پەیوەندی زۆری به تەشویق کردنی سعودیەکان بۆ پێشەنگایەتی کردنی ئیسلامیەکان هەبوو. وه جیهان دەتوانێ کاریگەری

موســڵمانێتی لە چیچانســـتان تا پاکستان و پارچە کردنی هەندێکی ئەندەنوسیا بەخۆوە ببینێت.

ئەگەر بگەڕێینەوە دواوە و سەیرێکی قۆناغی پرۆژەی جیهانی ســێهەم وســەردەمی باڵادەستی بیرۆکەی ناســـری بکەین، ئەوا هەوڵی رۆشنبیرانی موسلمان لە ناوەندی تێکۆشان لە دژی مارکسیزم دەبینینەوە بە وەرگرتنی تەکنیکەکانی «بەلشــەڤی» لە دروستکردنی پارتیدا بۆ کۆکردنەوەی هێز. لەم بابەتەدا ڕەخنەی

م شیکردۆتەوە ســەبارەت بە جلدی کەپیتاڵ بەناوی ئابووریەکەمان کە باقر (sadrist stratagems)

سەدر نوسیویێتی. باقر مۆدێلی پارتی کۆمۆنێستی عیــراق وەردەگرێــت کە ئەوکاتە لــە گەرەکە شیعیەکانی بەغداددا زۆر بەهێز بوو. هەر سەبارەت بەو مەیلە ئەگەر زیاتر بەرەو رۆژهەڵات بچن. ئەوە ڕوبەڕوی ئەو راســتی یەی «حاجی مسباح» دێین کە لەمیانی ئاوێتەکردنی کۆمۆنســـتێکی ئیسلامیانە ئۆپۆزســـیۆنێکی دینامیکیانەی بەڕێــوە بردووە لە ئەندەنوسیا. لەوێ پیاوێکی ئاینی لەهەمان کاتدا بە قزل حاج دەناسرێت.

مسباحیش وەکو باقر لە کۆمەڵگای خۆیدا بۆتە ســـەمەرەیەك لە ناوداركردنی پارتی کۆمۆنیستی. ویســـتویەتی معنویـــات بداتە سۆســـیالزم. ئەمانە هەموویان بە پرۆژەی جیهانی سێهەم و مارکسیزم کاریگەر بوون. بەڵام یەکێکی تریش ویستویەتی کە مەعنەویات بخاتە پاڵ ئەمە، ئەویش پێشەنگایەتی «عەلی شـــەریعەتیە» لە ئێران، بەڵام ئەمرۆ پرسەکە بەتـــەواوی دژی هەموو ئەمانەیە. ئەو کرێکارانەی کە لە میانی زانســـتی سۆسیالیزمیدا دەجوڵانەوە بە نرخ دەبینران ئەمە هەروەکو ئەوەی ئێمە نارەحەتین بە زیاد بوونی پیاوانی ئاینی ئەوانیشی توشی ترس دەکرد.

کێشـــەکە لەوەدانیە کە زەحمـــەت بێت ئاین لە خاکی عەرەبەکان دووربخرێتەوە یا کێشـــەکە ئەوەبێـــت کـــە ئاینی ئیســـلام لـــە ئاینەکانی تر لاســـار تر بێت. ئەگەر ســـەیری هندستان یاخود ولاتەیەگرتوەکان بکەین ئەوا دەبینین کە زۆربەی کاتەکان هەوڵ نەدراوە بۆ نەهێشـــتنی کاریگەریی ئاین. لەیەکێتی سۆڤیەتیش بەهەمان رادە زەحمەت بوو کە کاریگەری ئاین کەمبکرێتەوە. ئەمە تەنها کێشـــەیەکی ئاینی یائیســـلامی نیە، ئەمە کێشەی گۆرانی کولتورییە. گۆرانی کەلتوری لە خوارەوە هیواش هێواش پێکدێت. هەرچی لە ســـەرەوەیە گۆرانی کولتـــوری زیاتر خێراترە. ئەمە پەیوەندی بە کۆنترۆلکردنـــی دەزگا کولتوریەکانەوە هەیە لەلایەن هەندێکەوە. وە لەهەمان کاتیشدا پەیوەندی بەقولایی ســـەرچاوە کولتوریەکانەوە هەیە. ئاین بەهۆی ناخۆشی و زەحمەت بوونی ژیان لەم هەزار ساڵەدا وەکو پەناگەیەك رۆڵی بینیوە و بەرادەیەکی وا چۆتە قولایـــی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەکانەوە کە دەرهێنانی کارێکی وا ئاسان نییە.

با ئاماژە بەوەش بکەم: مادام ئاســـۆی خەیاڵی سۆســـیالیزم لەبەرچاو کەوتووە، مرۆڤەکان بۆچی تیکۆشـــانی لەپێناودا بکەن؟ سۆســـیالیزم بیرۆکە دەست لێبەرنەدراوەکەی داوەتە دەست نەوەکانی داهاتوو تا هێزی خۆیان دروست بکەن. سیاسەتی علمانیەت لە خەیاڵ بێبەشـــە بـــەڵام ئاین خاوەنی دیدێکی نادنیاییە کە ناهەژێت.

هەرچەندە سیاســـەتی علمانیەت لەرۆژگاری ئەمرۆماندا ئیلهـــام بەخش نییە و لەوانەیە لەجیاتی

شۆرشـــگێڕی بوون بووبێتـــە ڕوخێنەریش بەڵام نابیناش نیە لەوەی لێبگەرێت ئایین چالاك بێت.

ســـەرهەلدانی عەرەبەکان لـــە ٢٠١١ هەواڵی ئاسۆیەکی نوێ دەداتە گەلی عەرەب. لەبەرئەوەشە لە توونســـەوە تا ئـــوردن درێژ دەبێتـــەوە. لەکار لاچوونی «بن عەلی» ئاسۆیەکی نوێی دیاری کرد. ئەمەش ئەو شتەیە کە گەنجەکان بە دەستیان هێناوە.

**پۆتیك گـــۆش:** پۆســـت کۆلۆنیـــال ئەوەی بەشێوەیەکی تیۆری لە پەرتوکی

باستان لێوەکردووە و پێشبینیتان کردووە:

**the derkar nations**

واتە ئایا ئەفسانەی دنیای سێ دژ بە ئیمپریالیزم کۆتایـــی پێنەهاتـــووە؟ ئەگەر وایە لێـــرە بەدواوە لەرووی پرۆگرامەوە تیکۆشـــانی دژ بە ئیمپریالیزم پێویستە چۆن بێت؟

**ڤیجای پراشاد:** ئەوەی لە پەرتوکی

**the derkar nations**

باسم لێوەکردووە بریتیە لەمێژووی بنکەوتنی پرۆژەی جیهانی ســـێهەم. ئەم کەوتنە لە ســـاڵانی ١٩٨٠ دەست پێدەکات. ریشـــەکەی لە ١٩٧٣ لە نەتەوە یەکگرتووەکان بە شکستهێنانی

قۆناغـــی سیســـتەمێکی نـــوێ ی ئابووری و نەمانی پشـــتگیریەکانی ئۆپێك و ئیفلاســـکردنی مۆدێلی پیشەســـازیی و هاوردە و نیشـــتەجێبوون و تەســـك بوونەوەی ئازادیە سیاســـیەکان لە نیوە گۆی باشـــووری زەوی دەســـتپێدەکات. پێکانی پرۆژەکە لەسالی ١٩٨٠ بە قەیرانی قەرز لەمەکسیك دەست پێدەکات لەکۆتایی سالانی ١٩٨٠ ئەمریکا بالادەســـتی خۆی دەسەپێنێت و هەوڵی سەرلەنوێ دارشتنەوەی سیســـتەمی جیهانی دەدات، هەروەها هاندانـــی رژێمی ســـەدام لەلایـــەن ئەمریکاوە بۆ گرتنی کوێت یەکەمیـــن هەنگاوی ئەم پرۆژەیەیە کاتێك یەکێتی سۆڤیەت ئەوە رەت دەکاتەوە کەبۆ ســـەدام نێوبژیوانی بکات، بەمـــەش عێراق ئاوەڵا دەبێت بۆ ئەمریکا و ئەمریکا باڵادەســـتی تەواوی خۆی دەسەپێنێت بەسەریدا و خوێ بەسەر پرۆژەی جیهانی سێهەمدا زاڵدەکات.

**سەرچاوە:**

**/http://dunyadanceviri.wordpress.com**

# ڕۆحێکی نوێ لە شۆڕش

چاوپێکەوتنی مۆنا نەققار
و. لە ئینگلیزییەوە: ئەحمەد ئەسکەندەری

صادق جـــلال العظـــم یەکێکە لـــە گەورەترین بیرمەندانی ڕەخنەگری عـــەرەب. لە چاوپێکەوتنێکدا ڕووناکی دەخاتە ســـەر ڕۆڵی ڕووناکبیران لە بەهاری عەرەبی و لە دۆخی ئێســـتای بزووتنەوە نارەزاییەکانی ناوچەکە.

زۆربـــەی ڕووناکبیرانی عەرەب لە کاتی ئێســـتادا پشـــتگیری لە شۆڕشـــەکان دەکەن بەتایبەت لە میسر و توونـــس. بـــەڵام پێـــش تەقینـــەوەی بزووتنەوەی نارەزایەتـــی هەڵوێســـتی زۆرێـــك لـــە ڕووناکبیران بەرامبـــەر دیکتاتۆرەکان ڕوون نەبوو. ئایا کاتی ڕەخنە لەخۆگرتنێك نییە؟

**صادق جلال العظم:** پێم وانییە کەســـێك بووبێت کـــە ڕۆژێك لە ڕۆژان لەســـەر ڕووناکبیرانی عەرەب لێکۆڵینەوەیەکی کردبێت بۆ دیاریکردنی هەڵوێست و بۆچوونی ئەوان. ئەم چەشـــنە خوێندنەوانە لەم بەشە لە دونیای ئێمەدا زۆر دەگمەنە. ئێمە تەنها پشت دەبەستین بە وێناکردن، هەســـتپێکردن و لێکدانەوەی دەسبەجێی

ڕووداوەکان.

بۆ نموونە ئەگەر بیر لە ڕووناکبیرێکی میسری بکەینەوە کە لە سیستەمێکی تۆتالیتاردا دەژی، ئەو ناچارکراوە لەوەی کە لەگەڵ سیستەمەکەدا بگونجێت. من پێموانییە کە ئەو خزمەتی بە سیستەمەکە کردووە. من بەپێی ئەزموونی ژمارەیەك لە ڕووناکبیران دەزانم کە ئەوان ناچاربوون چەند سازشێك بکەن لەبەر ئەوەی بتوانن درێژە بە کارکردن بدەن وەکوو مامۆستای زانکۆ یان نووسەر – سازشی وەها کە بەبۆچوونی من هەرچۆنێك بێت، ئەوەندەش سازشکاری نەبووە.

کاتێك دواجار شۆڕشێك وەکوو ئەوەی میسر ڕوودەدات، زۆرێك لە ڕووناکبیران ڕێك هەروەکوو هەر کەسێکی تر ڕەفتار دەکەن: هەندێك دەترسن، ئەوانی دیکە چالاکانە بەشداری دەکەن. ئەگەر شۆڕش سەرکەوت، هەموو زریانە خەوەکان دەڕەوینەوە و ڕۆژانی چاوپۆشی کردن کۆتایی پێدێت. ئێستا ئەوان دەتوانن بە ئازادی بجووڵێنەوە.

من پێموانییە پێویست بکات ئەم ڕووناکبیرانە بکەونە هیچ چەشنە ڕەخنە لەخۆگرتنێك. لە باشترین حاڵەتدا دەتوانن هەندێك ڕوونکردنەوە بخەنە بەردەست. بەڵام تاقمێکی دیکەیش هەیە، واتە ئەوانەی کە خۆیان کردووە بە زمانحاڵی ڕژێم. ئەوانە یان لە میدیاکان کاریان کردووە یان ستایشی سەرۆکیان کردووە. ئەوانە ئەگەر لە ساتەوەختێکدا ئاوەزێکی گوناهبار تەنگیان پێهەڵچنێت، دەتوانن داوای لێبوردن بکەن. بەڵام بەبێ گوێدانە ئەوەی ئەوانە چیدەکەن، کەس باوەڕیان پێناکات. ئەوان ناتوانن رابردوو بسڕنەوە. زۆربەی ئەوانە خۆیان لە پێش چاوی خەڵکی دەدزنەوە.

ئایا نابێت گفتوگۆیەکی کراوە بکرێت سەبارەت بە هەڵوێستی ڕووناکبیرانی جۆراوجۆر؟

صادق جلال العظم: هێشتا زۆر زووە بۆ ئەو

چەشـــنە گفتوگۆیانە. دەنگەکان پێویستە لە ناوەوە بێن و بانگەوازی خەڵك بکـــەن بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ ئەوەی کە روویداوە. من نامەوێت زۆر بە توندی رووناکبیران بخرێنە ژێر گوشارەوە، مەگەر ئەوەی کە دۆخەکە وەك شووشـــەی روون بێت، هەروەکـــوو لە حاڵەتەکەی جابـــر غفور، راگری ئەنجومەنـــی بـــاڵای فەرهەنگی میســـر و دوایین وەزیری فەرهەنگ لە ژێر دەسەڵاتی موبارەکدا. لە ساتەوەختێکدا ئەو مەودایەکی خستە نێوان خۆی و رژێـــم. بەڵام دواتر ئـــەو مەودایە لەبەین چوو. ناگونجێت هیچ چەشـــنە رێزێك هەبێت بەرامبەر بە وەها کەســـانێك. ئێستا ئێمە لیستەیەك لە کەسان و دامـــەزراوان دەبینین کە دەرکەوتووە پارەیان لە رژێمـــی لیبی وەرگرتووە. پـــاش راپەرین کاتێك پێکهاتەیەکی دیموکراتی و مەدەنی سەرهەڵدێنێت، هیوای ئەوە هەیە پێویست بکات کە گفتوگۆیەك بخرێتەگەڕ. بەڵام لەڕاستیدا من لەسەر ئەو باوەڕەم کە رووناکبیـــران رۆڵێکی ســـەرەکییان گێڕا لە دامەزراندنی کاری بناغەیی شۆڕشەکەدا.

مەبەســـتت لەوە چییە؟ خۆ ئـــەوە گەنجەکان بوون کە شۆڕشەکەیان بەڕێوەبرد، وانەبوو؟

**صـــادق جـــلال العظـــم:** بـــۆ ماوەیەکی زۆر رووناکبیران — هەرکات گونجابێت و جاری وایش بووە بە شێوەیەکی سیمبۆلیك و زۆرتر ناڕاستەوخۆ — لە لایـــەن کۆمەڵگای مەدەنییەوە هەڵوێســـتیان دەربڕیوە. ئەوان بۆ مافی مرۆڤ خەباتیان کردووە. نموونەیەکی ئەوە «راگەیاندنی ٩٩» بوو لە ســـاڵی دوو هەزاردا کە لـــە لایەن نەوەدونۆ رووناکبیری ســـوورییەوە ئیمزا کرابوو. ئێمـــە لەوێدا دەتوانین نزیکەی هەموو ئەو دروشـــمانە بخوێنینەوە کە لە سەر شـــەقامەکانی توونس و میسر بەرز کرانەوە: لابردنی دۆخی نائاسایی و بانگەوازی ئازادی.

دەتوانی هەمـــوو داواکارییـــەکان، هیواکان و ئاراســـتەی سیاســـی گشـــتی لەو راگەیاندنەدا بدۆزیتـــەوە. بەتایبەتی رووناکبیرانی ســـیکولار و هۆشـــیار رۆڵێکی مەزنیان گێـــڕا. تەنانەت حیزبە ئایینییـــە گـــەورەکان وەکوو اخوان المســـلمین کەوتنە بـــەر کاریگەری ئەوان. هەروەها «مۆدێلی تورکی»یش رۆڵێکی هەبوو. مەبەستم ئەو مۆدێلەیە کە ئیســـلامی تورکیا دەگرێتە خۆی: حیزبێك بە ئامانجی ئیســـلامییەوە، لە وڵاتێکی ئیسلامیدا کە رابردوویەکـــی ئیمپراتۆری هەیە، بە شـــێوەیەکی دیموکراتییانە و ئاشـــتیخوازانە دەگاتە دەسەڵات بەبێ ئـــەوەی هیچ کەســـێك گومـــان بکات لە رەوابوونـــی هەڵبژاردنەکە و بەبێ ئەوەی وڵاتەکە بخزێتە ناو کارەساتەوە هەروەکوو لە وڵاتانی دیکە بینیومانە کە تیایاندا حیزبە ئیسلامییەکان هەوڵیاندا بە دەسەڵات بگەن، وەکو میسر، سووریا، جەزایر، و ســـوودان. رووناکبیرانێکی زۆر ســـەبارەت بەم مودێلە گفتوگۆیان کردووە، سەبارەت بە گرنگ بوونەکەی قسەیان کردووە و بیریان کردووەتەوە ئایا ئەوە دەهێنێت کە لاسایی بکرێتەوە.

ئێوە یەکێك بوون لەوانەی «راگەیاندنی ٩٩»تان ئیمزا کردووە و یەك لـــەو رووناکبیرانە بوون کە هەمیشـــە پشـــتگیریتان کردووە لە مافی مرۆڤ و ئازادی رادەربڕین. ئایا ئەو هەســـتەتان هەبوو کە هەوڵدانەکانی ئێوە سەرەنجام بەرەو ئەم راپەڕینانە رێگا دەبڕێت؟

**صـــادق جلال العظم:** من رێـــگا بەخۆم نادەم بانگەشـــەی ئەوە بکەم کە هەوڵەکانی من رێگای

ئەم شۆڕشـــانەیان خۆش کردووە. بەڵام بەبێ شك کۆششـــێکی زۆر لە ئارادا بـــووە. ئەمە نەك هەر کاری رووناکبیـــران دەگریتەوە، بەڵکوو هەروەها ڕاســـتییەکانیش دەگریتەوە و ئـــەوەی کە چۆن رووناکبیران بەرامبەر بەوانە کاردانەوەیان هەبووە. کەســـانێکی زۆر باسیان لە شکســـتهێنانی مۆدێلی جۆراوجۆر دەکرد، بۆ نموونە مۆدێلی سوسیالیزمی عەرەبی یان ناسریسم. ئەوان دەستیان کرد بە گەڕان بەدوای بژارەکاندا و بەو دەرەنجامە گەیشـــتن کە ئەوە دیموکراسییە دەتوانێت ببێتە تاقە بەدیل.

سەرەڕای ئەو خاڵانەی باستان کرد، ئەمرۆکە ڕۆڵی رووناکبیرانی عەرەب لە کۆمەڵگادا هیشـــتا بچووکە. ئەمە چۆن لێکدەدەیتەوە؟

**صـــادق جلال العظم:** ڕۆڵـــی رووناکبیران، لە لایەکەوە لاوازە، بەڵام ئەمە لایەنێکی دیکەیشـــی هەیە: ئێمە لەژێر کارتێکردنی مۆدێلی رووناکبیری فەرەنسادایین کە لەسەر پرسە گرنگ و گەورەکان رادەوەستن و خۆتێوەردەدەن. لەلایەکی ترەوە لەو کۆمەڵگایانەی کە ئاستێکی بەرزی نەخوێندەوارییان تێدایە، رووناکبیران تەنانەت ڕۆڵێکی گەورەتریش دەگێڕن. نـــەك لەبەر ئـــەوەی ئـــەو رووناکبیرە گرنگییەکی تایبەتی هەیـــە یان بیرکردنەوەی ئەو قووڵاییەکی تایبەتی هەیە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە گرنگ بوونەکەی ئەو دەبێ بەگوێرەی پەروەردە و فەرهەنگی ژینگەکەی سەرنجی بدرێتێ.

رووناکبیـــر لای ئێمە، چەشـــنێك لە پێگەی مامۆستایەکی ئایینی بە میرات پێگەیشتووە. چەشنێك لەو ڕێزلێنانەی بەرامبەر بە کەســـایەتییە ئایینییەکان نیشان دەدرا، گوێزراوەتە سەر رووناکبیرەکانیش. بەڵام کاتێك دێتە ســـەر کاریگەرییان، لەڕاستیدا مەودای چالاکبوونیان ئێجگار زۆر ســـنووردارە. ئەگەر هەموو شـــارۆمەندان لـــە ئازادیدا ژیابایەن ئـــەوە دۆخەکە جیاواز دەبـــوو. ئەگەر بۆ نموونە بگونجایـــە کە لە زانکۆدا بە سەربەســـتییەوە وانە بگوترێتەوە و ڕای خۆت دەرببڕیت. لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا رووناکبیران ڕۆڵێکی سەرەکیان هەبوو لە ئامادەکردنی زەمینـــە بۆ رووخانی دیکتاتۆری. ڕۆڵی رووناکبیرانی عەرەب لەباری ئەکادیمییەوە لاوازترە، بەڵام هێشتایش هێندێك لێکچوون هەیە.

ئایا چاوەڕوانی ئـــەوە دەکەیت کە دوای ئەم

**حیزبێـــك بـــە ئامانجـــی ئیســـلامییەوە، لـــە وڵاتێکی ئیســـلامیدا کە ڕابردوویەکی ئیمپراتـــۆری هەیـــە، بـــە شـــێوەیەکی دیموکراتییانە و ئاشـــتیخوازانە دەگاتـــە دەســـەڵات بەبێ ئەوەی هیچ کەســـێك گومان بـــکات لە ڕەوابوونـــی هەڵبژاردنەکـــە و بەبێ ئەوەی وڵاتەکە بخزێتە نـــاو کارەســـاتەوە هەروەکوو لە وڵاتانـــی دیکە بینیوومانە کـــە تێیانـــدا حیزبـــە ئیسلامییەکان هەوڵیاندا بە دەسەڵات بگەن، وەکو میسر، سووریا، جەزایر، و سوودان.**

ڕاپەڕینانە ڕووناکبیران ڕۆڵێکی چالاکانەتر بگێڕن؟

**صادق جلال العظم:** من ناتوانم پێشبینی ئەوە بکەم کە چی دەقەومێت، بەڵام لانیکەم هیوادارم وەها بێت. میسر و توونس خەریکن بە «قۆناغێکی کاریسماتیك»دا تێپەڕ دەبن — واتە حاڵەتێکی ئازادی و مەستی. ژیانی ڕۆژانە دەگەڕێتەوە. ئەم ڕۆحەیش هەروەها دەڕژێتەوە ناو دامەزراوە تازە بنیادنراوەکان و دەچێتە ناو چاکسازی ئەو دامەزراوانەی ئێستا بوونیان هەیە.

گەورەترین شتی چاوەڕواننەکراو بۆ ئێوە سەبارەت بە شۆڕشی میسر و توونس چی بوو؟

**صادق جلال العظم:** دووربوونی ڕەها لەو شێوەکارانەی لە بزووتنەوە ناڕەزاییەکانی پێشووتردا کەڵکیان لێوەرگیرابوو. جاران، ئاڵاکان بە دروشمی وەکوو «مردن بۆ ئەمریکا، مردن بۆ ئیسرائیل» یان «دوژمنانی گەل شیاوی ئازادی نین» دەڕازێنرانەوە. ئەم هەست دەربڕینانە لەپڕێکدا ونبوون. دابڕانیش لەوانە بە شێوەیەکی لەسەرەخۆ نەبوو، بەڵکوو بەخێرایی بوو. لە بزووتنەوە ناڕەزاییەکانی پێشوودا هەمیشە کەش و هەوایەکی قەیراناویی هەبوو.

ئێستا شتەکان بەتەواوەتی جیاواز بوون. ئێستا ئێمە لە دونیای عەرەبدا ئەزموونی بزووتنەوەیەکی ناڕەزایەتیمان هەیە کە لەو کاتەدا سەرۆکێك دەرووخێت مۆسیقا لێدەدرێت، خەڵك سەما دەکەن، شیعر دەخوێننەوە و پفدان دەخەنە حەوا. ئەمە هاوشێوەی ئەو شتەیە کە ئێمە لە ئەورووپا و لە ئەمریکا لەگەڵی ئاشناین. ڕۆژەکانی بزووتنەوە ناڕەزاییەکانی پێشوو زۆر لەمێژ نییە تێپەڕیوون. هەر ئەوەندە بەسە بیر لە نارەزایی دەربڕینەکان لە دژی کاریکاتۆرەکانی محەممەد لە دانیمارك، یان «ئایەتە شەیتانییەکانی» سەلمان روشدی و یان خۆپیشاندانەکان بۆ فەلەستین بکەینەوە.

ئێمە ئێستا خەریکین ڕۆحێکی نوێ و کردارێکی نوێ دەبینین. ئەمەش شاهیدێکە بۆ ئاستێکی بەرزی پێگەیشتوویی. تەنانەت ئەو دەربڕینە ئایینییانەی گوێمان لێبوو سروشتێکی تاکەکەسییان هەیە. هەرکەس کە ویستی نوێژ بکات، کردی. هەرکەس کە نەیویست نوێژ بکات، ناچارنەبوو بیکات. هەرکەس کە ویستی لە ژێر خاچێکدا بوەستێت چوو ئەو کارەی کرد.

* صادق جلال العظم ساڵی ١٩٣٤ لە دیمەشق لەدایکبووە. لە بەیرووت فەلسەفەی خوێندووە و وەکوو مامۆستا لە زانکۆی نیویۆرك، بەیرووت، عەممان و دەمشق دەرسی گوتووەتەوە. سەردێڕی یەکێك لە ناسراوترین بەرهەمەکانی «ڕەخنە لە بیرکردنەوە ئایینییەکان» ە. دوایین بڵاوکراوەی ئەو بریتییە لە «**Ces interdits qui nous hantent**»، ‹ئەو قەدەغەکردنانەی کە بەردەوام سەردانمان دەکەن›. العظم ساڵی ٢٠٠٥ لە زانکۆی هامبوورگ لە ئەڵمانیا دکتۆرای فەخری پێبەخشراوە.

**سەرچاوە:**

http://en.qantara.de/wcsite.php?wc_c=15850

# ڕێگای سێیەمی میسر

# وتووێژ لە گەڵ: سلاڤۆی ژیژەك و تاریق ڕەمەزان

و.لە فارسییەوە: مستەفا زاهیدی

ئەوەی دەیخوێننەوە وەرگێڕانی وتووێژی کەناڵی تەلەفیزیۆنـــی ئەلجەزیرەیە لە گـــەڵ تاریق ڕەمەزان، ئیسلامناسی زانکۆی ئۆکسفۆردو نەوەی دامەزرێنەری ئیخوان موسلیمینی میسر. تاریق ڕەمەزان لە دایکبووی سویســـرایەو لە زانکۆکانی ژنێڤی سویسرا، ئەزهەری میسر، لە بوارەکانی ئەدەبی فەرەنسا، عەرەبیو زانستی ئیسلامیدا خوێندنی تەواو کردووە.

یەکێك لەو باســـانەی لەم ماوەدا مشتومڕی زۆری لێکەوتەوە لە ســـەر ژیانی ئەم لێکۆڵەرە کە لە زانکۆ جیاوازەکانـــی ڕۆژئاوا وانەی وتووەتـــەوە، ئەوە بوو کە ئەمریـــکا ڤیزەی پێنەدا، ســـەرەنجام بە ناوبژیوانی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ئەم باســـە کۆتایی پێهات. ئاغای ڕەمەزان لەناو ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوادا بیرمەندێکی گەورەو ناودارە. ڕەمەزان بە بەرگری کردنێکی تەواو لە کلتـــووری ڕۆژئاوا لە بەرامبەر موســـلمانەکاندا لە لایەکەوەو ڕەخنەگرتن لە ترســـی ڕادیکاڵ لە ئیسلام لە بەرامبـــەر ڕۆژئاواییەکاندا لـــە لایەکیترەوە، ئەمڕۆ جێگەیەکی تایبەتی هەیە لە ناو ڕۆشنبیراندا.

**ئەو هەوڵانەی بۆ ئازادی دەدرێن هاوپەیمانی جیهانی دروستدەکات. ئازادی بنەمایەکی گشتگیرەو ئەوەی لە تونس روویداو لە میسر لە ئارادایە بزاوتێك نییە بەرەو فێندەمێنتالیزمی ئایینی، بەڵکوو شۆڕشێکە راست بەرەو بنەمایەکی ئەخلاقی جیهانی، بەرەو ئازادی، عەدالەتی ئابووری، بە جیهانیبوونو گشتگیر بوونە کە ئەمرۆ ئێمە باسی لێوە دەکەین.**

لەم وتوویژەدا رەمەزان جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە دیموکراسی جێگای دیکتاتۆرییەتی موبارەك بگرێتەوەو ترسی رۆژئاوا لە ئیسلامگەرایی زیاتر بە ترسێکی ئایدۆلۆژیایی دەزانێت نەك ئەو واقعەی لە میسر دایە. ئەم مامۆستای زانکۆیە باس لە گۆڕانەکانی ئیخوان موسلمین دەکات لە ٨٠ ساڵی رابردوودا و لای وایە هیچ ویکچوونێك نییە لە نێوان حیزب و ئیسلامگەراییدا کە دوای شۆڕشی ئیسلامی ئێران هاتۆتە سەر کار. رەمەزان لە سەر ئەو باوەڕەیە ئیخوان موسلمین زیاتر خۆیان بە (مۆدێلی ئیسلامی) تورکیا نزیکتر دەبینن نەوەك ئێران.

کەسێکیتر کە لەم وتوویژەدا ئامادەیە، سلاڤۆی ژیژەك، رەخنەگری کۆمەڵایەتی و فەیلەسووفی رادیکاڵی سلۆڤانیاییە کە بۆچوونەکانی باس و مشتومڕی زۆری لێکەوتۆتەوە. ئەم فیلسووفە(ژیژەك) تەنانەت لیبراڵ دیموکراسی رۆژئاوایی بە رێگا چارەی دەربازبوون لەم قەیرانە نازانێ و بە شوێن رێگاچارەی ترەوەیە. ژیژەك لە کۆمەڵێك زانکۆ لەوانە پرینستۆن، نیۆیۆرك، میشیگان، کۆلۆمبیا، کالیفۆرنیادا وانەی وتۆتەوە، بەڵام لە هەمانکاتدا هیچکات دەستبەرداری رەخنەگرتن لە ئەمریکا و سیاسەتەکانی نەبووە... ژیژەك خۆی بە کەسێکی کۆمۆنیست دەزانێت، بەڵام بەو پێناسەیەی خۆی بۆ کۆمۆنیست هەیەتی.

ژیژك لە بەشی کۆتایی وتوویژەکەدا، ئاماژە بە پشێوییەکانی دوای هەڵبژاردنەکانی ئێران و بزووتنەوەی سەوز دەدات و ناوی موسەوی دێنێ و بەراورد کردنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران و شۆڕشی خەڵکی میسر بە شتێکی هەڵە دەزانێت.

ئەم تووێژە چەند رۆژێك پێش لەوەی موبارەك لە دەسەلات لابرێت ئەنجامدراوە، بەڵام ئەمڕۆکە لە حاڵێکدا موبارەك لە سەر کورسی دەسەلات نەماوە، ئەم وتوویژە سەرەنجڕاکێشترە، لە بەر ئەوەی ئێستاکە ئەنجامی ئەو شۆڕشە دەزانین ، هەڵوێستی

ڕۆژئـــاواو ڕووناکبیران لەو ســـەردەمەدا بە ڕوونی دەبینین. هەروەها نێگەرانییەکانی ڕۆژئاواو ستراتیژی میســـر بۆ پاش لە سەر دەســـەڵات نەمانی موبارەك هەست پێکراوترە لەو کاتە.

** **ئەلجەزیـــرە:** لـــە حاڵێکدا قەیرانی میســـر هـــەروا بەردەوامـــە، پرســـیار ئەوەیـــە ئاخۆ ئەم ڕۆحیەتە شۆڕشگێڕانەیە ئەنجامێکی هەستپێکراوی لێدەکەوێتەوە یان ئـــەوەی خەڵك ناچار دەبن بۆ دۆخی پێشـــویان-ڕژێمی موبـــارەك- بگەڕێنەوە؟ لە حاڵێکدا خۆپیشـــاندەران جگە لـــە وازهێنان لە دەســـەڵاتی موبارەك بە هیچ شـــتێکیتر ڕازی نین، وڵاتانی ڕۆژئاوا بە شـــێوەیەکی ئاشکرا دوودڵن لە بڕیارەکانیاندا. ئاخۆ نەمانـــی ڕژێمێکی تۆتالیتەری سیکۆلار، هاتنە سەرکاری دەسەڵاتێکی توندڕەوی ئیسلامی لێدەکەوێتەوە کە دژ بە ڕۆژئاواو ئیسرائیلە؟ میسر بە شوێن دیاریکردنی چارەنووس و بونیادنانی داهاتوویەکی نوێوەیە. ئاخۆ ئەڵترناتیڤێکیتر جیاواز لـــەو چوارچێوە بوونـــی هەیە یان نـــا؟ ئاخۆ ئەم نائارامیانەی میسر دەکرێ ئەڵترناتیڤی سیاسی نوێی لێبکەوێتەوە یان نا؟ ئاخۆ لە میسر شۆڕش بەڕێوەیە؟

**تاریق ڕەمەزان:** بەڵێ من لام وایە بەمجۆرەیە. ئەوەی لە تونس ڕوویداو ئێستا لە میسر لە ئارادایە، شتێکی دوور لە باوەڕ و هەڵبەت تا ڕادەیەك پێشبینی هەڵنەگرە. ئەوەی لە ئارادایە شۆڕشێکەو ئێمە دەبێ گوێ بدەین بـــەو خەڵکەی کە دەڵێن:»دیکتاتۆری بەسە، دەسەڵاتی موبارەك‌و ڕژێمەکەی ئەبێ نەمێنێ و بڕۆن.» ئـــەوەی ئێمە دەمانەوێ دیموکراســـی‌و ئەو پێگەو شکۆیەیە کە شـــیاوی ئێمەیە. ئەمە ئەو شـــتەیە کە دەبێ لێیتبگەین. هـــەر بۆچوونێك لە ســـەر ئەو باوەڕە داڕێژرابێت کە بڵێت یان ئەوەیە

دەبـــێ ڕژێمێکی تاکەکەســـی دیکتاتۆر لە ســـەر دەسەڵات بێت یان ئیســـلامگەرایی ڕادیکاڵ، ئەو بۆچوونە لە سەر بنەمایەکی ئایدۆلۆژیایی‌و بە پێش گریمانەیەکی ئایدۆلۆژیاییەوە(خەریکی بڕیاردانە) نەك ئەو ڕاســـتییەی لە میســـر لە ئارادایە. شۆڕشی میسر لە حاڵێکدا ڕوودەدات کە خەڵکی میسر هاوار دەکەن ئێمە خوازیاری گۆڕان و ئازادین.

**ئەلجەزیـــرە: بەڕێـــز ژیژەك، تـــۆ دەربارەی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، تۆنی بلێر نووسیوتە: بلێر دەترسێ و بە گومانە دەربارەی ئەم ڕەوتی گۆڕانی دەســـەڵاتە لە میســـردا و وتوویەتی ڕۆژئاوا دەبێ دۆخی میسرو ڕەوتی گۆڕینی دەسەڵات بە دەستەوە بگرێ. بە گشتی وادیارە ڕۆژئاوا زۆر لەو ڕووداوانە دەترسێت کە لە جیهانی عەرەبدا لە ئارادایە. تۆ ئەم بابەتە چۆن دەبینی؟ ئاخۆ تۆ لات وایە بلێر لە سەر ئەو باوەڕەیە میسرییەکان و جیهانی عەرەب ئامادە نین دیموکراسی وەربگرن:

**ژیژەك:** هەڵبەت ئاغای بلێر بە ڕوونی ئەم شتەی نەوتـــووە، بەڵام من لام وایە ئەگـــەر بە وردی لە ناوەڕۆکی پەیامەکـــەی ورد بیتەوە هیچ ناڕوونییەك نابینی. قســـەیەکی نەستەقی فەرەنسی هەیە ئەڵێت:» هەرچی زیاتر بگۆڕدرێ زیاتر وەك پێشت دەچێت.» من لام وایە جیهانی ڕۆژئاوا بە گشتی — من لێرەدا بلێر بە نوێنەری ئەو جیهانە دەزانم- دەیەوێ جیهان بە هەمان شێوەی کە هەیە بمێنێتەوە. دەمەوێ بڵێم تەبا و هاوڕام لە گـــەڵ وتەکانی تاریق. تۆ دەزانی لەم سەردەمە مێژووییەدا، کە جیهانی فرەکلتووری ئێمە دوودڵە بەرامبەر گشتگیر بوونی بنەمایەکی وەك دیموکراســـی ڕۆژئاوایی، ئێمە دەمانەوێ کلتوورە جیاوازەکان لە یەکتر تێبگـــەن. ئەوکاتەی چاو لە

وێنای گشـــتی قاهیرە دەکەین و گوێ دەدەین بەو وتووێژانەی لە گەڵ بەشداربوانی خۆپیشاندەران و نارازییەکاندا ئەنجـــام دەدرێن، دەبینین ئێمە تاچەن نزیکین لـــە یەکتـــر و ئەمە کاریگـــەری قووڵی لە ســـەرم بووە. ئێمە بە شوێن گشـــتگیر کردنی بنەماکانمانەوەین. لە گەڵ یەکتر هەست بە یەکبوون و نزیکایەتی لە گەڵ یەکتر دەکەین و ئەمە هەمان ئەو شـــتەیە بە یەکبوونی جیهانی ناوی لێدەبرێت. ئەمە لە رێـــگای کارەکانی یۆنســـکۆو رێزگرتن بۆ کلتوورەکان بەرێـــوە ناچێت. ئەو هەوڵانەی بۆ ئازادی دەدرێن هاوپەیمانی جیهانی دروستدەکات. ئازادی بنەمایەکی گشـــتگیرەو ئـــەوەی لە تونس روویداو لە میســـر لە ئارادایـــە بزاوتێك نییە بەرەو فێندەمێنتالیزمی ئایینی، بەڵکوو شۆڕشـــێکە راست بەرەو بنەمایەکی ئەخلاقی جیهانی، بەرەو ئازادی، عەدالەتی ئابووری، بە جیهانیبوونو گشتگیر بوونە کە ئەمرۆ ئێمە باسی لێوە دەکەین. ئەمە ئەو شتەیە ئەمرۆکە ئێمە لە میسر دەیبینین... خۆپیشاندەرێکی میسری وتی شـــانازی دەکات بەوەی کە میسرییە. منیش شـــانازیان پێـــوە دەکەم. شـــانازیان پێـــوە دەکەم. وانەیەکی گەورەیان پێدایـــن... بنەمایەکی هەڵەی جێـــگای رێـــز کە لە راســـتییدا لە ســـەر بنەمای دەمارگرژی و رەگەز پەرەستی دامەزراوە، ئەوەی کە عەرەبەکان کلتووری تایبەت بە خۆیان هەیە و ناتوانن بەرەو دیموکراسی برۆن، بەڵام عەرەبەکان نیشانیاندا بە دیموکراسی گەیشتوون. ئەوان دەزانن دیموکراسی چییەو دەزانن چی دەکەن. زۆر باشتر لەوەی ئێمە لە رۆژئاوا پێیەوە ســـەرقاڵین. کە وایە من شـــانازیان پێوە دەکەم ئەمە باشترین گفتوگۆیە دژ بـــە رووبـــەڕوو بوونەوەی شارســـتانیەتەکان و شتی لەو چەشـــنە کە ئێمە دەتوانین لە تەلەفیزیۆن ببینین. ئێمە لە یەکبوونێکی تەواودایین‌و رووبەڕوو بوونەوەی شارستانییەتەکان لە ئارادا نییە. هیچ لێك تێنەگەیشتنێك لە گۆڕێدا نییە.

بەشی دووهەم: پێویستی ئایدیای چەپ

**ئەلجەزیرە: بە لەبەرچاو گرتنی ئەڵترناتیڤەکان، ئاخۆ ئیسلامگەرایی یان هەر پێوەندییەکیتر لەگەڵ ئیسلامی سیاسی دەتوانێت لەگەڵ لیبراڵ دیموکراسی رۆژئاواییدا لە داهاتووی میسر یان هەر وڵاتێکیتری ناوچەکە بگونجێ و هەڵبکات؟

**تاریق رەمەزان:**

ئەوەی ئاغای ژیژەك باسی لێوەکرد زۆر گرینگە. ئەو کاتەی ئێمە لە رۆژئاوا یان لە وڵاتانی رۆژئاواییەوە بۆ دۆخی وڵاتانی عەرەبی دەڕوانین، دەڵێین ئەگەر ئەم رژێمە دیکتاتۆرانە لەسەر کارنەبن، بەدڵنیاییەوە لەم دەســـەڵاتانە خراپتر، دەسەڵاتی خراپتر، بۆ وێنە ئیسلامگەرا توندڕەوەکان، دێنە سەرکار. رۆژئاواش پەرە بەم روانگەیـــە دەدات. هەر لە بەر ئەمەیە ئەم رژێمانە ئەوە چەندین ساڵە لە لایەن رۆژئاواییەکانەوە پشتیوانییان لێدەکرێت. رۆژئاوا دوای کۆبوونەوەی گەورەو لە راستییدا دوای شۆڕش پشتیوانی لە توونس کرد. بە دەربڕێنێکیتر-لە رۆژئاوا- کاتێك پشتوانی لە بەها دیموکراتیکەکان و مۆدێلە دیموکراتیکەکان دەکەین کە لـــە بەرژوەندیماندا بێـــت، ئەوە نییە لـــە رووی بڕوامانەوە بۆ ئەو بەهایانە، پشـــتیوانیان لێبکەین. ئەگەر ئێمە باوەڕمان بە گشتگیربوون و بە جیهانیبوونی بەها دیموکراتیکەکانی-وەك بەرابەری و ئازادی- هەیەو دڵنیاین لەو شـــتە، کەوایە دەبێ پشـــتیوانی لە خەڵکی میســـر بکەین، نەك ئەوەی بێدەنـــگ بین‌و بڵێین چـــاوەڕوان دەبین بۆ ئەوەی

بزانین چی روودەدات، تەنها لەبەر ئەوەی ئاسایش‌و پارێزگاری لە ئیسرائیل بەلامانەوە گرنگە. دەوڵەتی ئیسرائیل دەڵێت پشتیوانی لە موبارەك دەكەین لەبەر ئەوەی ئەگەر موبارەك نەمێنێ، ئیسلامگەراكان دێنە سـەركار. ئەمە چ لۆژیكێكە ئیسـرائیل لای وایە ئەمنیەتی ئیسـرائیل تەنها بە بوونی دیكتاتۆرەكانی چواردەوریـەوە پارێزراوە. بەڵام ئەمە بۆچوونێكی هەڵەیە.

**دەمـەوێ دەربـارەی ئیسـلامی رادیكاڵ پرسیارت لێبكەم كە لەم رۆژانەدا لە راگەیاندنەكاندا زۆر باسـی لێوە دەكرێت. ئاخۆ ئەگەر ئەم ترسـە ترسێكی راستە، ولاتانێكی وەك عەرەبستانی سعودی كە لەم ولاتانەدا مافی ژنان بە تەواوی پێشێل دەكرێ‌و تەنانەت مافی سەیارە لێخورین و شۆفێریشیان نییە، نەدەبا باسـی لێوەكرابا؟ بەڵام عەرەبستانی سعودی بەم خوێندنەوەیەوە بۆ ئیسلام هێشتا گرێبەستی ٦٠ میلیارد دۆلاری چەك‌وچۆڵی هەیە لە گەڵ ئەمریكا. ئەگەر ترس لەم جۆرە خوێندنەوە بۆ ئیسلام راستە، نەدبا عەرەبستانی سعودی بە جێگەی ولاتانێكی وەك میسر و توونس لە چەقی ئەم مشتومڕانەدا بایە؟

-راسـتە، ئەگەر ئێمە زۆر جیدیین دەربارەی ئـەم نیگەرانیانە، چۆن باس لە مافی مرۆڤ و مافی ژنان دەكەین و لە هەمانكاتدا بە تەواوی پشتیوانی لە دەسەڵاتداری عەرەبستانی سعودیە دەكەین؟ ئەمە دووڕووییە باس لە پێشێل كردنی مافی ژنان ناكەین لەم ولاتەدا. ئەوەی لە ئێسـتادا لە میسر لە ئارادایە، مەبەستم خۆپیشاندانی چەند میلیۆن كەسییە، لە لایەن ئیخوان موسلیمینەوە رێبەری ناكرێت. ئەم ترسە لە ئیخوان موسلیمین لە ناوچەكە بنەمایەكی ئایدۆلۆژی هەیەو لە ئامانجە ستراتیژییەكانی ئیسرائیلە. ئەنجامی ئەم شەڕە دەروونییەی ئیسـرائیل بە شوێنیەوەیەتی ئەوەیە دەبێ پشتیوانی لە موبارەك بكەین.

دوو خاڵ هەیە كە دەبێ لە بەرچاویان بگرین. یەكـەم ئەوەی ئەم بزووتنەوەیـە لە لایەن ئیخوان موسـلیمینەوە رێبەرایەتی ناكرێت. دووهەم ئەوەی كە ئەندامانی ئیخوان موسلیمین هەڵگری یەكجۆر روانیـن نییە. هـەر لە خوێندنەوەی عەرەبسـتانی سعودییەوە بۆ ئیسلام بگرە تا دەگاتە خوێندنەوەی توركیا بۆ ئیسلام. ئەندامانی قاعیدە بە هیچ شێوەیەك توندووتیژ نەبوون. كەسـانێكی یاسامەندو دوور لە توندووتیژی و دژە ئیمپریالیزمن كە تەنها بە شوێن ئازادییەوەن. خاڵی(گرنگی) ئەم باسە لەوەدایە ئەوەی ئێمە ئێستا دەربارەی دیموكراسی و مافی ژنان قسە دەكەین‌و ئەگەر بە شوێن رەوتی دیموكراسیخوازی لە میسـر بكەوین، بە شـوێن مافی یەكسانبوون و دەستپێڕاگەیشـتن بـە سـەرچاوە ئابوورییەكان و سـەربەخۆیی لە ئەمریكا و هەروەها داواكاری لە ئیسرائیل بەوەی كە مافی فەلەستینییەكان بپارێزێ‌و بە شوێن ئەوەوە نەبێت لەگەڵ دیكتاتۆرەكان لە ئاشتیدا بێت و فەلەستنییەكان فەرامۆش نەكات.

** **ئەلجەزیـرە:** ئاغای ژیژەك ، ئەگەر بمانەوێ ئەو دیمەنانەی لە گۆڕەپانـی «تەحریر»و نزیك بە یەك میلیۆن كەس كە بۆ گەیشتن بە مافەكانیان كۆ بوونەتەوە، لەگەڵ ئـەو كاتەدا بەراورد بكەین كە پەیكەری سـەدام حسێن لە گۆڕەپانی فیردەوس لە بەغداد هاتە خوارەوە، دەبینین ژمارەی بەشداربووانی ئەمـڕۆ زۆر زیاترە لـەو حەشـامەتەی ئەو رۆژە بەشداربوون. لاتوا نییە ئەو وێنانە توانجێكیان تێدایە؟ بـەو مانایەی ئەو كاتە لـەو وێنەیە ئەو هەڵهێنجانە رەهایەمـان هەبـوو خەڵكـی عێراق لە سـەدام

ماندووبوون، بەڵام ئەمڕۆکە بەو حەشـــامەتە کە لە میســـر کۆبوونەتەوە، هێشتا دوودڵ و بە گومانین لە ڕۆیشتنی موبارەك.

**ژیژەك:** لە ســـەدا ســـەد هاوڕام لـــە گەڵت. ڕۆژنامەنووســـێك بۆی گێڕامەوە ٢٠ خولەك بەر لە (هاتنە خوارەوەی پەیکەری سەدام) ئەمریکاییەکان کەســـانێکیان نارد ئەم کارە بکەن و لام وایە ئەمە ڕووداوێکـــی دەوڵەتی بوو(پێویســـت بوو وێنەی بگیرێـــت). ئەمریکا هەموو ئـــەو هەڵانەی دەکرا بیکات لە عیراق تووشی بوو و ئێستا خەریکە باجی ئـــەو هەڵانەی دەدات. ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە یەکەم ئیزن بدەن هەمووان قســـە بکەن. لە شوێنێك خوێندمەوە زیاتر لە ٣٠٪ خەڵکی ئەمریکا باوەڕیان بە شەیتان و ڕۆح و کۆمەڵێك شتی لەمجۆرە هەیە. کە وایە ئەمریکییەکان بۆیان نییە ســـووکایەتی بە باوەڕی ئایینی میســـرییەکان بکەن. من دەتوانم بە دڵنیاییەوە ئەوەت پێبڵێم لە هەندێ لە شـــوێنەکانی ئەمریکا بـــاوەڕی ئایینی پتەوترە لـــە گوندەکانی ئەفغانستان.

دووهەم ئەوەی کە هەڵبژاردنەکانی ئێمە بە لیبراڵ دیموکراسی و ئیسلام بەرتەسك نابێتەوە. هەرچەند خاڵی سەرنجڕاکێش لە ئیسلامدا هەیە. چەند حەوتوو لەمەوپێش لە قەتەر بووم و ســـەردانی مۆزەخانەی هونەرە ئیســـلامییەکانم کرد. قاپێکی ســـادەم بینی لە زمانی فەیلەســـوفێکی ئێرانییەوە نووسرابوو: ئەو کەسی شکســـت دەخوا و ئەو شکستەی لە چاوی باوەڕ و ئیمانییەوە ئەبینێت گەمژەیە. مەبەســـتی ئەو کەســـانەیە شکســـت دەخۆن و بۆ پاساوهێنانەوەی ئەو شکســـتەو دۆزینەوەی تاوانبـــار، پەنادەبەنە بەر ئایینـــی و چەمکگەلێکی ئینتزاعی و دەرهەســـت.

لێرەدا ئێمە فەلســـەفەیەکی قووڵتـــر لە هەڵهێنجانی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام ئەبینین، ئەویش ئەوەیە تۆ ئازادی هەڵبژێری. بەلای منەوە کێشـــە لە شوێنێکیتردایەو ســـەرچاوەی تری هەیە. ئەگەر هەڵبژاردن لە نێوان دەســـەڵاتی ئایینی فۆندەمێنتاڵی ئیسلامی و لیبراڵ دیموکراســـی ڕۆژئاواییدا بێت، ئێمە (لایەنگرانی لیبراڵ دیموکراســـی ڕۆژئاوایی) دۆڕاوین. بەلای منەوە ئـــەوەی لە جیهانی عەرەبدا تراژیدیایە غیاب و نەبوونی ســـیکۆلاریزمە. سیکۆلاریزم نەك بە مانا بـــێ دینییەکەی، بەڵکوو بە مانای گەڕان و عەڤداڵ بوونی عەدالەت و ئازادی لە دەرەوەی خوێندنەوەی ئایینییەوە، ئەمە شێوەیەکە لە بیرکردنەوەی چەپ.؟

من بەو ئەنجامە رادیکاڵە دەگەم کە ئەم دیاردەیە تەنها تایبەت نییە بە وڵاتانی ئیسلامگەرا . ئێمە ئەم ڕەوتەمان لە وڵاتانی تریشدا بە شێوەیەی بەرچاو و فراوان بینیوە. بۆ وێنە لە ئەفغانستان.

ئەو وێنەیەی بڵاوکراوە ڕۆژئاواییەکان ئەیدەن بە بەردەنگ و وەرگرەکانیان لە ئەفغانستان، ئەوەیە کە ئەم وڵاتە وڵاتێکی دواکەوتووە کە فێندەمێنتالیزمی ئیســـلامی تێیدا زاڵ و باڵادەســـتە. ئەوەندە پیرمو تەمەنم کردووە کە ٤٠ ســـاڵ لەمەوپێشـــم لە بیر بێت ئەفغانستان وڵاتێکی کراوەو سیکۆلار بوو بەو تێکنۆکراتانەوە کە لایەنگری ڕۆژئاواو سیســـتەمی پاشـــایەتی بوون و حیزبێکی کۆمۆنیستی بەهێزی هەبوو و ئێمە چیرۆکەکەی زۆر بە باشـــی ئەزانین. کۆمۆنیستەکان کۆدتایان کردو یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا دەســـتیان تێوەردا و ئەمە بوو بە سەرەتای ڕەوتێك کە وای کرد ســـەرەنجام ئەفغانستان بەرەو بونیادگەرایی‌و فێندەمێنتالیزم بڕوات.

بەکورتـــی: ئێمە نابێت تەنها بە شـــوێن لیبراڵ

دیموکراســی رۆژئاوایــی یــان فێندەمێنتالیزمی ئیســلامییەوە بین. چەپێکی بەهێز بــۆ هەمووما‌ن پێویســتە. ئەمە تەنها ڕێگایەکــە دەتوانێ ئێمە لە بەرامبەر رۆژئاواو جیهانی عەرەبدا رزگار بکات.

بەشی سێهەم:

بە ناوی ئاسایشــەوە پشتیوانی لە دیکتاتۆریەت نەکەین.

**ئەلجەزیرە:** بە لە بەرچاوگرتنی رووداوەکانی ئەم دوایییانەی میســر، زۆر کەس لەوە دەترســن، ئــەوەی ســاڵی **١٩٧٩**لە ئێران روویدا (مەبەســت شۆڕشی ئیسلامی **١٩٧٩**)یە، لە میسر دووبارە بێتەوە. زۆر کەس لە کۆڕو کۆمەڵە رۆشنبیرییەکان لە سەر ئەو باوەڕەن ئەوکات چەپەکان و مارکسیســتەکان و... بەشــداربوون لە رووخانی رژێمی پاشایەتیدا، بەڵام کە ئیســلامگەراکان بە دەســەڵات گەیشتن گرووپەکانیتری ســڕیەوەو رەنگە ئەمەش لە میسر دووبارە بێتەوە. ئەم جۆرە روانینە تا چەند لە واقعەوە نزیکە؟

**تاریق رەمەزان:** نەخێر. ئەمە هەمان ئەو شــتەیە بەشێك لە رۆژئاواییەکانو شەڕی دەروونی ئیسرائیل جەختی لە سەر دەکەنەوە. ئەمجۆرە روانینە هەوڵی ئەوەیە بەو ئەنجامە بگات ئەوەی لە ئێران روویدا لە میسریش روودەدات، بەڵام لە راستییدا بەمجۆرە نییە و دۆخەکە زۆر جیاوازە. ئەوەی لە میسر روودەدات درێژەی شۆڕشی تونســەو لە تونسیش لاوان لە هەموو شوێنێکەوە دەنگیان بەرزکردۆتەوەو دەڵێن درێژەی دیکتاتۆرییەتی **٣٠** ســاڵەیەك کە ئێســتا دەیەوێ کوڕەکەی بــکات بە جێگری خۆی لێرە جێگەی نییە و ئەبێ بڕوات. ڕێبەرێکی ئیسلامگەرا ڕێبەرایەتی ئەم شۆڕشــە ناکات. تەماشاکەن چەن رۆژ لەمەوپێش چی روویدا، ئــەوان ئەلبەرادعیان دۆزییەوە بۆ ئەوەی خۆیان لە پشتیدا حەشار بدەن.

ئەوانــە دەوریــان هەیە لــەم شۆڕشــەدا بە شــوێن وەڵامی ئەم پرســیارەوەن دوای موبارەك چــی روودەدات؟ ئێمە دەبێت هانیــان بدەین بە هاودەنگییەك بگەن. لە پێنج ساڵی رابردوودا ئیخوان موســلیمین هەوڵیداوە خۆی بکات بە بەشــێك لە بەرەی الکافیە( ئەمە ناوی نافەرمی کۆمەڵێکە کە بە بزووتنەوەی گۆڕان ناویان دەرکردووەو خوازیاری گۆڕانی حوســنی موبارەکن. ئەم بزووتنەوەیە هەم خەڵکی ئاســایی دەگرێتەوەو هەم هەوڵیش ئەدات ســەرنجی چالاکانی سیاسی میســر بۆ لای خۆی رابکێشێت. ئەم کۆمەڵەیە بۆ یەکەمجار ساڵی **٢٠٠٤** دامەزرا) ئیخوان موسلیمین بە درێژایی مێژووەکەی هەوڵی نەداوە بەرەو ئەزموونی ئێران بڕوات. جگە لەمەش لە **٣٠** ساڵی رابردوودا زۆر گۆڕاون.

** **ئەلجەزیرە:** زۆر ســەیرە تۆ ئاماژەت بەوەدا ئیخوان موســلیمین زۆر گۆڕاون. من پرسیارێکی تایبەتیم لە تۆ هەیە. باپیرەت، حەسەن بەنا، ئیخوان موسلیمینی دامەزراند. تۆ لات وایە ئیخوان موسلیمین نوێنــەری ئــەو گرووپەیە باپیــرەت دایمەزراندو شوێنکەوتووی هەمان ئامانج و بیروباوەڕی باپیرەتن؟

**تاریــق رەمــەزان:** من لام وایــە نەخێر، زۆر گۆڕاون. باپیرەم سەر بە سەردەمی پێش دیکتاتۆری بوو. باپیرەم دژ بــە کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا چالاکی دەکــردو بزووتنەوەکــەی بزووتنەوەیەکــی دژە ئیمپریالیســتی بوو، بە شــوێن پەروەردە کردن و راکێشانی کەسانی ئاســتی خوارەوەی کۆمەڵگاوە بوو. سەردەمی سەرکوتی ناسر و رژێمەکەی هات، کە ژمارەیەکی زۆری لە ئەندامانی ئیخوان موسلیمین

کوشـــت، ژمارەیەکی زۆر ئیخوانیان بەجێهێشت و ژمارەیەك بوون بە کەســـانی توندڕەو. ژمارەیەکیان لە میســـر هاتنە دەرەوەو لە راستییدا دوورخرانەوەو نەفیکران. هەر لە ئەندۆنیزیـــاوە بیگرە تا تورکیا و میســـر و وڵاتانی رۆژئاوایی و لە ئەنجامدا ئەو فرە چەشـــنییەی لێکەوتۆتەوە کە ئێوە لە بیرو بۆچوونی ئەندامانی ئیخوان موســـلیمیندا دەیبینـــن. ئەوان لە گەڵ مێژوو گۆڕانیان بە خۆوە بینی. ســـەردەمانێك دیموکراسی و مافی ژنانیان رەت دەکردەوە، بەڵام ئێســـتا گۆڕاون و بەردەوام لە گۆڕاندان. ئەگەر بە شوێن هاوشـــێوەیەکی راســـتدا دەگەڕێن، نابێت بیر لە ئێران بکەنـــەوە، دەبێ چاو لە تورکیا بکەن. دەتوانن گـــۆڕان لە ئەربەکانەوە تا ئەردۆگان ببینن. ناکـــرێ ئەوان بـــە دژە دیموکراســـی بزانین. ئەم ئیسلامگەرایانە ئەڵترناتیڤی دیکتاتۆریەتی سەربازین. ئەمە هەمـــان ئەو دروشـــمەیە کـــە ئەنجامەکەی پشتیوانی کردنی دیکتاتۆرییە لە جیهانی عەرەبدا بۆ پاراستنی سەقامگیری و ئاسایش. ئەرکی ئێمەیە ئەم روانگەیە بخەینە ژێر پرسیارەوە. خاڵێك هەیە ئەویش ئەوەیـــە منیش دژ بە ژمارەیەکـــی زۆریانم، لەوانە رێبەرەکانیان، بە تایبەت دژ بە روانینی بەشێکیانم بۆ شەریعەت و مافی ژنان، بەڵام تەنها رێگا بۆ رەوتی دیموکراسی،رەخنەگرتن و بەژێر پرسیار بردنی ئەم کەسانەیە (نەك ســـڕینەوەیان). ژمارەیەکی زۆریان باوەڕیان بە یاســـا و هەڵبژاردنـــی ئازاد هەیە و ئێمە دەبێ بەر لە هەڵبژاردنەکان و پاش هەڵبژاردنەکانیش لە گەڵیان بکەوینە گفتوگۆ و مشتومڕەوە. ئەوەی کە لە رۆژئاواوە بڕۆین و فێریان بکەین بە کەڵکی هیچ نایەو هیچ دەردێك دەرمان ناکات. من بە داخەوەم بۆ ئەو شتەی بلێر وتوویەتی و ئەوەم پێ سەیرە کەسێك بۆ لەناو بردنی سەدام لە عیراق شەڕی کردبێت چۆن ئێستا داوا دەکات لایەنگری لە موبارەك بکەین.

** **ئەلجەزیـــرە:** خاڵێکی ســـەرنجڕاکێش بوو. ئاغای ژیژەك، من ئیمەیلـــی یەکێك لە بینەرەکان، «ئارش حەکیم نیا»ت بۆ دەخوێنمەوە: تۆ لە دوایین وتارتـــدا دەربارەی رووداوەکانی میســـر دەڵێیت :» پشـــێوییەکی گەورە لە ژێر ئەم ئاسمانەدا هەستاوە، هەموو شتێك باشە.» دەکرێ لەم بارەوە زۆرتر قسە بکەی و شیبکەیتەوە؟

**ژیژەك:** من کەســـێك نیم لایەنگری پشێوی و ئانارشـــیزم بم. من خۆم زۆرجار لەم دۆخەدا بووم و ئاگاداری مەترســـییەکانی ئەم دۆخەم، بەڵام ئیزن بدەن راستگۆ بم. کاتێك وەها دۆخێك دێتە پێشەوە کە نازانی دەسەڵات بە دەست کێیە، جگە لە پشێوی ناتوانم هیچ وەســـفێکیترم بۆی هەبێت. مەبەستم لە پشێویو ئاژاوە ئەوەیە ئەو کەسانەی لە سەر کورسی دەسەڵاتن نازانن هیچ دەسەڵاتیان نییە. داوای لێبوردن دەکەم بۆ ئـــەم گێڕانەوە منداڵانەیە، بەڵام من زۆرم پێخۆشـــە. لە کارتۆنی «تۆم و جێری»دا زۆر دیمەن هەیە کە پشیلە دەڕواو لە هەڵدێرێکەوە رەت دەبێ و دەگاتە شوێنێك هیچ لە ژێر پێیدا نییە، بەڵام ناکەوێتە خوارەوە، ئەو کاتەی تەماشـــای خوارەوە دەکات دەزانێـــت هیچ لە ژێر پێیدا نییە دەکەوێتە خوارەوە. ئەوان لە سەر کورســـی دەسەڵاتن دەبێ خۆیان لە وەها دۆخێکدا ببیننەوە، ئەمە ئەو شوێنەیە کە دەبێ پاڵ بە موبارەکەوە بنێین بڕواتە ئەوێ. مەبەستی من لە پشێوی و ئاژاوە ئەمەیە.

ئەوەی لە ئێران دیتمان ناڕەزایەتییەکی گشتگیر بوو، رووداوێك کە لەم دواییانەدا روویدا، هەڵبژاردن و بەسەرهاتی میرحسێن مووسەوی بوو دوای دزینی

دەنگەکان. دەزانی توندڕەوەکان بە ئاسـانی براوە نەبـوون و خەڵکی (ئێران) بە شـوێن ئازادییەوەن و ئازادییـان دەوێ. بە دەربڕینێکیتـر، تەنانەت لە شۆڕشی خومەینیشدا ئیسـلامگەراکان لە سەداسەد دەسەڵاتیان بە دەسـتەوە نەبوو،هێزێکی ئازادنەکراو هەبوو بۆ دیموکراسی. جیاوازییەکی گەورە لێرەدا هەیە. من بـە تەواوی لە گەڵ تاریـق هاوڕام کە جیاوازی دادەنێت لە نێوان میسـر و ئێراندا. لە ئێران چوارچێوەیەك بۆ شـۆڕش هەبوو، ئەو چوارچێوەیە خومەینی ڕێبەری بێ ئەملا و ئەولای بوو، چەپەکان و گرووپەکانیتریش هەوڵیاندەدا خۆیان لە گەڵ ئەو چوراچێوەیەدا بگونجێنن و جێگایەك بۆ خۆیان لەو چوارچێوەیدا بدۆزنەوە. لە میسر بە پێچەوانەوە. من وتووێژێکـم لە گەڵ یەکێك لـە ئەندامانی ئخوان موسـلمین بینی، دیتم ئەو لە دیموکراسی و مافی مرۆڤ دەگات.

ئیسـرائیل لە بری ئەوەی لەوە بترسێت نەوەك ئخوان موسـلمین بە دەسـەڵات بگـەن، دەبێ لە شـتێکیتر بترسـێت. ئەوەی دەربارەی پەرەسەندنی دەوڵەتی ئیسرائیل باسی لێوەدەکرێت، کە هەڵبەت ئەمریکا خستویەتە ژێرگوشارەوە، بە تەواوی جێگەی نیگەرانییەو ئەمە بابەتێکیترە. دە سـاڵ لەمەوپێش لە ئیسرائیل بووم، هاوڕێیانی لیبراڵم پێیان دەوتم:»بەڵێ ئێمە یەکسانی و پەرەسەندنمان بۆ کەرتی رۆژئاوای روباری ئۆردۆن دەوێت، بەڵام بۆمب و سارۆخ بەربە وتووێژەکان دەگرن. سـەرەتا دەبێ فەلەستینییەکان هێرشـەکانیان رابگرن بۆ ئەوەی ئاشـتی دەسـت پێبکات. لە پێنج ساڵ لەمەوپێش لانیکەم لە کەرتی رۆژئاوا، هیچ شـوێنەواری لەو شتەی بە تیرۆریست دەناسرێت نابینرێت، چی روویداوە؟ تەنانەت زەوی فەلەسـتینییەکان خێراتر لە پێشتر دەدزرێن. دەزانی ئیسرائیل چ پەیامو مەسجێکی بێ هیواکەرانە بۆ دونیا دەنێرێت؟ پەیام و مەسـجی ئیسرائیل ئەمەیە:تیرۆر باشترە لە ئاشتی.

** **ئەلجەزیـرە:** بەرێـز تاریق رمـەزان تکایە لەم دەرفەتـەی کۆتاییدا رای خۆتمـان دەرباری بۆچوونەکانی ژیژەك پێ بڵێ.

**رەمەزان:** ئێمە لە رۆژئاوا دانیشـتووینو قسـە دەکەین. ئێمە دەبێ وەفاداربین بەو بنەمایەی (باوەڕمان پێی هەیە)و بەرەو دیموکراسی هەنگاو بنێین. ئەمە بە مانای ئەوەیە پشتیوانی لەو کەسانە بکەین لەوێ ( لە میسر و مەیدانی ئازادی)کۆبوونەتەوە.

ئەمە ئەرکی هەموو بینەرەکانی ئێمەیە کە ناتوانین بە ناوی ئاسایش و ئەمنیتەوە پشتیوانی لە دیکتاتۆری بکەین. لـە دژایەتی کردن لەگەڵ ئەم سیاسـەتە ئیحساسی و ساویلکانەدا کە ئەگەر دیکتاتۆر نەبێت ئیسلامگەراکان بە دەسـەڵات دەگەن. ئەبێت بڵێم ئیسلامگەرایی واقعێکە هەڵگری روانگەی جیاوازە. ئێمـە دەبێ ئێزن بدەین خەڵك بـۆ خۆیان بکەونە مشتومڕەوەو یەکتر بخەنە ژێر پرسیارەوە، رەخنە لە یەکتـر بگرن و گوێ لە یەکتر بگرن و بە فێربوون لە نموونەگەلێکی وەك تورکیا، خەڵکی میسر خۆیان بڕیاردەر بن بەوەی چیان دەوێ.

**سەرچاوە:**

http://www.cioocnews.com/read/newsID_68693.html

# نوام چۆمسکی:
# ئەمریکا ترسی لە شۆڕشە عەرەبییەکان هەیە

و. لە فارسییەوە : کارزان محەمەد

زمانناســـی ناوداری ئەمریکی (نوام چۆمسکی)، بە یەکێك لە گرنگترین ڕووناکبیرانی قۆناغی هاوچەرخی جیهان هەژمار دەکرێت. (نوام چۆمسکی) گەلێك کاری زانســـتی مەزنی لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا بەتایبەت لە مەیدانی زمانناسیدا ئەنجام داوە، وەك یەکێك لە ڕەخنەگرە سەرســـەختەکانی سیاســـەتی دەرەوەو ئابوریی خۆرئاوا بەتایبەت ئەمریکا لە جیهاندا ناســـراوە. ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵ ناوبراودا ئەنجام دراوە ســـەبارەت بە شۆڕشەکانی جیهانی عەرەب و دیدی خۆرئاوایە لەمەڕ ئەم شۆڕشانە.

• بەڕێز چۆمسکی، زۆر کەس و لایەن پڕوپاگەندەی ئـــەوە دەکەن جیهانـــی عەرەبی ئامـــادەی قبوڵکردنی دیموکراسی نییە، بەبڕوای تۆ گۆڕانکارییەکانی ئەم دواییە، مایەپووچبوونی ئەم پڕوپاگەندانەی نەسەلماند؟

چۆمسکی: ئەم پڕوپاگەندەیە هەر لە سەرەتاوە هیچ بناغـــە و بنەمایەکی نەبوو. وڵاتانی عەرەبی- ئیســـلامی مێژووییەکی درێژی خەباتیان بۆ بەدەستهێنانی دیموکراسی هەیـــە، بەڵام ئەوە دەســـەڵاتە خۆرئاواییـــەکان بوو کە هەوڵەکانیان لەپێناو دەســـتەبەرکردنی دیموکراسی لەم

## ئەمریکا چ لە سەردەمی بۆش و چ لە سەردەمی ئۆبامادا، ترسی لە (بەهاری عەرەبی) و شکستی دیکتاتۆرەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هەبووە و هەیە، بێگومان ئەم ترسەی ئەمریکا پاڵنەرێکی لۆژیکیانەی لەپشتەوەیە. ئەم وڵاتە نایەوێ دیموکراسی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا فۆرمەڵە ببێت

وڵاتانەدا، هەر لە پێخەفدا سەرکوت کردووە. لە ساڵی (١٩٥٣ز) لە ئێران حکومەتێکی پارلەمانی بەڕێبەرایەتی محەمەد موسەدەق هاتەئارا کە بەخێرایی ئەمریکی و بەریتانییەکان دەستیان بە شکستپێهێنانی کرد. لە ساڵی (١٩٥٨) شۆڕشێك لە عیراق ڕووی دا کە بەدروستی ناتوانین دەرەنجامەکانی ئەم شۆڕشە بخەملێنین، بەڵام ئەو ئەگەرە بەهێز بوو کە ئەم شۆڕشە، کۆمەڵێك دەرەنجامی دیموکراسیانەی لە عیراقدا هەبێت.

ئەمریکا کودەتایەکی دژ بەم شۆڕشە خستەگەڕ و بێ بەرهەمی کرد. لەم ڕووەوە ئایزنهاوەری سەرۆکی ئەو سەروەختەی ئەمریکا، لەنێو باسوخواسە ناوخۆییەکانی حکومەتی ئەمریکادا کە ئێستا دیکۆمێنتەکانی بڵاوکراوەتەوە، قسەی لەبارەی شەپۆلێك ڕق لە ئەمریکا لەنێو جیهانی عەرەبدا کردبوو، ڕقێك کە لەنێو جەماوەرەوە هەڵقوڵابوو نەك حکومەتەکانیان. دوای ئەوە، کۆمیسیۆنی باڵای پلاندانان لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا، ڕاپۆرتێکی نارەسمی ئامادە کرد (کە ئێستا لە ئەرشیف هاتۆتە دەرەوەو لە ئینتەرنێتدا دەست دەکەوێت). ئەم ڕاپۆرتە رەسمییە وتبووی لە جیهانی عەرەبدا ئەم هەستە لەئارادایە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ڕێگای دیموکراسی و گەشەپێدان لە وڵاتانی عەرەبیدا بەربەست دەکات، پشتیوانی لە دیکتاتۆرە ستەمکارەکان دەکات، ئەم کارەش بە مەبەستی دەستڕاگەیشتن بە نەوت ئەنجام دەدات. لەم ڕاپۆرتەدا هاتبوو: ئەم بۆچوونەی دانیشتوانی جیهانی عەرەب بۆ سیاسەتەکانی ئەمریکا لە ڕاستییەوە نزیکە، ئەو کارەی بە وردییەوە دەبێ ئەمریکا ئەنجامی بدات پشتیوانی کردنە لە دیکتاتۆرەکانی جیهانی عەرەب.

• ئایا ئەمە بەو مانایەیە کە دیموکراسییە خۆرئاواییەکان نایانەوێ دیموکراسییە عەرەبییەکان بکەونە سەرپێ؟

**چۆمسکی:** هەنوکە ناچمە نێو وردەکارییەوە، هەر هێندە دەڵێم بەڵێ، تا ئەمڕۆش دەسەڵاتدارە خۆرئاواییەکان هەمان کار دەکەن. بەشێوەیەکی بەردەوام شۆڕشە دیموکراسییەکان فۆرمەڵە دەبن،

ئـــەو دیکتاتۆرانەی لەلایەن وڵاتە خۆرئاواییەکانەوە پشتیوانیان لێ دەکرێت (بەتایبەتی ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا)، ئەو شۆڕشانە کوشتوبڕ دەکەن.

مەحاڵە لەکاتێکدا ئێمە هەموو شتێ لەم ناوچەیەی جیهانـــدا لەنێوببەین، دیموکراســـییەکانیش بتوانن فۆرمەڵە ببـــن، هەمان چیرۆك بۆ ئەمریکای لاتینیش ڕاســـتە، ساڵانێکی دوورو درێژ لەوێ پشتیوانیمان لە زنجیرەیەك دیکتاتۆر و مرۆڤکوژیی دڕندانە کرد. بە بڕوای من تا ئەو ســـاتەی ویلایەتە یەکگرتووەکان بەســـەر ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا زاڵ بێت، دیموکراســـیش لەوێ فۆرمەڵە نابێت چونکە ئەگەر دیموکراســـییەك بێتەئارا، بەزوویی بەدەستی ئەمریکا لەنێودەبرێـــت. ئەورووپییەکانیش لە ڕابردوودا هەمان کاریان ئەنجام داوە.

• ئایا دەشـــێ لە وتەکانتەوە ئەم دەســـتەواژەیە هەڵێنجین کە «بەهاری عەرەبی» تۆی غافڵگیر نەکرد؟

**چۆمســـکی:** ڕێگام بدەن وەڵامێکـــی ڕوونتان بدەمـــەوە، من پێشـــبینی ئەم شۆڕشـــانەم نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم شۆڕشانە پێشینەیەکی مێژوویی و زەمینەیەکی درێژییان هەیە.

میسر بەنمونە بهێنینەوە: ئەو لاوانەی خۆپیشاندانی (٢٥)ی کانوونی دووەمیان ڕێکخست، بزووتنەوەکەی خۆیان بـــە بزووتنەوەی (٦)ی نیســـان ناوزەد کرد. بەدڵنیاییەوە ئەم ناونانە پاڵنەری هەبوو. ڕووداوەکەش ئەمە بوو کە لە (٦ی نیسانی ٢٠٠٨)ی زایینی وابڕیار بوو بزووتنەوەیەکی کرێکاریی گرنگ لە کارگەی ڕســـتن و چنین لە (مەحەلە) ئەنجـــام بدرێت. ئەم بزووتنەوەیە کارتی جۆراوجۆری بۆ پیادەکردنی فشار بەسەر دەوڵەتدا خستەکار وەك خۆپیشاندان و مانگرتنە کرێکارییەکان کە لە سەرتاسەری میسردا ئەنجام درا.

حکومەتی میسر بە ســـەختی ئەم جوڵانەوانەی ســـەرکوت کرد، خۆرئاواش هیـــچ بایەخێکی بەو ڕووداوە نەدا. هەتا ئەو ساتەی ئەو دیکتاتۆرانەی ئێمە پشـــتیوانیان لێ دەکەین حکومڕانی بەسەر خەڵکدا بکەن، ئێمـــە چۆن بەرگریی لـــە مافەکانی خەڵك بکەین!، بەڵام میسرییەکان ئەم ڕووداوانە لەیاد ناکەن.

ئەوەی بە کردەوە لە وڵاتانی عەرەبیدا ڕوودەدات، ئەڵقەیەکـــە لە کـــۆی زنجیرەیەکـــی درێژخایەنی بزووتنـــەوە چینایەتییـــەکان، ئـــەو بزووتنەوانـــەی هەندێکجار گەیشتوونەتە سەرکەوتنیش. کۆمەڵێك توێژینەوە لەمبارەیەوە ئەنجام دراوە، بۆ نمونە (جۆن بایین)ی توێژەری ئەمریکی لە زانکۆی ســـتانفۆرد، چەندیـــن توێژینـــەوەی دەربـــارەی بزووتنەوەی کرێکاریی لە میسر ئەنجام داوە. لە وتارە نوێیەکانی خۆیدا (هەروەها لە وتارەکانی پێشـــتری خۆیدا) لە زانکۆی ستانفۆرد، مێژووی بزووتنەوە کرێکارییەکان لە میسر بە چەشنێك شرۆڤە دەکات کە نیشانی دەدات ئەم بزووتنەوانە، هەوڵێك بووە لەپێناو گەیشـــتن بە دیموکراسی.

• (جۆرج بوش)ی ســـەرۆك کۆماری پێشووی ئەمریکا هەمیشـــە جەختی لەســـەر ئەوە دەکردەوە لەڕێگەی سیاســـەتی (خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی نوێ) ی خۆیەوە، دەیەوێ دۆمینۆی ئاوابوونی سیســـتەمە دیکتاتۆرییەکان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە دەست پێ بـــکات. ئایا لە نێـــوان ڕووداوە هەنوکەییەکانی جیهانی عەرەب و سیاسەتەکانی جۆرج بوش لەمەڕ شکســـتی سیســـتەمە دیکتاتۆرییەکانی ناوچەکەدا پەیوەندییەك دەبینی؟

**چۆمســـکی:** زۆرینەی ئەو ڕووداوانەی لە ماوەی جەنگی سارد لە وڵاتانی وەك بەرازیل و ڤێتنام و کوبا ڕوویان دا، (دۆمینووار) بوون. ڕوودانی دۆمینوواری ڕووداوەکان، لەو ســـەردەمەدا هێنری کیســـنجەر بە ڤایرۆســـێك هاوشـــێوەی دەکات کـــە لەوانەیە پەرەبستێنێت.

لەو سەردەمەدا ناوبراو بە هاریکاریی نیکسۆن، بەرنامەیەکی بۆ شکستهێنان بە سلڤادۆر ئەلندەی سەرۆك كۆماری هەڵبژێردراوی شیلی دارشت، کیسنجەر وتی: ڤایرۆسەکەی شیللی پێدەچێ تەنانەت بەرەو وڵاتانی ئەوروپاش بچێت (ئێستاش ئەو بەڵگەنامانە لەبەردەستدان کە لەو بارەیەوەن و لە پۆلێنی نهێنی هاتوونە دەرەوە).

کیسنجەر و برژنێڤ هەردووکیان بەشێوەیەکی یەکسان لە دیموکراسی دەترسان. لەم ڕووەوە کیسنجەر وتی: ڕیشەکێشکردنی ئەم ڤایرۆسە کارێکی ناچارییانەیە و دەبێ ئەو کارە بکەین. ئەمریکا چ لە سەردەمی بۆش و چ لە سەردەمی ئۆبامادا، ترسی لە (بەهاری عەرەبی) و شکستی دیکتاتۆرەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هەبووە و هەیە، بێگومان ئەم ترسەی ئەمریکا پاڵنەرێکی لۆژیکیانەی لەپشتەوەیە. ئەم وڵاتە نایەوێ دیموکراسی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا فۆرمەڵە ببێت، ئەگەرچی ڕای گشتی جیهانی عەرەب کاریگەریی لەسەر سیاسەتەکانی دەوڵەتەکانیان هەبێت، بێگومان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا وەدەرنراوە. ئەمەیە پاڵنەری ڕاستەقینەی ترسە زۆرەکەی ئەمریکا لە دیموکراسییەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست.

• هەنوکە باسمان لە کاریگەریی ئەمریکا لەسەر ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کرد، ڕووخسەتم بدە ئەم پرسیارە بخەمەڕوو: بۆچوونی تۆ چییە دەربارەی ئەو شرۆڤەیەی (ڕۆبەرت فیسك)ی ڕۆژنامەنووسی ناودار و پەیامنێری ڕۆژنامەی (ئیندیپێندت **Independent**) لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە لە وتارێکی تازە چاپکراوی خۆیدا، بانگەشەی ئەوەی کردووە کە ئۆباما و سیاسەتی دەرەوەی هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ئاڵوگۆڕەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نییە؟

**چۆمسکی:** وتارەکەیم خوێندەوە، وتارەکەی زۆر باش بوو. ڕۆبەرت فیسك ڕۆژنامەنووسێکی درەوشاوەیە و ئاگادارییەکی زۆری لەبارەی دۆخی ناوچەکەوە هەیە. پێموایە ناوبراو مەبەستێکی تایبەتی لەم وتانەیدا هەیە. ناوبراو دەیەوێ بڵێ هەڵسوڕاوانی بزووتنەوەی (٦)ی نیسان، متمانەیەکی ئەوتۆ بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناکات و بەتەواوەتی فەرامۆشیان کردووە، چونکە باش دەزانن ئەمریکا دووژمنی ئەوانە. لەو ڕاپرسییەدا کە تازە ئەنجام دراوە، زۆرینە (٩٠٪)ی میسرییەکان، ئەمریکا بە گەورەترین هەڕەشە بۆسەر وڵاتەکەیان هەژمار دەکەن. بێگومان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش کاریگەریی خۆی هەیە، چونکە زاڵبوونی بەسەر ڕووداوەکانی ناوچەکەدا لە وڵاتانی تر زۆرترە، من دڵنیام ڕۆبەرت فیسك لەم بارەیەوە هاوڕامە.

• کەسانێك هەن ڕەخنە لە هەڵوێستی ڕووناکبیرانی عەرەب لەهەمبەر شۆڕشەکانی عەرەبدا دەگرن، بەوە تۆمەتباریان دەکەن کە بێدەنگن، ئێستا ڕووناکبیران دەتوانن چ ڕۆڵێك بگێڕن؟

**چۆمسکی:** ڕووناکبیران ئەرکێکی گرانیان لەئەستۆدایە، ئێمە ئەوانە بە ڕووناکبیر ناوزەد دەکەین نەك لەبەرئەوەی لە کەسانیتر بەهۆشترن، بەڵکو لەبەر ئەم فاکتەرەیە کە پێگە و بەهایەکیان لای ڕای گشتی هەیە. کەسێك بتوانێ بەڕوونی و بەسەرجەم توانایەوە قسەکانی خۆی بکات، بەرپرسیارێتییەکی زیاتری بەبەراورد لەگەڵ کەسانی تردا هەیە. ئەم کارەش هەروەکچۆن بۆ ڕووناکبیرانی عەرەب شیاوە، بۆ دۆخی ڕووناکبیرانی تری جیهانیش هەر ڕاستە.

**سەرچاوە:**

http://www.kabul.net.au/Topics/1113.php

# بەشی شەشەم لە کتێبی گفتوگۆیەک لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا

# چیتر من تۆم خۆشناوێت

## Je t ́aime moi non plus

سازدانی: نینار
و. لە سویدییەوە: هیوا قادر

**نینار:** چۆن شیعرەکانت یارمەتیاندایت بژیت و بەزیندویتی بمێنیتەوە؟ پێتوایە ئەمەی کە تۆ کردوتە باشە؟

**ئەدۆنیس:** من پێموایە شیعرەکانم و نووسینەکانم قەرەبوویەکی گەورەیان لەبەرامبەر ئەو غەریبیەم بۆ ولاتەکەم و شوێنی لەدایکبوونم کردۆتەوە. پەیوەندی من لەگەڵ دنیای زماندا بەهێزترە لەپەیوەندیم لەگەڵ ئینسان و شوێنەکاندا.

ڕەنگە ئەمە نوقسانییەك یان هەڵەیەکیش بێت لە مندا، بەڵام ئیتر ئەمە وایە. من هەرگیز پەیوەندییەکی لەم جۆرەم لەگەڵ شوێندا نەبووە، بەڵکە تەنها لەگەڵ ئەم ڕایەڵەدا نەبێت کە منی پێکەوە گرێداوە. ئەو ڕایەڵەش ئەو دەزووە سوورە بوو کە هەلی ئەوەی بۆ ڕەخساندم خۆم بدۆزمەوە، زوو بەڕوونی بزانم من کێم. هەرگیزیش من نەمئەتوانی بگەم بەمە بەبێ یارمەتی زمان.

**نینار:** ئایا بەو جۆرە بوو کە تۆ خۆت ئەو زمانەت خولقاند و ئەویش تۆی دروستکرد؟

# زمان وەك ئەو یەكەم قریشكەیە وەهایە كە ئینسان لە سینەیەوە دەردەچێت كاتێك كە لەدایك دەبێت، زمان ئەو یەكەم هەنسكەیە. لەبەر ئەوەی كە تۆ كەسێكی داهێنەریت، هونەرمەندێكیت، پێویستە ئەو زمانەی كە تۆ بەكاریدەهێنیت لەو ئاستەدا بێت


ئەدۆنیس

**ئەدۆنیس:** دروست وایە.

**نینار:** لەمرۆدا زمان بۆ تۆ چ جێیەكی هەیە؟ ئایە ئەم جێگەیە لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمەندا گەشەدەكات؟ ئایا پێتوایە تۆ لەمرۆدا زیاتر پێویستت بەو شوێنە بێت بەراورد بە ڕابردوو؟ ئایە لەمرۆدا زیاتر دەسەلاّتت بەسەریدا ئەشكێت یاخود بۆ تۆ قورستربووە تا وەستایانەتر بەكاری بهێنیت؟

**ئەدۆنیس:** هەموو ئەمانە پەیوەندی بەوەوە هەیە كە تۆ چ پەیوەندییەكت لەگەڵ خۆتدا هەیە. چونكە شوناسی من هەمیشە لەناو ماخۆلیابوون و ڕاڕاییەكی بەردەوامدا بووە زیاتر لەوەی دودڵییەك بووبێت لە هەڵوێستمدا. بێگومان لەلایەكەوە دەبێت شوناسی من جێگەیەكی خۆی هەبێت، وە لەلایەكی تریشەوە پێویستی بەو كاتە هەیە كە تیایدا جێگای خۆی ئەگرێت. كات لە شوێن گرنگترە. لەبەر ئەم هۆیەشە كە پەیوەندی من بەكاتەوە پەیوەندییەكی خەمهێنەرانەیە، چونكە من دەزانم ئەوەندە كاتم نەماوە. بۆیە پێموایە من زۆر لە خۆم ئەدۆڕێنم كاتێك ڕۆژەكان تێئەپەڕن و من فریا ناكەوم كاریان تیابكەم. كاتێك ئینسان پیرتر دەبێت هەست دەكات هێندەی پێویست كاتی نییە بۆ ئەوەی فریای ئەوە بكەوێت ئەو شتانە بڵێت كە هێشتا نەیوتوون. ئەمە هەستێكی خەتەرناكە، بەتایبەتی كاتێك ئینسان زۆر شتی هەبێت بۆ وتن و دەسەلاّتی بەسەر بابەتەكەشیدا بشكێت. هەندێك جار هەستئەكەم ئەتوانم دەستم بگاتە زۆر جێ كەچی سەیرئەكەم ئەوەندەشم نەكردووە. ئەمە هەستێكی وام پێ ئەبەخشێت كە من هەموو ئەو شتانەم نەكردووە كە ئەبوو بمكردنایە. ئەمەش دڵم پڕ دەكات لە غەم.

**نینار:** ئایا بەڕاستی تۆ لە شیعر نووسین چیت دەستكەوتووە؟

**ئەدۆنیس:** من وەلاّمی ئەم پرسیارەم پێشوەخت داویتەتەوە. من ووتم شیعر نووسین وای لێكردم كە خۆم بناسم و باشتر لە هەموو دەوروبەری خۆم

بگەم. لەسەرروو هەمووویانەوە فێری کردم باشتر بژیم.

**نینار:** ئایا تۆ خۆت شیعرت بۆ خۆت هەڵبژارد یاخود کاریگەریی باوکت لەسەربووە، چونکە ئەو بۆ خۆی حەزی بە شیعری کۆنی عەرەبی کردووە. ڕەنگە ئەمە شتێك بووبێت لەسەرەتادا مەجبورکرابیت لەگەڵی بیت، تا وردە وردە دواتر خۆت حەزت لێکردووە؟

**ئەدۆنیس:** من لە ژینگەیەکدا لەدایکبووم کە توانیوومە بەشداربم لەم جۆرە دانیشتنانەدا. باوکم بۆ خۆی شیعری دەنووسی و ئەو فێری کردم کە قەدری شیعر بگرم. من لەناو شیعردا لەدایکبووم و دەقم بە شیعرەوە گرت. بەڵام من خۆم لەو بەدەقگرتنەی یەکەم دوورخستەوە. تا دواتر بە شێوازێکی نوێ گەشەی کرد کە لە هەموو ڕوویەکەوە جیاوازبوو.

**نینار:** ئەمە مانای ئەوەیە هەموو شتەکان لەسەرەتاوە بۆخۆیان وا هاتنەپێشەوە؟

**ئەدۆنیس:** من تازە هیچ شتێکم لەبەرامبەر ئەو ڕابردووەدا بۆ ناکرێت کە چۆن بووم. شاعیربوونم تەواو گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

**نینار:** لەسەرەتاوە هەموو شتێك ئاوا لە خۆوە دروستبوو، سەیرنییە.

**ئەدۆنیس:** بەڵێ، تەواو وەکو خۆم چۆن لەدایکبووم ئاوابوو.

**نینار:** ئینسان چۆن ئەزانێت ئەوەی کە ئەینووسێت جوانە؟ چۆن ئەزانیت ئەوەی کە نووسیوتە باشە یاخود تایبەت و تازەیە؟ ئایە شتێك هەیە لە خۆتدا هەستی پێ بکەیت یاخود کەسانی تر هەست بەوە ئەکەن؟

**ئەدۆنیس:** ئەوەڵ و ئاخیر ئەمە پەیوەندی بەلایەنی دەربڕینەوە هەیە. کەسانی تر لە ڕێگەی شێوازی خوێندنەوە و پەرچەکردارییانەوە ئەو بیرۆکانەم لەسەر توانا و مانای ئەو نووسینانە پێ ئەڵێن کە نووسیومن.

بەڵام سەرباری ئەمە من پێمwایە شاعیر یان داهێنەر خۆی باشترین خوێنەر و ڕەقیبی خۆیەتی. لەبەرئەوەی لە هەمان کۆنتێکستدا دەژی. کاتێك کە تۆ شیعرێك دەنووسیت بە ئاگاییەوە بێت یان بە بێ ئاگایی بەراوردی دەکەیت بەو شیعرانەی کە شاعیرانی تر بەهەمان زمان نووسیویانە. سوپاس بۆ ئەم بەراوردکردنە کە ئینسان لە ڕێیەوە دەزانێت شتێکی جیاوازتری نووسیوە، یاخود شتێکی تازەی نووسیوە یان نا. پێشموایە شاعیرەکە خۆی باشترین هەڵسەنگێنەرێکە کە هەیە، ئەگەر هاتوو ئازابێت لەگەڵ خۆیدا ئەوا هەر خۆی باشترین ڕەخنەگری نووسینەکەی خۆیەتی.

**نینار:** پێموایە ئەمە بۆ هەموو داهێنەرێك ڕاستە.

ئەدۆنیس: چونکە هیچ کەسێکی تر هێندەی خۆی ناتوانێت باشتر لە کارەکەی خۆی تێبگات.

**نینار:** پێتوایە ئینسان پێویستی بە هاندانی کەسانی تر هەبێت؟ تۆ خۆت گفتوگۆ لەسەر شیعرە نوێکانت و بیرۆکە نوێکانت لەگەڵ هاوڕێکانتدا ناکەیت؟ لەگەڵ کێ باسیان دەکەیت؟ ئایا تا چەند گرنگە ڕێ بە کەسانی تر بدەیت بەراوردی ئەو بیرۆکە تازانە بکەن لەگەڵتا، یاخود باشتروایە دواتر ڕێ بەو کەسانە بدەیت ئەو کارە بکەن کاتێك کە بیرۆکەکەت کامڵدەبێت و دەکەوێتە سەر کاغەز؟

**ئەدۆنیس:** پێشتر وا ڕاهاتبووم پێش بڵاوکردنەوەیان شیعرە تازەکانم بۆ هاوڕێکانم بخوێنمەوە. بەڵام ئێستا دەمێکە ئەوە ناکەم. ئەوەی

دەیڵێم بۆ یەك جار دەیڵێم و بۆ هەمووانە.

نینار: لە چ ئاستێکدا هونەرمەندان، بێ جیاوازی کایەی کارکردنەکانیان، پێویستیان بە ڕەخنە لەلایەن تێکڕای خەڵکەوە یاخود لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە هەیە؟

**ئەدۆنیـــس:** ئەوەی کە پەیوەندی بە منەوە هەیە ســـەبارەت بە ڕەخنە لەلایەن تێکڕای خەڵکەوە یان جەماوەرەوە بۆ من هیچ ئەرزشـــێکی نییە. چەمکی «جەماوەر» ئەفســـانەیە، هەر وشـــەکە لە ڕاســـتیدا بۆخۆی بازرگانییەکی بەهێـــزە بۆ یەکگرتن بەبێ هیچ ڕێکەوتنێك. کە دەڵێین جەماوەر واتا کۆمەڵێك خەڵکی زۆر کە هەموویان لەیەکتری جیاوازن. ئەگەر ئینسان قسە بۆ جەماوەر بکات ئەوا مانای ئەوەیە لە کارەکەیدا جەخت لەســـەر ئەو شتە دەکاتەوە کە گشـــتییە نەك ئەوەی کە دانسقە و تایبەتە. لەبەر ئەم هۆیەیە من حەز بە گشت، یاخود بە جەماوەر ناکەم. ئەوەی بۆ من جێگای بایەخە تاکە، کەســـەکەیە، خوێنـــەرە. تۆ تەنها بۆ ئەوە نانووســـێت بۆ ئەوەی بخوێنرێیتەوە، بۆ ئەوەش نانووسێت تا گوزارشت لە خۆت بکەیت، من دژی هەموو ئەم بیرکردنەوانەم، لەبەرئەوەی ئینسان ناتوانێت هەمیشە گوزارشت لە خۆی بکات کە چییە. لەبری ئەوە تۆ دەنووســـیت و خەلقدەکەیت بۆ ئەوەی بزانیت خۆت کێیت، بۆ ئەوەی باشـــتر لە خۆت تێبگەیت کە تۆ چیت، بۆ ئەوەی دواتریش باشتر لە هەموو دنیا تێبگەیت.

**نینـــار:** ئەمە بۆ ئەوەیە تـــا ڕۆڵ و کاردانەوەی خۆت هـــەم لەناو کۆمەڵگا و هەم لەناو دنیاشـــدا هەبێت؟

**ئەدۆنیـــس:** ئەگـــەر خەڵکی کاردانـــەوەی بۆ کارەکە هەبێـــت و حورمەتی بگرێـــت، ئەمەیان شتێکی باشـــە. ئەگەر هاتوو ئەو کەسە حورمەتی کارەکەشی نەگرت بۆ من شتێکی ئەوتۆ نییە. دیارە هونەرمەندان و نووســـەرانێکی زۆریش هەن کە بۆ جەماوەر کاردەکەن و دەنووســـن، بەڵام من کاری وا ناکەم.

**دوای چەند سەعاتێکی تر**

**نینار:** ئێستا من پرسیارێکی کلێشەیت لێ ئەکەم: پێتوایە ئینسان بتوانێت هەم دایك و هەم هونەرمەندیش بێت؟ پێتوایە ژنێك بتوانێت نووسەرێکی گەورەبێت یـــان هونەرمەندێکی گەورەبێت لەگەڵ ئەوەشـــدا منداڵ و خێزانیشـــی هەبێت؟ من خۆم پێموایە ئەمە ئەبێتە هۆی دروســـتبوونی کێشـــە لەگەڵ کات و هەستکردن بە شپرزەیی. ئەگەر هاتوو هەستبکەم من لەگەڵ منداڵەکانم ئەژیم و چیتر وەك پێشتر هەمان وزەو هەمان پێویســـتیم نییە بۆ داهێنان، ڕەنگە ئەمە ببێتە هۆی کێشەی دەروونی، لەکاتێکدا پیاوەکە ئەمە بقۆزێتەوە بۆ چەوساندنەوە یاخود بۆ دروستکردنی هەستکردن بە گوناهـ لای ژنەکە. چونکە پیاو ئەڵێت ژن ئـــەوەڵ و ئەخیر هەر دایکە، وە ئەگەر هات و دایك نەبوو ئەوا هەبێت و نەبێت «نەزۆکە».

**ئەدۆنیـــس:** بێگومان ئەتوانێت هـــەم خێزان و منداڵت هەبێت و هـــەم هونەرمەندێکی گەورەش بێت. لە ڕاستیدا باخ خێزانێکی زۆر گەورەی هەبوو.

**نینار:** من بیر لە هونەرمەندە ئافرەتەکان ئەکەمەوە.

**ئەدۆنیس:** بێگومان ئەوە ئەبێت.

**نینار:** بـــەڵام زۆر گەورە هونەرمەندی ئافرەتت نییە خاوەنی منداڵبن.

**ئەدۆنیس:** بە پێچەوانەوە هەســـتی دایکایەتی وا لەبەهرەی ئەکات بتەقێتەوە.

**نینار:** (ناڕەحەت دیارە)

**ئەدۆنیس:** پێچەوانەکەشی ڕاستە؛ ئەمە پەیوەندی بەو ژنە خۆیەوە هەیە.

**نینار:** ئاوها! ئەمەشت خستە سەر قسەکانی ترت!

**ئەدۆنیس:** پیاوبوون چ هەقێکی بەسەر ئەمەوە هەیە.

**نینار:** یانی هیچ هەقی نییە... من نازانم. من گومانی خۆمم هەیە.

**ئەدۆنیس:** لای پیاوانیش هەمان شتە!

**نینار:** کەواتە باشە بۆ گەورە پیاوانی هونەرمەند زیاترن وەك لە ژنانی هونەرمەند؟

**ئەدۆنیس:** لە ڕاستیدا هونەرمەندانی پیاو زیاتر نین لە هونەرمەندانی ژنان. بەڵام هۆکاری کۆمەڵایەتی و مێژووی هەبوون کە وایکردووە ژنان نەتوانن دەرفەتی ئەوەیان هەبێت خۆیان بۆ هونەرەکەیان تەرخان بکەن. چونکە هونەر پێویستی بەوەیە کە تەواو خۆتی بۆ تەرخان بکەیت، بەڵام ڕەنگە ژنان تەواو خۆیان بۆ منداڵەکانیان تەرخان کردبێت، ئەمەش باشترین کارێکە کە کردوویانە.

**نینار:** ئاها! خۆ خۆت ئەیبینیت ـ هەر ئێستا بەدەمی خۆت وتت: « ئەمەش باشترین کارێکە کە کردوویانە».

**ئەدۆنیس:** مەبەستم منداڵە، ژنان خۆیان ئەمەیان هەڵبژاردووە.

**نینار:** ئەوها.

**ئەدۆنیس:** ئینسانی وا هەیە هەرە گەورەترین خەونی لە ژیاندا ئەوەیە کە بوونەوەرێکی بچکۆلە لە ناو ئەوەوە بێتە ناو ژیانەوە، ئەو بونەوەرە ببینێت و بەخێوی بکات. پێشموایە ئەم کارە هێزی داهێنانیان لاوازتر ئەکات.

**نینار:** وایە.

**ئەدۆنیس:** بەڵام ژنانیش هەن منداڵیان بووە چونکە چاوەڕوانی ئەو بوونەیان کردووە، سەرباری ئەوەی ئارەزوویەکی گەورەشیان لە ژیاندا هەبووە بۆ هونەر و داهێنانەکانیان.

**نینار:** بەڵام کە ئینسان منداڵی هەبوو، چۆن ئەتوانێت خۆی بۆ هونەرەکەی زیاتر تەرخانبکات وەك لە منداڵەکانی؟

**ئەدۆنیس:** من هەمیشە وام کردووە.

**نینار:** وایە، ئەوەیان ئەزانم. بەڵام تۆ باوکیت و من باسی دایك ئەکەم. باوك پەیوەندییەکی تری لەگەڵ منداڵەکانیدا هەیە.

**ئەدۆنیس:** ئەوە ڕاستە و ئەمەش کێشەیە، خۆ ژنان هەن هەم منداڵیان هەیە و هەم ئەشنووسن. بەڵام لەم حاڵەتەدا ئەبێت سەیربکەیت بزانیت چی ئەنووسن، یاخود بەهای هونەرەکەی ئەوان چەندە.

**نینار:** وایە، بێ شك هەموو کەس ئەتوانێت بنووسێت، یاخود ئەتوانێت وێنەبکێشێت یان فیلم دروستبکات، بەڵام من باسی ئەوانە ئەکەم کە شەیدایانە کارئەکەن.

**ئەدۆنیس:** ئەوەی کە وا ئەکات هونەرمەندێکی تەواوە.

**نینار:** وایە، ئەمە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە تۆ چۆن وزەی خۆت بەکارئەهێنیت!

**ئەدۆنیس:** بیر لە هەموو ئەو ژنە گەورانەی ناو مێژوو بکەرەوە.

**نینار:** کەسیان منداڵیان نەبووە.

**ئەدۆنیس:** ئەوان لە هاوسەرگیرییەکی سەرکەوتودا نەژیاون.

**نینار:** بۆ نموونە ڤرجینیا ۆلف منداڵی هیچ نەبووە.

**ئەدۆنیس:** نازانم.

**نینار:** بەڵام هەموو ژیانــی خۆی بۆ کارەکەی تەرخان کــردووە، ئەی وانییە؟ کاتێك ژنێکی وەك ئەو ئەبینیت لەخۆت ئەپرســی ئەی ئەگەر منداڵی هەبوایە چی ئەکــرد. بێگومان منداڵەکانی نەخۆش ئەکەوتن. ئینســان ناتوانێــت هەرچی هێزی خۆی و دڵ و دەروونــی خۆیەتی هەم بــۆ پیاوەکەی و منداڵەکانی تەرخانبکات و هەم بۆ کارەکەشی. ئەمە پێویستی بە دیقەتدانێکی زۆر هەیە!

**ئەدۆنیس:** وایە، ئەمە کێشەیەکی گەورەیە.

**نینار:** مانــای ئەوەیە کە ژن هیــچ چارەیەکی تری نییە. ئەبێت هەر منداڵی بوێت، کە واشی کرد ناتوانێت هەموو دڵــی خۆی بدات بە هونەرەکەی، کاتێکیــش هەڵیبژارد هونەرمەنــد بێت ئەوا ناچارە منداڵی نەبێت.

**ئەدۆنیس:** هەمیشە وانییە.

**نینار:** تۆ نابینیت کە ژن ئەبێت تا چ ئاســتێکی بەرز بەهێز و بەتوانا بێت. ژن ئەبێت سێ ئەوەندەی کەسانی تر گەورەتربێت و خۆی ماندووبکات.

ئەدۆنیس: ئەبێت کەســایەتییەکی زۆر بەهێزی هەبێت.

**نینار:** هەروەها کاتێکی زۆریش! ئەبێت کاتەکانی خۆی بەسەر چەند لایەکدا بەشبکات.

ئەدۆنیس: وایە، ئەبێت ژنێکی هەڵکەوتوبێت.

چەند سەعاتێك دوای ئەوە.

**نینار:** سنوورەکانی شیعر کامانەن؟ خەسڵەتەکانی چیــن؟ ئایــا شــیعر دەتوانێت پێ بەپێــی هەموو گۆڕانەکان بێت، هەروەهــا توانایەکی خۆگۆڕین و ستیلیکی شۆڕشــگێڕانەی هەبێت؟ یاخود دەبێت خۆی بەهەندێك یاساوە ببەستێتەوە؟

**ئەدۆنیــس:** خەســڵەتێك هەیــە هــی هەموو هونەرەکانــە، کە دیارە شــیعر و پەیکەرتاشــی و وێنەکێشــانیش دەگرێتــەوە، ئەویــش ئەوەیە کە هیچ یاســا و ســنوورێك نایانگرێتەوە. هونەرمەند خۆی بڕیار لەســەر یاساکان دەدات، هەندێك جار دەتوانێت ســەرلەبەری هەموو یاســا سەرەتاییەکان لەناو هونەرەکەی خۆی یاخود شــیعراندنی خۆیدا بگۆڕێت، کەس ناتوانێت لەویادا پێی بڵێت کە ئەوەی ئەو دەیکات هونەرە یاخود هونەر نییە. بەدڵنیاییەوە ئەمە یەکێکە لە هەرە نهێنییە گەورەکانی داهێنەر کە ناتوانیت سنوور لەبەردەمیدا دابنێیت یاخود بیخەیتە ناو پێناسەکانەوە. هونەر شتێکە هەمیشە و بەردەوام لە بزاوتندایە، بەردەوام تازەیە و یاسا و ڕێسای تایبەت بە خۆیی هەیە. لەبەر ئەم هۆیە بڕواناکەم کە یاسایەك هەبێت بۆ شیعر، تەنانەت هەندێك جار ناشیعر خۆی دەبێتە شیعر.

**نینــار:** ئایە تۆ چۆن دەتەوێت باس لە پەیوەندی خۆت و زمانــی عەرەبی بکەیت؟ لەیەك کاتدا کە هەم کەرەســتەی کارکردن و هەم شوناسیشتە، هەم جەستە و هەم ڕۆحیشتە؟

**ئەدۆنیــس:** من ناتوانــم بیــر لەوەبکەمەوە بە زمانێکی تر بنووســم. زمانی عەرەبی لەناو مندایە و بەردەوامیش ئیرەی بە زمانەکانی تر ئەبات. پێموایە زمانی عەرەبی لەناو مندا ڕەگی داکوتیوە و ئەمەش هۆکارێکە لەبەردەم ئەوەی کە من نەمتوانیوە بەئاسانی زمانێکی تر فێرببم. ئەوەنــدەی من زمانی عەرەبیم خۆش ئەوێت ئەوەندەش خۆم خۆشەویستیم لەوەوە پێگەیشــتووە، من لەودا وەســتاوم و ڕێی پێنەداوم زمانێکی تر فێرببم.

**نینار:** منیش پێموایە هەر وایە.

**ئەدۆنیس:** دوای ئەوەی خانمێکی هاوڕێم گوێی

لێمبوو چەند شیعرێکی خۆمم خوێندەوە پێی ووتم: «تۆ پێویســـتت بە هیچ ئافرەتێك نییـــە، چونکە تۆ عەشـــق لەگەڵ زمانی خۆتدا دەکەیت». ئەو ڕاست بۆی چووبوو!

**نینار:** تۆ ڕێنومایی چ پەیوەندییەك ئەکەیت بۆ من لەگەڵ زماندا؟ چونکە ئەمە شتێکە توشی دڵەرزینی کردووم. دەتوانم تۆزێك بە عەرەبی بنووسم، بەڵام زۆر باش نیم. من لەگەڵ ئەم زمانەدا وەك هەڵوێست و ئەرکێکی ســـەر شـــانی خۆم ژیاوم. یاخود وەك خۆشەویستێك دوام کەوتبێت دوای ئەوەی کە من وازم لێهێناوە. بەڵام من حەزیشم دەکرد بەچەشنێکی وا باش فێری زمانی عەرەبی ببوومایە بمتوانیایە باشتر تۆ بناسم، هەروەها شوناسی عەرەب بوونی خۆشم بپاراستایە. من لە ناو ئەم دوو هەستەدا سواوم. ئەکرا زمانی عەرەبی بۆ من ڕووهەڵمالینی زۆر شت بێت لە سەر تۆ بۆ من! سەیرە، وانییە؟

**ئەدۆنیس:** وایـــە، ئەمە کێشـــەیەکە، بەڵام من ناتوانم ئەو کێشـــەیەت بۆ چارەسەر بکەم. پێویستە ســـەرلەبەری ئەو کارە خۆت بیکەیت. لە ڕاستیشدا مەحاڵـــە بتوانیت لە شـــاعیرێك بگەیت گەر بێتوو ئەو زمانەی ئەو شـــاعیرە پێیدەنووسێت زۆر بەباشی نەیزانیت، ئینسان دەتوانێت بەشێکی ئەو تێگەیشتنە لـــە ڕێگەی وەرگێڕانەوە پێبـــگات، لە بیرۆکەکان بگات، لە وێنەکان و شتە گشتییەکان، لەناو بەشێك لە هونەری شـــیعری ئەودا بژیت. بەڵام گەر ئینسان بیەوێـــت بە تەواوەتی لە شـــاعیرێك بگات دەبێت شیعرەکانی بە زمانی دایکی ئەو شاعیرە بخوێنێتەوە. ئەمەش کێشەی وەرگێڕانە و بەجۆرێك لە جۆرەکان هەر ئەو کێشەیەشە کە تۆ دوچاری بوویت.

**نینار:** بەڵام تا چ ئاستێکی باش دەبێت من خۆم فێری زمانی عەرەبی بکەم؟

**ئەدۆنیـــس:** دەبێت تۆ زۆر بەباشـــی فێرببیت، ئەگەرچی تازە بۆ تۆ لەئێستادا زەحمەتە ئەوە بکەیت.

**نینار:** ســـنووری ئەو فێربوونە تـــا کوێیە؟ کێ دەتوانێت ئەو ئاستە دیاریبکات؟

**ئەدۆنیس:** کەس ناتوانێت بەشێوەیەك لە شێوەکان بەسەر هیچ زمانێکدا زاڵبێت. ئینسان تەنها دەتوانێت دەسەڵاتی بەسەر بەشێکیدا بشکێت. زمان وەك ئەو ئاسۆ بێکۆتاییە وایە کە بەرەوڕووی دەچیت. تا چەند بڕۆیت، زیاتر هەســـتی ئەوەت لەلا دروست دەبێت کە زەخیرەی زمانت هێشتا کەمە و بڕناکات. بەڵام لایەنێکی کۆمەڵایەتیشی هەیە کە: ئێمە لە زمانێکدا لەدایکدەبیـــن کە دەبێتە پێســـتمان، دەبێتە خوێن و دەمارەکانمان. ئەگەر ئینســـان لە ســـەرەتاوە زمانی نەهێنابێتە ناو خۆیەوە، وەکو دەڵێن لەگەڵ شـــیردا نەیخواردبێتەوە، ئەوا زمان نازانێت. ئینسان دەتوانێت خـــۆی فێربکات بیخوێنێتەوە، بـــەڵام ناتوانێت زۆر بەباشی پێی بنووسێت.

زمـــان وەك ئەو یەکەم قریشـــکەیە وەهایە کە ئینســـان لە سینەیەوە دەردەچێت کاتێك کە لەدایك دەبێت، زمان ئەو یەکەم هەنسکەیە. لەبەر ئەوەی کە تۆ کەسێکی داهێنەریت، هونەرمەندێکیت، پێویستە ئەو زمانەی کـــە تۆ بەکاریدەهێنیت لەو ئاســـتەدا بێت. تـــۆ دەتوانیت زمانی فەرەنســـی هەڵبژێریت بەڵام ئەمە مانای ئەوەیە کە هەمیشـــە ئاستەنگێك لە نێوانماندا دەبێت. ئاســـتەنگی شاعیرانە و ئاستەنگی زمانەوانی، ئەشبێت قبوڵیان بکەیت ـ بۆ ئەوەی نەبێتە ســـەرچاوەیەك بۆ دڵەرزینت. من نازانم چ زمانێکە کە تۆ دەتوانیت پێی بقیژێنیت و پێی بگریت، نازانم ئەوە فەرەنسییە یان عەرەبی، بەڵام هەرچۆنێك بێت

من پێموایە زمانی عەرەبی وەك زمانێكی كلتووریی بەردەوام لێت نزیك دەبێت سەربارى ئەوەى كە هەرگیز ناتوانێت ببێت بە زمانێكی دایكی ڕاستەقینە بۆ تۆ.

**نینار:** بەتایبەتی زمانی من نابێت بەو زمانەی تۆ. هەندێك جار ئەو هەستەم لەلا دروست ئەبێت كە زمانی عەرەبی و تۆ دوانەیەكی بەیەكەوە بەستراون، پێكەوە لەگەڵ یەكتری هاوسەرگیریتان كردووە و سۆزی وەفاداریتان لە خۆشی و ناخۆشیدا بەیەكتری داوە. هەندێكجاریش وەكو ئەوە وایە زمانی عەرەبی خوشكت بێت و باوكت ئەوی سپاردبێت بە تۆ، مەرجی ئەوەشی لەسەردانابێت كە تۆ خۆت تەرخان بكەیت بۆ ئەو، خۆشتبوێت، لەگەڵی بژیت و چی بتوانیت بۆی بكەیت بۆ ئەوەی ئەو دڵی خۆشبێت و جوان بێت. زمان لە ناو دەستەكانی تۆدا پرشنگ ئەداتەوە، بەتایبەتی لە ناو دەمتا. زمانی عەرەبی هەم ژنتە و هەم خوشك و هەم كچیشت. خۆی بە دەمی خۆی ئەڵێت تەنها كەسێك وام لێبكات بەتەواوی ئیرەیی پێ بەرم تۆیت، چونكە هەم جوان و هەم بەهێز و هەم نازداریت: زمانێكی مرواریانەیە، بەشەوقە، ئارەزووهێنە، كوشندەیە، وردیلانەیە؛ زمانێكە شاعیرانە، گەشەكردوو، دڵگیر و ساحیرە. ئەو زمانە لەناو دەمی تۆدایە، لەژێر مڵاشوتایە، لەسەر زمان و ناو قوڕگ و هەناوتایە. پیتەكان لیكی تۆ ئەخۆنەوە و تەڕوبڕ ئەبن و گەرم دایەن. كاتێك پیتێك دەمی تۆ بەجێدێڵێت لەناو جوڵەیەكی هەمیشەیدا و لە تۆدا چنراوە، سەرلەنوێ تۆ دروستیان ئەكەیتەوە. هەمان ئەو پیتەی كە لەلایەن تۆوە دروست ئەكرێت و كەسێكی تر ئەیخوێنێتەوە لەیەك ناچن. چونكە مانای ئەو پیتە كەمترە لەلای كەسی تر و بەهای هێندە گەورە نییە وەك لەلای تۆ هەیە. تۆ چۆنت بوێت وا لە پیت ئەكەیت؛ تۆ وەك پەیكەر دروستیان ئەكەیت و وایان لێ ئەكەیت سەما بكەن. كە گوێ لە تۆ ئەگیرێت شیعر ئەخوێنیتەوە وەك ئەوە وایە گوێت لە تانگۆیەك بێت تێكەڵ بە فلامنكۆ و سەمایەكی خۆرهەڵاتیانە كرابێت؛ ئەمەش جۆرێك لە حەز و خۆشەویستی و لەزەت و سیحر دروست ئەكات.

**ئەدۆنیس:** ئەوەی تۆ لەسەر من و زمانی عەرەبی ئەیڵێیت ڕاستە. كاتێك خوێنەری عەرەبی تەواو لە زمانی من نەزانێت و تێنەگات، ئەبێتە هۆی دروستبوونی ئاستەنگێك لە نێوانماندا.

**نینار:** من پێموایە كەسێك بیەوێت بەباشی لە شیعرەكانی تۆ تێبگات ئەوا دەبێت وەك جۆرێك لە عەشق تێیبڕوانێت، چونكە لە ڕاستیدا پەیوەندییەك لە گۆشت و خوێن لە نێوان تۆ و زماندا هەیە. ئینسان نابێت تەنها خۆی بە وشەكانەوە ببەستێتەوە بەڵكە لەبری ئەوە دەبێت ئەو پەیوەندییەی تۆ و زمانی عەرەبی تێبگات و حسابی ئەوەش بكات كە ئەمە تەنها پەیوەندی بەو جۆرە وشانەوە نییە كە بەكاریان دێنیت.

**ئەدۆنیس:** ئەوەی تۆ دەیڵێیت زۆر گرنگە. بەڕاست خۆت بەو دەرەنجامە گەیشتیت؟

**نینار:** بەڵێ، چونكە ئەمە ئاشكرایە و گومانی تێدا نییە، ئینسان خۆی ئەمە دەبینێت.

**ئەدۆنیس:** پێتوایە كە زمانی عەرەبی منی خستبێتە ناو هەرەمێكەوە؟

**نینار:** زمان دۆستەكەتە.

**ئەدۆنیس:** زمان هەرەمێكی بە چواردەوری مندا دروستكردووە و كارێكی كردووە كە خوێنەرەكانم نەتوانن بەتەواوەتی تێم بگەن و سەرومڕ حاڵیبن لێم.

کاتێك زۆرینەی ئەو شـــاعیرانە دەخوێنیتەوە کە بە عەرەبی دەنووسن سەرنجێکی وات لا دروستدەبێت کە ئەوان لە شوێنێکن و زمانی عەرەبیش بۆ خۆی لە شوێنێکی ترە.

**نینار:** هەر هۆی ئەمەیە لە ئێستادا وا لەمن ئەکات پێموابێت کە تۆ و زمانی عەرەبی یەکێکن. ناکرێت ئێوە شتێکی تربن. سەرباری ئەوەی من شیعرەکانی تۆم نەخوێندۆتەوە بەڵام هەست ئەکەم کە پەیوەندی نێوان تۆ و زمانی عەرەبـــی بێ ئەندازە بەهێزە. من هەرگیز شـــتێکی وام لەم جۆرە لە کەسێکی ترەوە گوێ لێ نەبووە کـــە پەیوەندییەکی ئاوای لەگەڵ بونەوەرێکی زیندوودا هەبووبێت. بەڵام ئەکرێت لەم ڕووەوە ئینســـان بیر لە «المتنبی» یان کەسێکی تری وەك ئەو بکاتەوە ـ بەڵام ئەوان ئێستا لە ژیاندا نەماون.

**ئەدۆنیس:** زۆر کەس هەن لەگەڵ تۆدا هاوڕان، تۆ تەنها کەســـێك نیت وادەڵێیت. هەموو ئەوانەی گوێیان لێمبووە کە شـــیعر ئەخوێنمەوە ئەڵێن ئەمە شتێکی تایبەتە، هەست پێکردنێکی جیاوازە. سەرباری ئەوەش دەڵێن کەســـێك نییە لە دنیای عەرەبیدا وەك ئەدۆنیس شیعر بخوێنێتەوە.

**نینار:** تەنانەت لە سەرتاپای دنیاشدا!

**ئەدۆنیس:** ئەمڕۆ شتێکی زۆر جوانم خوێندەوە کە فیلیپە سۆلەر نووسیبووی.

**نینار:** لەسەر بێکت؟

**ئەدۆنیس:** بەڵێ لەســـەر بێکت. لـــە دواهەمین ڕستەدا دەڵێت: «دەنگ لەگەڵ خۆیدا بۆنی حەقیقەت هەڵدەگرێـــت». چەند جوانە؟ زمـــان دەنگێکە. ئەم ڕســـــتەیەم زۆر پێ جوان بوو. ئەگەر تۆ ساتێك لە زمان لەو کاتانەدا بەو شـــێوەیە وەربگریت کە من ئەتوانم بیخوێنمەوە، ئەوکات تۆ بەڕاستی هەست بە بۆنی حەقیقەت ئەکەیت.

**نینار:** تۆ جارێکیان وتت بۆ ئەوەی مانای وشەی عەرەبی تێبگەیـــت دەبێت بگەڕێیتـــەوە بۆ زمانی خەڵکی، بۆ

دیالێکتی زمانەکە. مەبەستت لەمە چی بوو؟ تۆ کاتیك واتووت کە لەگەڵ سەمیر ئەمینی ئابوریناسدا قسەت دەکرد.

**ئەدۆنیس:** نەخێر، ئـــەوەی کە من وتم ئەوەبوو زۆرینەی ئەو وشانەی لە ناو زمانی عامیدا هەن لەناو ئەدەبیاتـــی عەرەبیدا ڕەگێکـــی تایبەتیان بە خۆیان هەیە. بۆیە هەندێکجار ڕەنگە پێویســـت بێت زمانی قســـەکردن زیاتر لە زمانی ئەدەبی و زمانی زانستی لە ژیانی ڕۆژانەیدا هەڵبســـەنگێنرێت. ڕاســـتیەکەی ئەوەیە وشەش وەك هەر بوونەوەرێکی تر دەمرێت کاتێـــك کە ئیتر بەکارناهێنرێت. زۆر شـــاعیر هەن دەچنە ناو قەبرســـانی زمانەوە تا وشـــە هەڵبکۆڵن و بیدۆزنـــەوە. بەڵام ئەو وشـــانەی کە لەویادا هەن زۆرینەیان مردوون و ناشێن بۆ بەکارهێنان؛ زۆرجار ئەو وشانە لە دەرەوەی تێگەیشتنی گشتیدان. ئەمەش ئەو هۆیەیە کەئەبێت ئینسان وریابێت لەبەکارهێنانی ئەو وشانەی کە تەنها ڕەگی زیندوویان لە ناو ژیانی ڕۆژانەدا هەیە. کێشەی شیعر ئەوەیە کە وشە بەتەنها بۆ خۆی بوونێکی ســـەربەخۆی نییە بەڵکە بەســـەر تەونێکـــەوە ئەچنرێت. هەروەها کاری شـــاعیریش وەك تەون چنین وایە، پیتەکان پێویستە هەمان پیتبن. ئەمەش خۆڕسکانە دروستدەبێت، چونکە وشە خۆی دەزانێت کە دەبێت چۆن بچنرێت.

**سەرچاوە:**

**samtal med min far, Adonis**

**Ninar Esber**

# وتووێژێك لەگەڵ "عەتیق ڕەحیمی"دا

سازدانی: جەی. کەی
و. لەئینگلیزییەوە: ئازاد بەرزنجی

**«لە ٢٥ ی شـــوباتی ٢٠١١ دا دەرفەتێکم بۆ ڕەخسا تا لەگەڵ نووســـەری ناودار لەسەر ئاستی جیهان، عەتیق ڕەحیمی دا دابنیشـــم، خاوەنی «خـــاك و خۆڵەمێش»و «بەردی ســـەبر»و «هەزار ماڵ بۆ خـــەون و ترس»، کە لە هەمانکاتدا دەرهێنەری سینەماییشە. دانیشتنەکەمان لە ڕیستۆرانتی گابی بوو لە ئوتێلی سۆفیتێل لە شەقامی ٤٤ ی خۆرئاوا لە شاری نیویۆرك، لەکاتێکدا لەوێ ئامادەبوو بوو بۆ بەشداریکردن لە فێستیڤاڵی ئەدەبی فەرەنسیی نوێ لە سەنتەری زیوینی زانکۆی نیویۆرك. ئەمەی خوارەوە دەقی تەواوی وتووێژەکەمانە»**

ڕۆژی:٢٠١١/٢/٢٥

کات: ١١ی بەیانی

**شـــوێن:** ڕێســـتۆرانتی گابی، ئوتێلی سۆفیتێل، ٤٥ شەقامی ٤٤ ی خۆرئاوا، نیویۆرك.

**جەی کەی:** باشـــە، کەواتە تۆ لە ســـاڵی ١٩٦٢ دا لـــە کابول لەدایکبوویت. لە ســـاڵی ١٩٧٩دا ســـۆڤێت ئەفغانســـتانی داگیر کرد. ســـاڵی ١٩٨٤ تۆ دەچیت بۆ پاکستان.

## لەگەڵ هاتنی سۆڤێتدا بۆ ئەفغانستان هەموو شتێك گۆڕا، لەبەرئەوەی ئەو سەردەمە سەردەمی شەڕی سارد بوو، ئیدی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ئەوروپا و تەواوی ئەو بلۆکە دەیانویست هێڵێکی سەوز لە باشووری یەکێتیی سۆڤێت دروست بکەن، ئەی بۆ ویستیان یارمەتیی ئیسلامییە ئسووڵییەکان بدەن لەو کاتەدا؟

**«لە ٢٥ ی شوباتی ٢٠١١ دا دەرفەتێکم بۆ ڕەخسا تا لەگەڵ نووسەری ناودار لەسەر ئاستی جیهان، عەتیق ڕەحیمی دا دابنیشم، خاوەنی «خاك و خۆڵەمێش»و «بەردی سەبر»و «هەزار ماڵ بۆ خەون و ترس»، کە لە هەمانکاتدا دەرهێنەری سینەماییشە. دانیشتنەکەمان لە ڕێستۆرانتی گابی بوو لە ئوتێلی سۆفیتێل لە شەقامی ٤٤ ی خۆرئاوا لە شاری نیویۆرك، لەکاتێکدا لەوێ ئامادەبوو بوو بۆ بەشداریکردن لە فێستیڤاڵی ئەدەبی فەرەنسیی نوێ لە سەنتەری زیوینی زانکۆی نیویۆرك. ئەمەی خوارەوە دەقی تەواوی وتووێژەکەمانە»**

ڕۆژی:٢٠١١/٢/٢٥

کات: ١١ی بەیانی

**شوێن:** ڕێستۆرانتی گابی، ئوتێلی سۆفیتێل، ٤٥ شەقامی ٤٤ ی خۆرئاوا، نیویۆرك.

**جەی کەی:** باشە، کەواتە تۆ لە ساڵی ١٩٦٢ دا لە کابول لەدایکبوویت. لە ساڵی ١٩٧٩دا سۆڤێت ئەفغانستانی داگیر کرد. ساڵی ١٩٨٤ تۆ دەچیت بۆ پاکستان.

**ڕەحیمی:** نەخێر، یەکەمجارم لە پاکستان ساڵی ١٩٧٩بوو. لەپێشدا چووم بۆ هیندستان. ئەوە یەکەم تاراوگەم بوو، لەبەرئەوەی باوکم لە هیندستان بوو، ئیتر منیش چووم بۆلای ئەو و بۆماوەی ساڵێك لەوێ لەگەڵیدا مامەوە. کە تەمەنم بوو بە شانزدە ساڵان بۆ ماوەی شەش مانگ بەتەنیا خۆم گەشتێکم بەناو هەموو هیندستاندا کرد. ئەوە یەکەم ئەزموونم بوو لە تاراوگەو لەگەشتکردندا بەتەنیا و دەتوانم بڵێم کە من لەو کاتەدا خودی خۆمم دۆزییەوە.

**جەی. کەی:** بەدەم ڕێوە.

**ڕەحیمی:** بەڵێ، بەدەم ڕێوە. هەر بەڕاستی. ئەم سەفەرە، ئەم گەشتە بەڕاستی منی لە بوارەکانی ئایین و ئایدیۆلۆجیاو بگرە هەموو شتێکدا گۆڕی. ئەو گەشتە بۆ من بریتی بوو لە گەشتێکی ڕۆحی. دوای ساڵ و نیوێك گەڕامەوە بۆ ئەفغانستان، لەبەرئەوەی لە هیندستان ڤیزام نەبوو. شەش مانگ لە هیندستاندا بەبێ ڤیزا گەشتم کرد، کاتێکیش چووم تا ئەوێ

جێبهێڵم، پۆلیسەکان تەواو حەپەسابوون لەوەی کە من بۆچی ڤیزام نییەو وتیان»ئۆو، تۆ شـــەش مانگ لێرە، لە هیندستان بەبێ ڤیزا ماویتەتەوە» ئیتر شەوێکم لە زینداندا بەسەر برد.

**جەی کەی:** ئەمە هەموو ئەزموونەکە بوو؟

**ڕەحیمـــی:** بەڵـــێ «پێدەکەنێـــت». پاشـــان پاســـپۆرتەکەمیان دامێ و دەبووایـــە لەماوەی ٤٨ ســـەعاتدا هیندســـتان جێبهێڵم، منیش پوولێك لە گیرفانمـــدا نەبوو تا بۆ وڵاتێکی تر بچم، لەبەرئەوە گەڕامەوە بۆ ئەفغانستان.

**جەی کەی:** کەواتە لە ئەفغانســـتانەوە چوویت بۆ فەرەنسا؟

**ڕحیمی:** بەڵێ. دواتر، لە هاوینی ٨٤دا ئەفغانستانم جێهێشت، بەڵام ئەمجارەیان بە قاچاخ و لەگەڵ ٢٤ خوێندکاری لاودا. نۆ شەوو نۆ ڕۆژمان بەپێ بڕی.

**جەی کەی:** داستان بووە، ها؟

**ڕەحیمـــی:** بەڵێ، هەر بەڕاســـتی وابوو. ئینجا گەیشتینە پاکستان. پاشـــان داوای مافی پەنابەریی سیاسییم لە باڵوێزخانەی فەرەنسا لە پاکستان کردو لە مارتی ١٩٨٥دا گەیشتمە فەرەنسا.

**جەی کەی:** کەواتە ســـۆڤێتەکان لە ١٩٧٩ دا دێنە ئەفغانستان. لە ١٩٨٨ دا جێیدەهێڵن. هێزەکانی ئەمریکاش لە ٢٠٠١دا دێن و هەڵبەت تا ئێســـتاش لەوێن. وێنەیەکی مناڵیی خۆت و ئەفغانستانمان بەر لەم داگیرکردنە جۆراوجۆرانە بۆ بکێشە.

**ڕەحیمی:** ئۆو، هەمان ئەفغانســـتانی جاران نییە، لەبەرئەوەی بەر لە ماوەی حوکمی کۆمۆنیستەکان ئەفغانستان دەیویســـت ببێتە وڵاتێکی وەکو ئێران، سەردەمی شاو تورکیا، دەزانیت؟ مۆدێلی سیاسیی ئەفغانستان مۆدێلێکی تورکی بوو. لە ساڵی ١٩٦٣دا دەستوورێکی نوێ لە ئەفغانستاندا هەبوو. شانشینێکی ڕەها نەبوو، بەڵکو شانشـــینێکی دەســـتووری بوو، پەرلەمان هەبـــوو، هەڵبژاردن هەبـــوو، لەو کاتەدا ســـێ وەزیری ژنمان هەبوو، ئەمەش شتێکی ئەنتی دیموکراســـی بوو. لەو ســـەردەمەدا هەموو لایەك بەشێکی هەبوو، حیزبی کۆمۆنیست، حیزبی ئیسلامی، ماوییەکان، دیموکراتەکان، ناسیونالیســـتەکان، هەر حیزبـــەو نوێنەرایەتیی خۆی هەبـــوو لە پەرلەماندا. بەڵام لەگەڵ هاتنی ســـۆڤێتدا بۆ ئەفغانستان هەموو شـــتێك گۆڕا، لەبەرئەوەی ئەو سەردەمە سەردەمی شەڕی سارد بوو، ئیدی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئەورووپاو تەواوی ئەو بلۆکە دەیانویست هێڵێکی ســـەوز لە باشـــووری یەکێتیی ســـۆڤێت دروست بکەن، ئەی بۆ ویستیان یارمەتیی ئیسلامییە ئیســـوولییەکان بدەن لەو کاتەدا؟ وەختێ لە ١٩٨٤-١٩٨٥دا لە پاکستان بووم، بن لادن و گروپەکەی لە پاکستانەوە دەچوون بۆ ئەفغانستان. لەو ماوەیەشدا، هێزی بەرەنـــگاری لە ئەفغانســـتان، موجاهیدین، گۆڕان. سەرەتا بەرەنگاری تەنها دژ بە داگیرکردنی سۆڤێتی بوو، ئیســـلام ئەوەندە گرنگ نەبوو، بەڵام دوای ١٩٨٤، ئیسلام گرنگییەکی زۆری پەیداکرد. یەکەمجار ئیسلام، ئینجا ئازادی و ئینجا سەربەخۆیی و پاشان شتەکانی تر.

**جـــەی کەی:** ئەوە وەســـیلەیەکی باش بوو بۆ یەکخستنی ڕیزەکانی خەڵك.

**ڕەحیمـــی:** بەڵێ. ئەمـــە لای منیش گۆڕانێکی گرنگ بوو لە ئەفغانستاندا. پاشان ئسووڵیەت لەناو هێزە بەرەنگارەکانی ئەفغاندا گەشەی کرد.

**جەی کـــەی:** من زۆر بایەخ بـــەو یادەوەرییە زۆر تایبەتیانـــە دەدەم کە دەشـــێ ئێوە لە مناڵیتاندا هەتانبێت لەســـەر ئەفغانستان و بەرامبەر بەو زنجیرە داگیرکارییەی دواتر ئەنجام دران. تۆ چ گۆڕانێکت

بینی لە دەموچاوی خەڵك یان لە شوێنەکاندا؟

**ڕەحیمـــی:** وەڵامەکەم وەکـــو حیکایەتی لێ دێت، بـــەڵام من لـــە ١٩٨٠ دا خوێندکار بووم و هـــەر لەو ســـەردەمەداو لـــە پشـــووەکاندا وەکو ڕۆژنامەنووسێك بۆ گۆڤارێك کارم دەکرد. بەتەنیا سەفەرێکم بۆ باکووری ئەفغانستان کرد. سەرەتای جەنگ بوو لە ئەفغانســـتانداو منیش دەمویســـت ڕاپۆرتێك لەســـەر کانی کاربۆن لە ئەفغانســـتان و کرێکارانی ئەو کانانە بنووســـم. ئەوەبوو ڕۆژێکیان کامێراکەم لە چایخانەیەکـــی میللیدا لێ بەجێ ما. دوای هەفتەیەك گەڕامەوە بۆ هەمان شوێن و کابرای چایچی وتی»ئۆو، مستەر» من بەلای ئەوانەوە مستەر بووم»پێدەکەنێت». دیارە لەبەرئەوەی چاوم شینە. پێی وتم کە کامێراکەم لـــەوێ لەبیرچووە. هەفتەیەکی بەســـەردا تێپەڕیبوو و کامێراکەی دامـــەوە. ئەمە مێنتالێتیی خەڵکەکە لەو ســـەردەمەدا بەیان دەکات. ئەو چایچییە پیاوێکی هەژار بوو، دەوڵەمەند نەبوو، لەبەرئەوەی چایخانەکەی چایخانەیەکی بچکۆلە بوو لە دێکەدا. کامێراکەش کامێرایەکی هەرزان نەبوو و دەیتوانی هەڵیبگرێت بۆخۆی، بەڵام هەڵینەگرت و زۆر بەئاسانی دایەوە پێم. ئەمە بەلای منەوە گرنگە. دەزانیت؟ بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٢ داو دوای هەژدەساڵ دوورکەوتنەوەم لە ئەفغانستان کە گەڕامەوە، یەکەم شت سەرنجی ڕاکێشام ئەوەبوو کە دیواری ماڵەکان بەرز دروســـت کرابـــوون، پەنجـــەرەکان هەموو داخرابوون و بە خشـــت پڕکرابوونـــەوە و هەموو کەســـێك بەگومانەوە ســـەیری دەکردیت. کەس قسەی لەگەڵدا نەدەکردیت.

**جەی کەی:** کێشەی متمانە نەکردن بە یەکتری هاتبووە ئاراوە.

**ڕەحیمی:** بەڵێ، متمانـــە بەیەك کردن نەمابوو. بڕوایان بە ئازادی نەمابوو، باوەڕیان بەو شتانە نەمابوو کە پێشـــتر ئاماژەم بۆ کردن. چیرۆکی دووەمیشیان ئەوەیە کە دوو ساڵ لەمەوبەر لە ڕیستۆرانتێکدا بووم لە کابول، کیسێك و دوو کامێرام پێ بوو، کیسەکە هەموو شتەکانی تریشمی تیابوو. لەسەر کورسییەك دامنا، شـــتێکم خواردو خواردەوە. دوای دە دەقیقە سەیرم کرد کیسەکەم دیار نەماوە «پێدەکەنێت».

**جەی کەی:** ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ئەو گۆڕانە، ها؟

**ڕەحیمـــی:** دەزانیت، هەڵبەت ئەمە شـــتێکی حیکایەتئامێزە، بەڵام لای من هەموو شـــتێکی ئەم وڵاتـــەم بۆ بەیان دەکات، دەزانیت بۆ؟ لەبەرئەوەی سی ساڵ شـــەڕ هەموو شتێکی گۆڕی: مێنتاڵیتی و متمانەی خەڵك. پێشـــتر خەڵکی متمانەیان بە یەکتر هەبوو، بەڵام ئێستا کەس متمانەی بە کەس نیە. تۆ کاتێ متمانە لە دەســـت دەدەیت، لە هەموو شتێك دەترسیت، باوەڕ بە هیچ شتێك ناکەیت و تەنانەت متمانـــە بە خۆشـــت ناکەیت. ئەمەش ســـەرەتای وێرانبوونی کەلتوورو شوناسە. کاتێك بڕوا بەخۆت ناکەیت، بڕوا بە وڵاتەکەشت ناکەیت. هەربۆیە ئەمە گۆڕانێکی گەورە بوو: لەدەستدانی شوناس و متمانە بەخۆ، ئەم شتانە گرنگن و ئێمە ئێستا نیمانە.

**جـــەی کەی:** دەمـــەوێ بچینە ســـەر «خاك و خۆڵەمێـــش»، ئەو کتێبـــەی لە ســـاڵی٢٠٠٠ دا بە ئینگلیزی لـــە چاپ دراو دواتر کـــرا بە فیلمێکی ســـینەمایی کە خۆت دەرتهێنا. لـــە گفتوگۆیەکدا کە نادیا عەلی مەیوەندی لەگەڵتدا کردوویەتی «لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٤ دا» وتووتە کە «ژنان ونن. ژنان لە خەیاڵدا هەن.»

**ڕەحیمـــی:** بەڵێ، دەزانیت ئـــەم چیرۆکە زۆر کۆنە، لەبەرئەوەی مـــن کاتی خۆی نۆڤلێکی زۆر

زۆر کورتم لە چوار لاپەڕەدا نووسی... پێم وتیت کە چووم بۆ باکووری ئەفغانستان لە ساڵی ١٩٨٠ دا، لەوکاتەوە بیرۆکەی ئەم نۆڤڵەم لە مێشکدا بوو. یەکەمجاریش لە ساڵی ١٩٩٦ دا بەفارسی نووسیم. لەو کاتەشدا تاڵیبان لە ئەفغانستان هاتنە سەر حوکم. هەر لەو کاتانەدا برایەکم لە ئەفغانستان کوژرا. دیسان هەمانکات لە فەرەنسا کچێکمان بوو. هەربۆیە من نەمتوانی پرسە بۆ براکەم بگێڕم و بۆی بلاوێمەوە. لەبەرئەوەی من لە فەرەنسا بووم و ئەو لە ئەفغانستان بوو. هەر بۆیە بەلای منەوە نووسین خۆی بۆ خۆی بریتی بوو لە پرۆسەی شینگێڕان. وەختێ براکەم کوژرا، دایك و باوکم تا دووساڵ پێیان نەوتم. هەموو جارێکیش کە قسەم لەگەڵ دەکردن لێم دەپرسین کە بۆچی پێیان نەوتووم.

«خاك و خۆڵەمێش» بریتییە لە پیرەمێردێك کە دەیەوێت بچێت بۆ لای کوڕەکەی لە کانێك تا پێی بلێت کە دێکەیان وێران کراوەو هتد... بەڵام تیاماوە چۆن هەواڵی ئەو مەرگەساتە بە کوڕەکەی بلێت. ئەوە باوکمە. بۆ نەیویست پێم بلێ؟ بۆ؟ هەر بۆیە ئەو ڕۆمانەم بریتییە لەو شینگێڕانە. بەڵام هەندێجار من لە ئەفغانستان دەپرسم: «بۆ بەردەوام توندوتیژی هەیە؟ بۆچی دوای داگیرکردنەکەی سۆڤێت ئێمە نەمانتوانی ئاشتی لە ئەفغانستاندا بەرقەرار بکەین؟ من وایدەبینم کە دوای هەر جەنگێك ئەگەر شین نەگێڕیت دەکەویتە بازنەیەك لە تۆڵەسەندنەوە.

**جەی کەی:** منیش وای بۆ دەچم کە بەرلەوەی تۆ لەو بارەیەوە بدوێیت، دەشێ توندوتیژی چوویێتە ناو ناخی ئادەمیزادەکانەوەو بوویێتە بەشێك لە ناوەوەیان. هەر ئەمەش هۆکاری دیوارەکان و نەمانی متمانەیە.

**ڕەحیمی:** بەڵێ، دوای شەڕی سۆڤێتیش خەڵك بواری شینگێڕانیان نەبوو، ئەمەش بەرەو توندوتیژی و تۆڵەسەندنەوەی بردن. هەربۆیە من دەربارەی ئەو شینگێڕانەم نووسی و لە هەمانکاتدا پێچەوانەی ئەو شینگێڕانەشمان هەبوو لە ولاتدا. هەروەها من سەرنجی پێگەی ژیانیشم داوە لەم ولاتەدا. لە فیلمەکەدا دوو ژنمان هەیە. یەکێکیان ڕووتە بەڵام لە خەیاڵی پیرەمێردەکەدا «کە بووکێتی» ، لەماڵەوە بووەو شێت دەبێت و خۆی فڕێ دەداتە ناو ئاگرێکەوە. ئەم وێنەیە لە خەیاڵی پیرەمێردەکەدایە. وێنەی ئەم بووکەی بەسەر خەیاڵیدا زاڵە. بەڵام لە هەمانکاتدا ئافرەتێکی تر پیشان دەدەم کە ڕووت نییە بەڵکو بەردەوام چارشێوی پۆشیوە. هیچی لەبارەوە نازانین. هیچ شوناسێکی نییە. بەلای منەوە ئەم دووانە هەردووکیان زیادەڕەوین. کاتێك ئافرەت شوناسی دەبێت، لە کۆمەڵگادا ئامادەبوونی هەیە. جەستەی هەیە، ژیانێکی تراجیکی هەیە. لە کۆتایی ژیانداییە. لەبەرئەوە وەختێ ئافرەت شوناسێك وەردەگرێت، ئیدانە دەکرێ و بە نەفرەت دەکرێ. بەڵام ئافرەتەکەی تر هیچ شوناسێکی نییە، بەڵام بە زیندوویی لە زیندانێکدایە، چونکە چارشێو لە زیندان دەچێت. کەواتە پرسیارەکە لای من ئەوەیە کە «بۆچی ئافرەت بەردەوام لە کۆمەڵگادا ونە؟» لەبەرئەوەی لەم کۆمەڵگایەدا ئەو هیچ ڕوخسارێکی نییە، هیچ شوناسێکی نییەو زۆربەی کات لە ماڵەوەیە و کارناکات. هەڵبەت دوای ساڵی ٢٠٠٢، دوای تاڵیبان، هەوڵیان دا شوناسێك بە ئافرەت بدەن، بەڵام ئەمە شتێکی ئاسان نییە، لەبەرئەوەی تۆ ناتوانیت بەو تەرزە مێنتاڵیتیش بگۆڕیت.

**جەی کەی:** بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە تۆ پێشتر باسی ئەو ئەزموونەی چاپخانەکەت کرد وەختێ کابرای چاپچی کامێراکەی بۆ گەڕاندیتەوە.

هەر لەو کۆمەڵگایەی ئەو کابرایەدا کە کامێراکەی بۆ گەڕاندیتەوە ئەو شــتە هەبووە کە تۆ لەبارەیەوە دوایت: ونبوونی شوناســی ژن. ئایــا تۆ دوای ئەو شەڕە یەك بەدوایەکانە، لە حەفتاکانەوە تا ئێستا هیچ گۆڕانێکت لە ڕۆڵی ژندا بینیوە؟

**ڕەحیمــی:** لەحەفتاکانــدا خوشــکەکەم ڕۆژنامەنــووس بــوو و بەتەنیا هەموو ئەفغانســتان دەگەڕا. بەڵام کۆمۆنیستەکان هاتنە کابولەوە، هاتنە ناوچەکەوە، ئەم ئیســلامییانە لە گــۆڕێ نەبوون. کۆمۆنیستەکان ویستیان پۆشاك بە ئافرەتان فڕێ بدەن و نمایشــیان بکەن، بەڵام ئەوە کارێکی زیادەڕەوانە بوو. بەڵام دواتــر کەلتوورێکی تر هاتە ئاراوە. ئەو کەلتوورەی لەلایــەن عەرەبەکانەوە هات، لەلایەن سعودیەکان و خەڵکی پاکستانەوە. شوناسی ئەفغانی؟ بەلای منەوە ئەمە شوناسێکی سعودییە. ئەم تێکڕژانە شوناسی ئێمەی گۆڕی.

**جەی کــەی:** لە«بەردی ســەبر»دا ژن دەنگی دراوەتێ و پیاو دەنگی لێ سەنراوەتەوە. من دەمەوێ شــتێکت لێ بپرســم «دەزانم کە پێشــتریش ئەم پرسیارەت لێ کراوە» بەڵام ئاخــۆ تۆ قــەت لەخۆت پرســیوە«چۆن دەتوانــم دەنگ بە ژنێك ببەخشم؟ ئایا ئەوە شتێکی ئاساییە؟»

**ڕەحیمــی:** «پێدەکەنێت»باشــە، بەر لە هەموو شــتێك بۆ ئەوەی دەنگ بە ژن ببەخشــین، دەبێ پیــاو ئیفلیج بکەین «پێدەکەنێت» «هەڵبەت ئەم قسەیەی ڕەحیمی ئاماژەیە

**ئازادیــی من لــە ئازادیی کەســێکی تــر ناچێت، بــەڵام شــتێك هەیە کە گرنگە: ئەو کەســەی تر دەبێــت هەنــدێ ئایدیای دەربارەی ئازادییەکەی من و ئازادییەکەی هەردووکمان هەبێت تا بزانێت کامیان هەڵدەبژێرێت.**

بــۆ ئەو کاراکتەرە پیاوەی کە لــە ڕۆمانی «بەردی سەبر»دا هەیەو ئیفلیجەو لە جێدا کەوتووەو ناتوانێ قسەبکات. و. کوردی» ئەمەش بەدبەختییە. بەڵام لە وڵاتانێکی وەکو ئەفغانستان و ئێران و وڵاتانی تری دیکتاتۆریدا، دەنگ مەسەلەیەکی زۆر گرنگە.

لە ئەورووپا یان ئەمەریکا پرســیارەکە ئەوەیە کە «من هەم یا نیم؟» بەڵام لە ئەفغانستانی دیکتاتۆریدا، پرســیارەکە بەمشێوەی لێ دێت «قســە بکەم یان نەیکەم؟» لەبەرئەوەی لە ئەفغانســتاندا دەنگ نییە. ناتوانیت ژیانی خۆت خۆش بوێت و شتێك بڵێیت کە پێچەوانەی بۆچوونی حکومەت بێت. بۆیە بەلای منەوە، بۆ ئەوەی دەنگ بە ژن ببەخشین، دەبێ هەر لە ســەرەتاوە ئەم مافــە پەترپارکییە ئیفلیج بکەین. ســەبارەت بەم ئافرەتەش، زۆر گرنگە قسە بکات. وەکو نووســەرێك دەزانم کە وشە گەلێ گرنگە. ســەرەتا کردار گرنگ بوو. من بــڕوام بەوە هەیە چونکە تۆ کە دەنگــت نەبوو، کە نەتتوانی هەموو شــتێك ڕوون بکەیتەوە، هەندێ شتی تر دەکەیت تا گوزارشــت لەخۆت بکەیــت و لێدەگەڕێیت ئەوەی لە ناختدا پیشی خواردۆتەوە، بتەقێتەوە. لە ئەفغانســتاندا بۆچی ئەو هەموو توندوتیژییە هەیــە؟ لەبەرئــەوەی ئێمــە دەنگمــان نییە. ئەمە ســیفەتێکی زۆر ئادەمییانەیــە. کاتێك منــاڵان ناتوانــن هیچ بڵێــن، زۆر نائومێــد دەبــن. ئەگەر قســە نەکەین کاری توندوتیژ

دەکەین. گۆڕینی شەڕ بۆ وتوویژ، ئەمەیە دەنگ.

**جەی کەی:** ئەوەی من لەو پرسیارە مەبەستم بوو ئەوە بوو کە ڕەخنە لە گەلێ نووسەر دەگیرێ کاتێك دەنگی «کەسانێکی دی» دەبەن کە خۆیان نین. تۆ قەت لە خۆت پرسیوە کە ئاخۆ شتێکی ئاساییە وەکو پیاوێك دەنگی ژنێك بەکاربهێنیت؟ من وێنای پیاوێکی پیر دەکەم کە وێنەی ژنێکی لەزەیندایەو دەپرسم ئاخۆ جیاوازی چییە لەنێوان ئەوەدا و نووسین بەدەنگی ژنەوە؟

**ڕەحیمی:** ئا... باشە. سەرەتا ویستم بچمە ناو ناخی ئەو پیاوەوە. ویستم سەبارەت بەوە بنووسم کە ئەم پیاوە چۆن بیردەکاتەوە کاتێك ژنەکەی هەموو شتێکی پێ دەڵێت لەبەرئەوەی کاراکتەرێکی باش نییە، پەروانە. دەزانیت کە زۆر شتی پێ دەڵێت؟ پێی دەڵێت کە منداڵەکانی لەو نەبوون، هەرکاتێك ئەو لەوێ نەبووبێت لەگەڵ پیاوی تردا نوستووەو خیانەتی لێ کردووە. بۆ؟ لەبەرئەوەی ناتوانێت گوزارشت لەخۆی بکات. کاتێکیش تۆ توانای قسەکردنت نەبوو، ئەمجۆرە شتانە ڕوودەدەن. هەر بۆیە من ویستم بیر لەوە بکەمەوە کە من ئەگەر وەکو پیاوێك ناچاربم گوێم لە هەموو ئەو شتانە بێت، ئاخۆ چۆن بێت، بەڵام وەختێ دەستم بە نووسین کرد ئەو کارەم نەکرد. ئەو ژنە داگیری کردم و هەرکە دەمنووسی، ئەو ژنە دەهاتەوە ناومەوە، دەچووە ناو مێشکمەوە، ناو دڵمەوەو پێی دەوتم کە دەیەوێ باسی خۆی بکات، نەك ئەو پیاوە «پێدەکەنێت». هەروەها لەبەرئەوەی هەر بەڕاستی من خۆم حەز بە داب و نەریتەکانی ئەفغان ناکەم، بۆیە ئەمە ئەو ژنە بوو کە من لە ئەفغانستاندا دەمویست هەبێت، ئامادە بێت.

**جەی کەی:** پێشوازیکردن لە «بەردی سەبر» چۆن بوو لە ئەفغانستاندا؟ ژنان چییان لەبارەوە وت؟

**ڕەحیمی:** بەشێك لە ژنان ئەو کارەیان پێ خۆش بوو و سوپاسیان کردم. بەڵام ژنێك بەڕاستی حەزی لەو کارەم نەبوو و لێی پرسیم چۆن دەبێ من ژنانی ئەفغان وەکو سۆزانی و پیاوانی ئەفغان وەکو کەسانێکی لاوازو بێدەسەڵات پیشان بدەم. لە ئەورووپاش بەردەوام خەڵکی دەیانوت کە بڕوا بەو ژنە ئەفغانییە ناکەن لەبەرئەوەی ژنانی ئەفغان لەو ناچن. بەڵام کاتێ تۆ «مادام بۆڤاری» دەخوێنیتەوە، ئاخۆ بیر لەوە دەکەیتەوە کە هەموو ژنانی فەرەنسایی لەو دەچن؟ یان کاتێك من فیلمێکی سکۆرسیزی دەبینم، وەکو فیلمی «شۆفێری تاکسی»، دەتوانم بڵێم کە هەموو شۆفێرانی تاکسی وەك ئەو وان؟ بەداخەوە، ئێمە هەموو جارێك کە وێنەیەك دروست دەکەین دەیکەین بە قاڵبێکی گشتی «**stereotype**». وەك ئەوەی من کە قسەم لەسەر ژنێکی ئەفغانی کرد ، ئیدی واتە قسە لەسەر هەموو ژنێکی ئەفغانی دەکەم. نەخێر. ئەمە حاڵەتێکە و هیچی تر. ڕۆمانێکە. بەڵام ئەوە ئومێدی منە.

**جەی کەی:** ئەمە دەمبات بۆ پرسیارێکی تر، ئەویش ئەوەیە کە ئایا تۆ هەرگیز هەستت بەوە کردووە کە نووسین بریتییە لە جۆرێك لە کرداری زیندەخەون؟ یان خەون؟ گەلێ وێنەی خەونئامێز لە کارەکەتدا هەیە.

**ڕەحیمی:** بەڵێ. نیچە دەڵێت «ئێمە هونەر شك دەبەین، لەبەرئەوە حەقیقەت نامانکوژێت.» من نامەوێ بڵێم کە ڕۆمانەکەم دەربارەی ئەفغانستانە، دەربارەی هەموو ژنانی ئەفغانە. نازانم. لەوانەیە هەندێ ژن هەبن وەك ئەو وابن. بێگومان من گوێم بۆ گەلێ بەسەرهات گرتووە. ئەو گوتەیەی کە دەڵێت ڕۆمان حەقیقەت «یان واقع» نییە، بەڵکو شێمانەیە «دەشێ

ڕووبدات». بەلای منەوە هەرچییەك دەنووسم دەشێ ڕووبدات. ئەمە جیهانی ئیحتیماله.

**جەی کەی:** ڕاستە. فاکتەری کات. لەئێستادا نا، بەڵام دەشێ ڕووبدات.

**ڕەحیمی:** ڕاستە. من مرۆناس «ئەنترۆپۆلۆگ» نیم، ڕەگەزناس «ئیتنۆلۆگ»نیم، کۆمەڵناس «سۆسیۆلۆگ»نیم، ڕۆژنامەنووس نیم. نامەوێ بڵێم ئەمە واقیعی ئەفغانستانە. نەخێر، من ناتوانم ئەوە بکەم. ئەمە ئافرەتێکە جێی خەونی من بوو، جێی ئومێدی من بوو. ئەوە هەموو شتێکە. هەرکاتێك تۆ دەنووسیت، ئومێد دەکەیت شتێك بە جیهان ببەخشیت. هیوایەکی نوێ، وێنەیەکی نوێ. هەربۆیە من ئومێد دەکەم ئەمجۆرە ئافرەتە لە ئەفغانستاندا ببینمەوە.

**جەی کەی:** دەمەوێ دەربارەی نیشتمان قسە بکەم، لەبەرئەوەی تۆ کاتێك نیشتمانت جێهێشت تەمەنت ١٧ یان ١٨ ساڵێك دەبوو و ١٨ ساڵیشە لە فەرەنسایت. تا ئێستاش بەردەوام لەسەر ئەفغانستان دەنووسیت. نیشتمان لای تۆ لە کوێدایە و کەمێك لەسەر نیشتمان وەکو خەونێك قسەمان بۆ بکە.

**ڕەحیمی:** ئمم. حیکایەتێکت بۆ دەگێڕمەوە. حیکایەتێکی زۆر جوان. تۆ مەلا نەسرەدین «مەلای مەشهور» دەناسیت؟ کاراکتەرێکی ئەفسانەییە لە کەلتووری ئێمەدا. حیکایەتەکە دەڵێت: شەوێکیان کابرایەك لای عەموودێکی کارەباوە لەسەر شەقام مەلا نەسرەدینی بینی شتێکی لێ ون بوو بوو و لەبەر ڕووناکیەکەدا دەگەڕا. ئەمیش لێی دەپرسێت: مەلا، هیچت لێ ون بووە؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ، کلیلی دەرگایماڵەوەم لێ ون بووە. کابرا دەڵێت: منیش یارمەتیت بدەم؟ مەلا دەڵێت: ئەی بۆ نا. ئیتر بە جووتە بۆ کلیلەکە دەگەڕێن. دوای پێنج دەقیقە گەڕان و نەدۆزینەوەی کلیلەکە، کابرا لە مەلا دەپرسێت: باشە تۆ دڵنیایت لەوەی کلیلەکەت لێرەدا لێ ون بووە؟ مەلا دەڵێت: نەوەڵا، کلیلەکەم لە ماڵەوە لێ ون بووە. کابرا دەحەپەسێت و لێی دەپرسێت: ئەی کەواتە بۆچی لێرەدا بۆی دەگەڕییت؟ مەلاش دەڵێت: لەبەرئەوەی ماڵەکەی خۆمان تاریکەو ڕووناکیی تیانییە بەڵام ئێرە ڕووناکە. حیکایەتێکی جوانە، وانییە؟ بەلای منیشەوە، چیرۆکەکە بریتییە لەمە. نیشتمانەکەم لەناو تاریکیی تیرۆردا بوو، تاریکیی جەنگ. لە تاریکیی ئسوولیەتدا بوو. تاریکی لە هەموو شوێنێك بوو. منیش لەناو ئەو ماڵەمدا کلیلەکەم لێ ون بوو بوو، کلیلی شوناسی خۆمم لێ ون بوو بوو، کلیلی ئازادی و کلیلی سەربەخۆیی. هەربۆیە چووم تا لە شوێنێکی تردا بۆی بگەڕێم، شوێنێك کە ڕووناکیی تیابوو، ئازادیی تیابوو، سەربەستیی تیابوو، فەرەنسا. لەوێ بەدوای کلیلەکەی خۆمدا دەگەڕام. بەڵام بێگومان لەوێش نەمدۆزییەوە، لەبەرئەوەی کلیلەکەم لە وڵاتەکەی خۆمدا جێهێشتبوو. وەلێ من لە خەیاڵی خۆمدا دروستم کرد. نووسین دەربارەی ئەفغانستان وەکو دروستکردنی ئەو کلیلەم وایە. ئەمە بۆچوونی منە. دەزانیت؟ کەواتە ئێستا من لە کوێم؟ کاتێك کە لە فەرەنسام، یەك ئەفغانیم. کاتێکیش لە ئەفغانستانم، فەرەنسایيەکم. هەربۆیە دەڵێم کە من ئێستا لە نیشتمانێکدا ناژیم. من لە جیهاندا دەژیم. ئێستا وڵاتی من بریتییە لە لاپەڕەیەکی سپی...

**جەی کەی:** نیشتمان لەناو سەرتدایە.

**ڕەحیمی:** بەڵێ «پێدەکەنێت».

**جەی کەی:** La maison du tete ؟

«بەفەرەنسی واتە: خانوویەك لەسەردا؟»

**ڕەحیمی:** Oui, La maison du tete .

«بەڵێ، خانوویەك لەسەردا.» هەروەها لەدڵیشمدایە.

بەڵام هەموو ســـاڵێك بەدوای ئەو كلیلەدا دەگەڕێم. لە ســـاڵی **١٩٩٨** ەوە تا ئەمڕۆ مـــن ناتوانم لە هیچ شوێنێك لە ســـێ هەفتە زیاتر بمێنمەوە. دەبێ بڕۆم. دەبێ سەفەر بكەم.

**جەی كـــەی:** منیش وام «پێدەكەنێت» بەردەوام دەڵێی ماخۆلانتە؟

**ڕەحیمی:** بەڵێ «پێدەكەنێت».

**جەی كەی:** حەزم كرد زیاتر دەربارەی ئازادیی ژنـــان بدوێین. لێرە لە ئەمەریكا، هەروەها دەزانم لە ئەوروپاش، هەڵمەتێكی گەورە بۆ ئازادكردنی ژنان هەیە، بۆ بەخشـــینی دەنگ بـــە ژن. من نازانم ئەو ئازادییـــە چی دەگەیەنێـــت، وەك بزانم بەلای هەر یەكێكەوە مانایەكی جیاوازی هەیە. هەربۆیە ئەوەی جێی ســـەرنجە لای من ئەوەیە كە بزانم تۆ چۆنی لێ تێدەگەیت. بەشەكەی تری پرسیارەكەم ئەمەیە، كاتێك ئێمە كەســـێك یان گروپێك لە خەڵك ئازاد دەكەین، ئاخۆ ئەو كەســـە یـــان گروپە ناچێتە ناو شێوەیەكی تری چەوساندنەوەو سەركوتكردنەوە؟

**ڕەحیمـــی:** ئەمـــە پرســـیارێكی زۆر گرنگـــە لەبەرئەوەی بەتەنها تایبەت نییە بە خەڵكی ئەفغانستان، بەڵكو ســـەبارەت بە دۆخی مرۆییە. با باسی هەندێ شت بكەین: ئێمە زۆر باسی تایبەتمەندییەكانی هەر كەلتوورێكمان كردووەو وتوومانە «باشـــە، ئازادی لەم كەلتوورەدا بوونی نابێت، یان شارســـتانێتی لەم وڵاتـــەدا بوونی نابێت»، بەڵام من بـــڕوام بەوە نییە، لەبەرئـــەوەی هەموو مرۆڤەكان مافیان هەیە. هەندێ جیهانێتـــی **universality** هەیە، هەندێ هەســـت و ســـۆزی جیهانی، وەكو خۆشەویستی. تۆ ئەگەر ئەمەریكـــی بیت، یان ئەفغانی، یا پاكســـتانی و یان ژاپۆنی، خۆشەویســـتی هەر خۆشەویســـتییە. بەڵام خۆشەویســـتیەكەی من لە خۆشەویســـتییەكەی تۆ جیاوازە، ئەمە شـــتێكی ترە، بەڵام هەست و سۆزی خۆشەویستی هەمان شتە. بە بڕوای من سەبارەت بە ئازادییش هەمان شت ڕاستە.

بێگومان هەندێجار خەڵكانێك هەن كە بۆچوونی جیاوازیـــان بۆ ئازادی هەیە، بەڵام بەلای منەوە ئەمە وەكو خۆشەویستی وایە. خەڵكی بۆچوونی جیاوازیان بۆ خۆشەویستی هەیە. بەڵام من كاتێ ژنێكی ئەفغانی دەبینم كە ناتوانێت شـــین بـــۆ مێردەكەی بكات، هەڵبەت ژمارەیەكی زۆری ژنان هەن لە ئەفغانستاندا كـــە ئەمەیان پێ قبووڵە. بۆ؟ لەبەرئەوەی ئەوان هیچ ئایدیایەكی تریان سەبارەت بە ئازادی نییە. لەبەرئەوەی ئەو ژنانە هیچ شتێك دەربارەی دەرەوەی لادێكەیان، دەرەوەی وڵاتەكەیـــان نازانن. جا هەر لەبەرئەمە وا دەزانن كە ئیتر ئەمە واقیع و حەقیقەتە، ئەمە هەموو شتێكە. كەواتە هەموو شتەكان لە هەموو شوێنەكان وەكو یەك وان. ئەمە كێشەكەیە. كێشەكە هەڵبژاردنە، ئەوكاتە دەتوانیت ئازادیت هەبێت. بەبێ هەڵبژاردن ئازادی مەحاڵە. هەڵبەت هەر كەسەو ئایدیای خۆی بۆ ئازادی هەیە. ئازادیی من لە ئازادیی كەسێكی تر ناچێت، بەڵام شتێك هەیە كە گرنگە: ئەو كەسەی تر دەبێت هەندێ ئایدیای دەربارەی ئازادییەكەی من و ئازادییەكەی هەردووكمان هەبێت تا بزانێت كامیان هەڵدەبژێرێت. ئازادی وەك چەمك بەلای منەوە هیچ ناگەیەنێت، لەبەرئەوەی ئێمە ناتوانین پێناسەی بكەین، ناتوانین ڕاڤەی بكەین. خۆشەویســـتی: ئێمە ناتوانین خۆشەویســـتی ڕاڤە بكەین. دەتوانیـــن هەڵیبژێرین، لەبەرئەوەی هەموو ئەمانە لەســـەر بنەمای ئەزموون دامەزراون. پاشان دەشێ ئایدیایەكمان لەسەر ئازادی هەبێت.

**جەی كـــەی:** جەنگ و ململانـــێ، مەرگ و وێرانـــكاری لەگەڵ خۆیاندا دەهێنـــن، بەڵام دەبنە

هۆی هاتنــــە ئاراوەی هەندێ ئایدیای نوێ. کەمێك دەربـــارەی ڕۆڵی جەنگ و ململانێ لە هێنانە ئارای چەمك و تێگەیشـــتنی نوێی وەكـــو ئازادی، بۆمان بدوێ.

**ڕەحیمی:** تۆ دەزانیت کە جەنگ هەرگیز تەواو نابێت. بەدبەختانە، ئەدەب لەگەڵ جەنگدا دەســـتی پێکرد. بیر لە «ئیلیادە»بكـــەرەوە. ئەدەبیاتی جەنگ لە یۆنانی کۆندا. ئۆدێســـە. هەموو ئەمانە دەربارەی جەنگن. مەهابهاراتا لە هیندســـتان. جەنگە. شانامەی فیردەوســـی. «هونەری جەنگ» لـــە ژاپۆن. هەموو ئەدەبیاتـــی دونیا لەگەڵ جەنگدا دەســـتی پێ کرد. ناتوانین لە جەنگ هەڵبێین.

**جەی کەی:** پێوەی لکاوین.

**ڕەحیمی:** بەداخەوە، بەڵێ.

**جـــەی کـــەی:** جەنـــگ بۆتە بابەتـــی هەموو کارەکانت. ئەگەر جەنگ نەمێنێت دەبێ شتێکی تر بدۆزیتەوە تا لەبارەیەوە بنووسیت.

**ڕەحیمی:** «پێدەکەنێت» ڕاستە. بڕوا ناکەم بتوانین ئەو توندوتیژییە بۆ شـــتی تر بگوێزینەوە. لەڕووی تیۆرییەوە هەوڵ دەدەین لەڕێی ئاشـــتی و هتد...وە ئەوە بکەین. ڕەنگە بۆ ماوەی ســـێ ســـاڵ، یان لە باشـــترین حاڵەتدا بۆ ماوەی پەنجا ساڵ. بەڵام پاشان ئابووری پێویستیی بە جەنگ دەبێت. بەداخەوە، ئەمە بەشێکە لە ژیان. ناتوانین بیگۆڕین. خەڵکانێکی زۆر دێـــن و دەڵێن ئێمە جەنگمان ناوێت، توندوتیژیمان ناوێت، بەڵام لەوانەیە هەرخۆیان بینەوە بە خەڵکانێکی توندوتیژو جەنگ هەڵبگیرسێننەوە.

**جەی کەی:** لە ســـێپتەمبەر «ئەیلول» ی ســـاڵی ٢٠٠١دا سیاسەتی ئەمەریکا بەرەو توندبوون دەڕۆیی و ئەمەمـــان بەچاوی خۆمـــان دەبینـــی، هەروەها چاوەڕێی ئەوە دەکرا کە ئەمریکا بچێتە ئەفغانستانەوە. لەکاتی بینینی ئەو سیاسەتەو ئەو چاوەڕێکردنەدا کە خەریکبوو ڕوویدەدا، هەســـت و بیروبۆچوونی تۆ چی بوو؟ ئاخۆ وتت «دیسانەوە»؟

**ڕەحیمی:** دەمەوێ چەند شـــتێك دەربارەی ئەم شەڕەی ئەفغانســـتان بڵێم. ئێمە باسی توندوتیژی و شەڕی ناوخۆی ساڵی ١٩٩٢ مان کرد لە ئەفغانستاندا، پاش داگیرکارییەکەی سۆڤێت. لەوکاتانەدا دەمبینی هەموو کەسێك هاواری دەکرد «ئەمریکا بۆچی هیچ بۆ ئەفغانستان ناکات؟» هەموو کەسێك وای دەوت. لە خەڵكـــی عەوامەوە تا ڕۆشـــنبیرەکان. دەیانوت «ئەم شـــتانە بۆ خەڵکی یوگوسلاڤیا دەکەیت، ئەی بۆ ئەفغانســـتانی بۆ ناکەیت؟» بەڵام هەر ئەوەندەی ئەمریکاش هات بۆ ئەفغانستان، هەموو دەیانوت«بۆچی هاتوون بۆ ئەفغانستان؟» «پێدەکەنێت».

**جەی کەی:** هەرگیز خۆشحاڵ نین.

**ڕحیمی:** هەرگیز خۆشـــحاڵ نیـــن. ئێمە دەبێ کەمێك مەودا لەنێوان خۆمان و شـــتەکاندا دابنێین. بەر لە هەموو شتێك، ئەم شـــەڕە لە ئەفغانستاندا بۆ خەڵکی ئەفغان نییە، ئەمە شـــەڕی نێوان بەشەریەت و هەندێ بزاڤی ئسووڵییە. ئسووڵییە نێودەوڵەتییەکان. لەبەرئەوەی بەتەنها هێزی ئەمریکی لە ئەفغانســـتان نییە، بەڵکو هێزێکی نێودەوڵەتـــی لەوێیە، یوئێن و هتد... هەروەها لایەکەی تریش تاڵیبانن، بەڵام بەتەنها بریتی نین لـــە تاڵیبان. تاڵیبانی پاکســـتانی، تاڵیبانی ســـعوودی. خەڵکێکی زۆری پاکســـتانیش لەگەڵ خەڵکی ئەفغاندان. کەواتە ئەمە شتێکە لە بەینی دوو بزاڤـــدا، دەزانیت. بەداخەوە، ئەمە شـــەڕی خەڵکی ئەفغان نییە. بەڵام لە ســـەرەتاوە هێزی نێودەوڵەتییان هەبوو و هاتنە ناو ئەفغانســـتانەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو شەڕە، بۆ ڕاوەدوونانی تاڵیبان، قاعیدە و هتد...بەڵام دوای کۆمەڵێك هەڵەی سیاســـییش، وەکو شەڕی

عێراق. ئەمەش گرنگــە: وەختێ ئەوان تاڵیبانیان لە ئەفغانستان ڕاو نا، بۆ ماوەی سێ تا چوارساڵێك لەوێ نەمان، بەڵام لەماوەی ئەو ســێ چوارساڵەدا ئەوان لە پاکســتان بوون و ئەمجارە خۆیان ڕێکخستەوە. لەوێ ســوپایەکیان پەیداکرد، پارە، چەك و هەموو شــتێك بۆ سەرلەنوێ خۆڕێکخســتنەوەو گەڕانەوە بۆ ئەفغانســتان. بەڵام ئەوان وایاندەزانی کە تاڵیبان تەواو بوون و چوون تا کار لەســەر عێراق بکەن. ئەمــەش هەڵەیەکی گەورەبــوو. لەبەرئەوەی هەر وەکو دەشزانیت، لە پاکستان موخابەراتێك هەیە پێی دەڵێن **ICI** ئای. سی. ئای. سوپای پاکستان لەلایەن ئســوولێیەکانەوە کۆنترۆڵ کراوە. بەڵام تۆ دەزانیت کە پاکســتان هاوڕێمانەو ئەمەش هەڵەیەکی گەورە بوو. لەبەرئەوەی بەلای خەڵکی پاکستانەوە «هەروەها بەلای ئێرانیشەوە» ئەفغانستان دەشێ بۆ دانوستان لەگەڵ ئەمریکادا باش بێت. من باش بیرم دێت لە ٢٠٠٤ دا کاتێ ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا پرسییان کە بۆچی یارمەتیی خەڵکی پاکستانیان دا. لەوێ دیموکراسی نییە، ئازادی نییە، هەموو ســاڵێك پارەیان دەدەینێ، هتد... ئینجا پاش هەفتەیەك و لە ســەرەتای ئەیلولدا ئەمریکا لە ئەفغانستان بوو. ئەمجارەیان پاکستان وتی «باشە، تۆ ناتەوێ یارمەتیم بدەیت، دەیبینیت.» بەلای پاکستان و هەروەها بەلای چینیەکانیشەوە، ئەفغانستان شوێنێکە بۆ گۆڕینەوەی پارە، بۆ دانوستان. کاتێکیش دەچیت بۆ ئەفغانستان، ژمارەیەکی زۆر ڕێستۆرانتی چینــی دەبینیــت. ژمارەیەکی زۆر لــە کەلوپەلی بازرگانی، تەنانەت کەلوپەلی نەریتییانەی خۆشمان لە چینەوە دێن. هەروەها لەم ڕێســتۆرانتانەدا گەلێ کاری سیخوڕی ئەنجام دەدرێن. تەنها ئسوولێیەکان نین. بەڵکو جەنگێکی تریش هەیە. جەنگی ئیشوکار، جەنگی بازرگانی. ئەفغانســتان کەوتۆتە ناوەڕاستی هەموو ئەمانەوە لەنێوان چین و هیندســتان و ئێران و پاکستان و ڕووسیادا. هەروەها ئێمە دوو ژیارمان هەیە. یەکێکیان من ناوم نــاوە ژیاری ئەبراهیمیك «هیندی- مەســیحی» کە ئایدیایەکی جیاوازیان بۆ ئاخیرەت هەیــە. هیندی و چینیەکان هەمان ئایدیاو هەمان ژیاریان نییە. لۆجیکێکــی ترە، تێڕوانینێکی ترە بۆ جیهــان، بۆ ژیان، بۆ مردن، بۆ ئیشــوکار. ئەفغانســتانیش لە ناوەڕاســتی هەمــوو ئەمانەدایە. ناشتوانین ئەفغانستان لە جیهان جیابکەینەوە. ئەگەر هەڵەیەك لە جیهاندا هەبێت، لە ئەفغانستانیش هەیە.

**جەی کەی:** دەگەڕێینــەوە بۆ ئایدیای دەنگ. بەڵام لەم حاڵەتەدا دەنگی شوێن. بەرلەوەی بڕۆین، ئاخۆ هیچ پرۆژەیەکی تازەی وات هەیە کە ئێســتا کاری لەسەر بکەیت و خەڵك چاوەڕێی بن؟

**ڕەحیمی:** لەئێســتادا، کتێبی پێنجەمم نێردراوە بــۆ چاپ و لە ١٠ ی مارتدا دەچێتە ســەر ڕەفەی کتێبخانەکانی فەرەنسا. ناونیشانەکەی «دۆستۆیڤسکیی نەفرەتلێکــراو»ە. هەروەها لە مانگی مایســدا و لە مەغریب دەســت بە وێنەگرتنی فیلمەکەم دەکەم، کە لە «بەردی ســەبر»ەوە ئامادەکراوە. جگە لەمانە ئۆپێرای «خاك و خۆڵەمێش» کە لە لیۆن پێشکەشی دەکەین. زۆری تریش «پێدەکەنێت».

**جەی کەی:** زۆر سوپاس.

**ڕەحیمی:** لە خۆشیدا بن.

**سەرچاوە:**

http:// mantlethought.org

Literary Current Series: An Interview with Atiq Rahimi

# خۆشەویستی چییە؟
# دەمەتەقێیەکە لەگەڵ لاش نۆرێن

سازکردنی: ماریا ترێگۆرد
دانا ڕەووف
لەسوێدییەوە کردوویەتی بەکوردی وپەراوێزی بۆ داناوە[1]

کاتێك لاش نۆرێن من لەسەر عەرەبانەی کەمئەندامان دەبینێت، بۆ تەنها ساتێکیش بەو شێوە پڕ لە هەست و سۆزو بەزەییەی کە من لەسەری ڕاهاتووم، سەیرم ناکات، هەروەکو من بەو شێوەیە نەبینێت، یان نەوێرێت ڕووبەڕووی ئەم کەمئەندامییەم ببێتەوە.

لاش نۆرێن دەیەوێت هەموو شتێك بزانێت و بەبێ شەرم پرسیار دەکات. من هاتووم بۆ گۆتلاند تا هەوڵبدەم و تۆزێك لە ژیانی لاش نۆرێن تێبگەم، بەڵام ئەو دەست بەسەر بارودۆخەکەدا دەگرێت و دەکەوێتە پرسیارکردن:

- ئەسپەکە چی کرد؟
- بەپشتدا کەوتیتە خوارەوە؟
- دەتەوێت سەرلەنوێ دەست پێبکەیتەوە ؟[3]

دەستبەجێ ئەو وێنەیەی لەلای خۆم سەبارەت بەلاش نۆرێن بۆ خۆمم دروستکردبوو، ئاشکرا دەبێت: کە ئەم نووسەرە مرۆڤەکان، ئەزموونەکان و تراژیدیاکان کۆدەکاتەوە، کە ئەو ژیان و چارەنووسی خەڵکی پێویستە، بۆ ئەوەی شانۆنامەکانی بنوسێت.

دواى ئەوە لاش نۆرێن ددان بەوەدا دەنێت کە ئەو

**چەندین شانۆنامەی نووسراوم هەن، بەلای خۆمەوە لە ئاستێکی باش و بەرزدان، بەڵام تاکو ئێستا نە بڵاومکردوونەتەوە، نە ناردووشمن بۆ شانۆکان. من هیچ پێویستییەکم بە کاردانەوە و ستایشێك نییە بەرانبەر ئەم شانۆنامانە. تەنها لەوکاتانەدا دەریاندەهێنم کە پێویستم بە پارەیە**

زیندە خەونێکی ناخۆش و دێوزمە ئاسای هەیە و هەمیشەش دووبارە دەبێتەوە، کە لەپڕ لەخەو خەبەری دەبێتەوە و هەستدەکات ناتوانێت جەستەی بجوڵێنێت و هەروەکو من دەبێتە کەمئەندام و بەکورسی عەرەبانە ئاسای کەمئەندامان دەڕوات.

کاتێـك دەگەم، لاش نۆرێن بە پایسکیلێکی بچکۆلەوە چاوەڕوانیم دەکات و بەرەو ناو هەر سێ خانووە بەردینە جوان و رووناکەکانیم دەبات. تیشکی رۆژەکە بڵاوبۆتەوەو ئێمەش لەدەرەوە، لەپاڵ تاشەبەردە وشك و رووتەڵەکاندا دادەنیشین و لەکوپی گەورەدا قاوە دەخۆینەوە. تیشکی رۆژەکە بەناو لەوەڕگای مەڕو مانگا، کێڵگە فراوان و پێدەشتەکاندا بڵاوبۆتەوە. (ئانیکا) کێکی بەدارچینی بۆ کردووین و بەقاوەکەوە دەیخۆین. ئانیکا ئەکتەرەو پایز لەکاتی نمایشکردنی شانۆنامەی (ئاوی وەستاو)ی لاش نۆرێن خۆیدا، کە بۆ شانۆی جولەکە لەستۆکهۆڵم کاریان تێداکردووە، یەکترییان دیوە. کێکە دارچینییەکە زۆر خۆشە، لاش نۆرێن و ژنە تازەکەشی، ئانیکای ئەکتەر، لەوەدەکات لەم شوێنەدا پێکەوە بەختیاربن.

دواتر من بواری ئەوەم بۆ دەڕەخسێت پرسیاری لێبکەم و گفتوگۆکەمان دەستپێبکەین.

سەرەتا لێیدەپرسم کە نیازی ئەوەی نییە بەیەکجارەکی بگوێزێتەوەو لەم دوورگەیە بژی؟

- هیوادارم. من زۆر حەزدەکەم کە لێرەبم.

- لەپڕ لایەنێکی تری خۆیم بۆ ئاشکرا دەکات، کە تەواو بە من نامۆیە. ئەم نووسەرە گەورەیەی سوێد، کە لەدوای ئینگمار بیرگمانەوە لە هەموو کەسێك زیاتر لەسەری نووسراوە، فرە بەرهەمەو بەردەوام خاوەنی پرۆژەی تازەیە. ئەم نووسەرە کە بەدیدێکی رەش ناوزەد کراوەو بەرهەمەکانی مۆرکێکی پڕ لە نائومێدی و شەڕی نەوەکان لەخۆ دەگرێت، دەیەوێت و خەون بەوەوە دەبینێت کە بەتەواوەتی و بۆ یەکجارەکی لەدنیای ئەدەب و شانۆ دووربکەوێتەوە، لەبری ئەوە باخێکی گێلاسی ژاپۆنیی تایبەت بەخۆی بڕوێنێت و باخچەکانی بژارو پاك بکاتەوە.

- یەک دوو ساڵی تر بەکاری ڕیژییەوە خەریک دەبم و دوای ئەوە دەکێشـــمەوەو خۆم بڕیار لەسەر کاتی خۆم ئەدەم. من هەر زۆر بە پەرۆشی ئەوەوەم بەتەواوەتی لە هەموو شـــتێک دووربکەومەوەو تەنها هەر لێرە، لەم شوێنەبم. پێمخۆشە ئەو قۆناغە ئەکتیڤ و پڕ لەکارەم تەواوبکەم.

• واز لەنووسین دەهێنیت؟

- نەخێـــر، بەپێچەوانـــەوە، ئـــەوکات دەتوانم بەتەواوەتی خۆم بۆ نووسین تەرخان بکەم.

• دایک و باوکت سەبارەت بە پیشەکەت، وەکو نووسەر دەیانووت چی؟

- هـــەرزۆر دوودڵ و نائـــارام بـــوون. ئەوان دەیانوویســـت نووســـین وەکو کاریکـــی لاوەکی وەربگرم، لەبری ئەوە پیشەیەکی تەواوەتیم هەبێت. دایکم دەیوسیت من ببم بە قەشە، خۆی لەبنەماڵەیەکی قەشەدا گەورەبووە.

• چۆن باســـی گەورەبوونی خۆت لە هوتێلی خێزانەکەتان، لەناوچەی گێنارپ دەکەیت ؟[٤]

- کاتێکی خۆش بوو. لەزۆر ڕووەوە کاریگەریی هەبـــووە لەســـەر من، هەمـــوو جـــۆرە مرۆڤێکی لێکۆدەبـــووەوە. لە ژووری نان خواردن، شـــوێنی دانیشتن بەپێی ئاستی چینایەتی دیاریکرابوون: باشترین شـــوێنەکان، مامناوەندی...هتـــد. ژووری قاوەو چا خواردنەوەو هەروەها شوێنە خراپەکان. تێکەڵەیەکی سەیرو سەمەرەبوو. ڕیتواڵەکانی بەخاک سپاردن، ژن و ژنخوازی و ئاهەنگێڕان و کەسانێکی زۆری سەرخۆش و بەدمەســـتەکان. هەموو لەم هۆتێلەدا کۆدەبوونەوە. ئەو جوتیارانەی کە کێڵگەکانیان بەهۆی بەدمەستی و مەی خواردنەوەوە لەدەست ئەداو چەندین تراژیدیای تر، بەڵام ژیانێکی ئێجگار قەرەباڵغ بوو، ژیانی ڕۆژانە زریانێکی گەورەبوو لەهاتووچۆی بونیامەکان.

• شـــتێکمان دەربـــارەی منداڵـــی خـــۆت بۆ بگێڕەرەوە؟

- تەمەنم شـــەش ساڵ بوو کە هاتم بۆ گێنارپ. یەکەم ڕۆژەکانی قوتابخانە کە دەستم پێکرد، چەند کوڕێـــک منیان بە عەمودێکی کارەباوە بەســـتەوەو بەوایەرێـــک کەوتنە لێدانم، هەرلەبـــەر ئەوەی من بەشـــێوەیەکی سەیر قسەم دەکرد. ئەمە ڕاچڵەکین و شـــۆکێکی گەورەبوو بۆ من، کاریگەرییەکی قوڵی تێکردم. لێرەوە ناچاربـــووم بەرگری لەخۆم بکەم، زیاتر ببمە کەســـێکی بێباک و کەللەڕەق. زۆر گرانە لەپڕ بکەویتە ناو گوندێکی ناوچەی (ســـکۆنە)وە.[٥] خانەوادەکەشـــم خاوەنی پیشـــەگەلێکی تایبەتمەند بوون، هۆتێلیان هەبوو، باوکم بەدمەست بوو. ئائەمە بەشێوەیەکی بەهێز کاریتێکردووم و بۆتە بەشێک لە من.

• چۆن؟

- زۆر ئاسانە بۆ من خۆم لەو کەسانەدا ببینمەوە کە لەدەرەوەی سیستمە کۆمەڵایەتییەکاندان، من لەمە دەگەم و دەیانناسمەوە.

• بۆچـــی لەتەمەنی پانزە ســـاڵیدا لە گێنارپەوە گەڕایتەوە بۆ ستۆکهۆڵم؟

- لەلایەکەوە لەبەرئەوەی ژیانی ماڵەوە زەحمەت و دژواربوو، لەلایەکی تریشـــەوە دەموویست بێم بۆ ستۆکهۆڵم تا ببم بە نووسەر.

• یادی ماڵەوەتان نەدەکرد؟

- کچێکم ناسی و بۆ ماوەی سێ ساڵ لە شەقامی ڕیدەرگاتان[٦] لەلای ئەو دەژیام، لەبەرئەوە هێندە بیری ماڵەوەم نەدەکرد. ئەو کچە دە ساڵ لە من گەورەتر بوو، من تەنها تەمەنم شانزە ساڵان بوو، ئەویش بیست و شەش ساڵ بوو.

• برایەکتـــان لـــە گێنـــارپ دەژی، چ جۆرە پەیوەندییەکتان بەیەکەوە هەیە؟

- زۆر نا. ئەو ئەندازیاری خانووبەرە بوو. ئێســـتا

خانەنشـــینەو دە ســـاڵ لە من گەورەترەو ژیانێکی تایبەتمەندی خۆی هەیە، جیهانێکی تایبەتمەند. شتێکی ناخۆش و گرانیش نییە کە ئێمە هیچ پەیوەندییەکمان نییە. ئەوە واقیعێکەو پێی رازی بە.

● چـــی وای لەتۆ کردووە کە بەردەوام بیت لە نووسیندا؟

- من وزەیەکی بەهێزم هەیە. چەندین شانۆنامەی نووســـراوم هەن، بەلای خۆمەوە لە ئاستێکی باش و بەرزدان، بەڵام تاکو ئێســـتا نە بڵاومکردوونەتەوە، نە ناردووشمن بۆ شـــانۆکان. من هیچ پێویستییەکم بە کاردانەوەو ستایشێك نییە بەرانبەر ئەم شانۆنامانە. تەنها لەوکاتانەدا دەریاندەهێنم کە پێویستم بە پارەیە. ئەم شانۆنامانە تا لەچەکمەجەو سەر رەفەکاندا بمێننەوە، مـــن خاوەنیانـــم و موڵکی خۆمە. ئەوانەشـــی کە بڵاودەکرێنەوە یان لەسەر شانۆکان نمایش دەکرێن، زۆر لەمێژە نووسیوومن.

● بۆچـــی لەتەمەنی چل و نۆ ســـاڵیدا بوویتە ریژیسۆر؟[8]

- (یان مالمشویی)و (ماریا یۆرانزۆن)[7] بیریان لە شانۆنامەی (سەمای مەرگ)ی سترینبیری کردبووەو پرســـیاریان لە من کرد کە کاری ریژیان بۆ بکەم. من هەرگیز لەوەوبەر و بەهیچ شێوەیەك بیرم لەکاری ریژی نەکردبوەوە، بەڵام بیرم کردەوە بونیام دەتوانێت هەولێکی لەگەڵدا بـــدات. بەهەرحاڵ دەتوانین هیچ نەبێت دەستبکەین بە خوێندنەوەی.

● وەکو بەڕێوبەر چۆنیت؟

- باشم، زۆر باش.

● چۆن؟

- نا، من تەنها شـــۆخیم کرد. من حەزم بەوەیە کە سەرپەرشتیاربم و بڕیاربدەم، من هەر زۆر حەزم لەوەیە.

● بۆچی ریگا بۆ ئەکتەرەکانت خۆشـــدەکەیت سەما بکەن؟

- ئەوە شـــتێکی لەخۆوە بوو، جارێکیان کارم لەگەڵ گروپێکی گـــەورەی ئەکتەرەکاندا دەکردو بیرم لەوە دەکردەوە چی بکەم. سەما هات بەخەیاڵمدا. رێگام بۆ کردنەوە سەمابکەن. سەماکردن چەندین، یاخود هەموو دژایەتییەکان تێك و پێك دەشکێنێت و رێگایەکی زۆر باشـــە بۆ نزیك بوونەوەو لەیەکتر گەیشتن.

● بۆچـــی تۆ هەرگیـــز دوای یەکـــەم رۆژی نمایشـــەکان ناگەڕێیتـــەوە بۆ لای ئەکتـــەرەکان و نمایشەکە ؟[9]

- من زۆر بە چڕی کاردەکام و تامەزرۆی ئەوەم بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە تا بنووسم. ئەمە بۆ من ژیان و مەرگە. بەهەمان شـــێوە کاری ریژی بەلامەوە هێندە گرینگ نییە، بۆ من تەنها کارێکی خۆشەو هیچیتر. بەڵام لەو بڕوایەدام کە ئەکتەرەکان ئەمەیان پێخۆش نییەو دڵگران بن پێی.

● دوو شانۆنامەت لە چەکمەجەکانتدا حەشارداوە، بۆچی ئەمانە نمایش ناکرێن؟

- ئەو شانۆنامانە زۆر تایبەتمەندن بەخۆم، پازی خۆم دەکەن، ژیانـــم. کە منداڵ بووم. ئەمانە دەبێت چاوەڕێ بکەن تا من دەمرم.

● بۆچی شانۆنامەی (حەوت/سێ)تان نووسی؟

- نامەیەکم لە یەکێك لەبەندییەکانی بەندیخانەی (تیدەهۆڵم)ەوە بەدەست گەیشت.[10] بەندییەکانی ئەو بەندیخانەیە گروپێکی شانۆییان دروستکردبوو، داوایان لە من کرد، ئەگەر تێکستێکم هەبێت بەکەڵکی ئەوان بێت. منیش لەگەڵیان کەوتمە گفتوگۆ کردن. هەر زوو یەکێك گووتی من (ناشـــوناڵ سۆسیالیســـتم)، بەمە من بەتەواوەتی تووشـــی شـــۆك و راچڵەکین بووم.[11] ئەمانە لەناوجەرگەی کۆمەڵگای ســـوێدیدا بوون و منیش دەمویست بزانم چین. بارودۆخێکی

داخراو و ترسناك بوو. پەیوەندی و لێکتێگەیشتن و نزیکبوونەوەش هەرزۆر مەحاڵ بوو.

● لەکاتی ئەو پرۆژەیـــەدا، پەیوەندییەکانت بە (تۆنی ئۆڵسۆن)و (ماتس نیلسۆن)ەوە چۆن بوو؟[١٢]

- هەمان پەیوەندی کە من بە هەموو ئەکتەرێکی ترەوە هەمە. خۆشم بووێن، کاربکەم لەگەڵیاندا، بەڵام ئەوانم وەك (کەس) خۆشنەوێت، ئەوەم خۆشبووێت کە دەیکەن.

● چـــۆن زانیت کە ئـــەوان لە هێرشـــەکەی مالێکساندرادا بەشداربوون و خەڵکیان کوشتووە؟[١٣]

- بەهـــۆی وێنەیەکـــەوە کە لـــە رۆژنامەکاندا بڵاوکرابوونەوە. من دەســـتی تۆنیم ناســـییەوە کە بەچەکێکـــی AK٤ ەوە، لەبەردەمی دەرگای (بانك) لە کیســـە وەســـتابوو. تووشـــی شـــۆکێکی بەهێز هاتم، بـــووم بە بەردو نەمدەتوانـــی لەجێگای خۆم بجوڵێمەوە، لەهەمانکاتدا بەو هیوایە بووم ئەوەی کە لە رۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە راست نییەو هەڵەیە. هەروەها من زۆر بەو رووداوە سەرسوڕماو نەبووم. من هێندە نەفام و سادە نەبووم کە لەو بڕوایەدا بم ئەوەی ئێمە پێکەوە کردوومانە، کاریگەرییەکی بەهێزی وەها لەوان بکات، کـــە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتییان تێدا دروستبکات و بیانکاتە هاوڵاتییەکی باش و بەسوود.

● ئەی چیت کرد؟

- لە مۆتیڤەکانی خـــۆم ورد بوومەوە، لەخۆمم پێچایەوە. دەبوایە چیمان بکردایە؟ من گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە ئێمە مۆتیڤەکانمان هەر زۆر راســـت و پاك بوون.

● ئەم مەسەلەیە بە چ شێوەیەك تۆی گۆڕیوە؟

- ئەم کارەساتە بەشـــێکە لە ژیانم و شتێکە بە بەردەوامی و رۆژانە کاری بۆ دەکەم. بەخۆشحاڵییەوە دەمەوێت جارێکیتر کار لـــە بەندیخانەکاندا بکەم، بەڵام هەرگیز لەگەڵ کەسانی نازیدا نا.. هەرگیز. من هەستەکەم پیس بووم، ئەوە ئایدۆلۆژیایەکی پیسە، ترسناکە، دژی ژیان و پڕ لە هەڕەشەیە.

● چیت بە تۆنی و ماتس گووت، کە لەبەندیخانە سەردانت کردن؟

- من دەمویست بزانم ئەوان چۆن توانیان تاوانێکی وا بکـــەن و لەهەمانکاتدا لەگەڵ ئێمە کاربکەن. من دەمویســـت ئەمانە واز لە نازیزم بهێنن. سەردانەکەو رووبەڕووبوونەوەی ئەوان، ئێجگار دژوارو ترســـناك بوو. بونیام هەستی بە ئامادەگی تاوانەکەیان دەکرد، ژیانـــی چەند کەس بەهۆی ئەوانەوە تێکشـــکێنراو لەناوچوون.

● چۆن دەڕوانیتە بنەماکانی خێزانێکی کامڵ و تەواوەتی؟

- شـــتی وا هەیـــە؟ لەوانەیە تەنهـــا لە خەونی پارتی کریســـتییان دیموکراسەکاندا شتی وا هەبێت. من خودی خۆم هیـــچ خەونێکم بۆ خێزانی کامڵ و تەواوەتی نییـــە. من لەوبڕوایەدام ئەوە جۆرێکە لە بەندیخانە. من خەون بە مرۆڤی سەربەستەوە دەبینم.

● ئەی تۆ وەکو باوکێك چۆنیت؟

- لەوبڕوایەدام من باوکێکی هەرزۆر باش بم.

●کچەکانت بۆ تۆ چی دەگەیەنن؟

- من بەوانەوە دەژیم و زۆر وابەســـتەی ئەوانم. بەبەردەوامی بیر لەوان دەکەمەوە، پەیوەندییەکی زۆرم پێیانـــەوە هەیە. بۆ من زۆر گرانە ددان بەوەدا بنێم و لەوەبگەم کە ئەوان گەورە بوون. ئێستاش دەمەوێت هەر من بڕیاربدەم. یەکێکیان تەمەنی بیست و پێنج ســـاڵەو ئەویتریان سی و سێ ســـاڵە... ئەمە هەرزۆر منداڵانەیە.

● ژیان لەگەڵ تۆدا چۆنە؟

- لەوبڕوایەدام کە گران بێت، من کەســـێکی ســـەربەخۆم و دەتوانم لەژێرزەمینێکدا بە تەنیا بژیم. تەنگـــەژەو گرفتی گەورەش لە ژیانمـــدا ئەوەبووە

هەوڵبدەم هاوسەنگییەك لەنێوان خێزان و كارەكانمدا بكەم.

● خۆشەویستی چییە؟

- شتێكە دەچێتە نێو پێست و ئێسقانەكانمانەوە، شـــتێكی ئێجـــگار پڕ لـــە رازو نهێنی كـــە دوایی دەردەكەوێت شتێكی بەڵگەنەویست و بێگومانە.

● چوونە تەمەن و پیربوون بەلای تۆوە چۆنە؟

- حەزدەكەم بچمە تەمەنەوە، تامەزرۆی ئەوەم. ئەوكاتەو بەوپەڕی بەختیارییەوە دەتوانم ئەوەی كە خۆم دەمەوێت، ئەوە بكەم. داواكان گەورەتر دەبن، بـــەڵام من دەمەوێت زیاتر بـــەردەوام بم، هەوڵبدەم ســـەربكەوم بەســـەر داخوازییەكاندا، من دەمەوێت پیربم، هەشتا ساڵ، تا بزانم ئەوكاتە چ دۆزێكم ماوەو لەسەر چی كاربكەم.

● چ شتێك بەلای تۆوە گرینگە؟

- كە بەشێوەیەكی راست رەفتاربكەم، رەفتارێكی راســـت لەگەڵ چ شتێكدا بكەم، كە لەگەڵ خودی خۆم راســـتگۆبم، كە ویژدانی خـــۆم بە زیندوویی بهێڵمەوە، كە زۆر توندبم.

**پەراوێزەكان:**

١. چاوپێكەوتنی ئێجگار زۆر لە رۆژنامە، ئێزگە، تیڤـــی و گۆڤارەكاندا لەگەڵ لاش نۆرێن كراوەو كەم و زۆر پازی ژیانی خـــۆی و پرۆژە كۆن و تازەكانی كردووە. بـــەڵام هیچ چاوپێكەوتنێكم بەچەشـــنی ئەم چاوپێكەوتنە نەدیوە، كە رۆژنامەنووس (مارییا ترێگۆرد) سازیكردووەو لاش نۆرێن راشـــكاوانەو بەراستگۆیی وەڵامی پرسیارەكان بداتەوە. ئەم چاوپێكەوتنە كورتە، هەرچەندە ساكارەو پرســـیارو وەڵامەكان بەشێوازێكی كورت، فۆرمێكی رۆژنامەنووسی سانای لەخۆ گرتووە، بەڵام لاش نۆرێن چەندین راستی گرینگ دەدركێنێت و وەڵامی هەندێك پرســـیار دەداتەوە كە لەوەوبەر بە هیچ شێوەیەك نەیویستووە قسەیان لەسەر بكات.

٢. گۆتلاند: دوورگەیەكە لەنێو دەریای بەلتیكداو لەگەڵ چەند دوورگەیەكی دیكەدا خاكێك لە یۆتلاندو هەرێمـــی خۆیدا، گۆتلانـــدس لێـــن، پێكدەهێنێت. دوورگەی گۆتلاند بەشێكە لە خاكی وڵاتی سوێد.

٣. لەوە دەچێت رۆژنامەنووسەكە بەهۆی كەوتنە خوارەوە لەسەر پشتی ئەسپەوە، كەمئەندام بووبێت.

٤. گێنارپ گوندێكی بچوكی ســـەر بەشـــاری لونـــدەو دەكەوێتە باشـــوری ســـوێدەوە. لاش نۆرێن لەتەمەنی شەش ساڵییەوە تاكو پانزە ساڵی، لەم گوندەدا ژیاوە.

٥. سكۆنە هەرێمی هەرە باشووری وڵاتی سوێدە.

٦. ریدەرگاتـــان یەكێكـــە لە ناوچـــە دیارەكانی ستۆكهۆڵم و دەكەوێتە ناوەڕاستی شارەوە.

٧. یان مالمشوێی و ماریا یۆرانزۆن دوو ئەكتەری ناسراوی سوێدن و لە شـــانۆی پادشایەتی كاردەكەن. ئـــەم دوو ئەكتـــەرە ژن و مێـــردن و زۆرجار لەكارو پرۆژەی هاوبەشدا كاردەكەن.

٨. لەشـــانۆ گەورەكان، كاری ریژیســـۆر دوای نمایشـــەكان تەواو دەبێت و كارەكە ئەداتە دەســـت ئەكتەرەكان و ئەوان بەرپرســـیارن لەرەوتی پرۆژەكە. بەڵام هەندێكجار ریژیســـۆرە دیـــارەكان بۆ ماوەیەك لەگـــەڵ ئەكتەرەكانی دەمێنێتـــەوەو چاودێری رۆژانی نمایشەكانی دەكات.

٩. لاش نۆرێـــن لەســـاڵی ١٩٩٨دا، لەیەكێك لە بەندیخانەكانی سوێدو لەگەڵ كۆمەڵێك لە بەندییەكان، بەپێی راهێنانی راگوزاری و گفتوگۆیەكی بەردەوامەوە شانۆنامەی حەوت/سێ، دەربارەی ژیانی ئەو بەندییانە دەنووسێت. شانۆنامەكە لەســـەر شانۆكانی دەوڵەت و

دواتریش لەگەشـــتێکی هونەریدا، لە زۆربەی شـــارو شارۆچکەکانی سوێددا نمایشـــدەکرێت. ئەم پرۆژەیە لەنێوەنـــدە رۆشـــنبیری و هونەرییەکانـــدا بووە هۆی گفتوگۆیەکـــی چڕو بـــەردەوام: گروپێـــك بەتوندی پشـــتگیرییان لـــەم کارە دەکـــردو بەپێچەوانەشـــەوە گروپێکیتر بەتوندی دژی دەوەستانەوە.

لەکاتی نمایش و گەشتەکانی ئەم گروپەدا، ئەکتەرە بەندەکان، بەبێ پاسەوان هەموو سەربەستییەکیان دەبێت و بەوپەڕی ئازادییەوە هەڵسوکەوت دەکەن و تەنانەت لـــەدەرەوەی دیوارەکانی بەندیخانەکەشـــیاندا دەژین. لەگـــەڵ دوا رۆژی نمایشـــەکە، ئەکتـــەرەکان لەبری ئـــەوەی بگەڕێنەوە بۆ بەندیخانەکەیان، لە هێرشـــێکی چەکداریدا، بانقێك دەبـــڕن و بەتوندوتیژی و بەهێزی چەك بەرەنگاریی ئەو پۆلیسانەش دەبنەوە کە دەیانەوێت ئەم دزانە رابگرن. لەئەنجامداو بەشـــێوەیەکی دڕندانەو زۆر لەنزیکەوە پۆلیسەکان دەکوژن و رادەکەن.

١٠. بەندیخانەی تیدەهۆڵم، یەکێکە لە گەورەترین بەندیخانەکانی ســـوێدو لەســـاڵی ١٩٥٩دا کراوەتەوەو جێگای ١٨٩ بەنـــدی تیادا دەبێتەوە. ئـــەو بەندییانەی لەم بەندیخانەیەدا دەگیرســـێنەوە، کەســـانی تاوانباری گەورەن. بۆ نموونە پیاوکوژ، یان ئەوانەی کە لەســـەر بازرگانیکردن بە مادەهۆشبەرەکانەوە گیراون. ئەمە جگە لە دزە گەورەو کەسانی سەر بە مافییا جۆراوجۆرەکان.

١١. ناشۆناڵ سۆسیالیست: نازییە تازەکانی ئەوروپان و هەمان ئایدۆلۆژیای هیتلەریان هەیە، لە دژایەتیکردنی رەگـــەزی جولەکەو بێگانەکانی ئەوروپاو پیرۆزکردنی رەگەزی ئاری. هیتلەر نمونـــەی باڵایانەو تووندڕەون. هەروەها دووپاتی ئەوەش دەکەنەوە کە بەهیچ شێوەیەك قەڵاچۆکردنی جولەکەکان و لەکاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا لەلایەن هیتلـــەرەوە، روونەداوەو ئەوە تەنها درۆیەکی مێژووییە.

١٢. (تۆنی ئۆڵســـۆن)و (ماتس نیلســـۆن) ئەکتەرە بەندەکانی ئەو بەندیخانەیە بوون، کە لاش نۆرێن کاری لەگەڵیان دەکرد. تۆنی ئۆڵســـۆن لەسەر شانۆ بە رووني دووپاتی ئەوەی دەکردەوە کە ناشـــوناڵ سۆسیالیستەو ئەمەش تووڕەبـــوون و دڵگرانیی زۆری لەلای بینەران و بەشـــێکی زۆری ناوەندە هونەری و رۆشنبیرییەکەی ســـوێد دروستکرد. تەنانەت هەندێك لە رەخنەگرەکان و کەســـایەتییە کلتورییەکان پازیـــان لەوە دەکرد کە نمایشەکە، لاش نۆرێن و تۆنی ئۆڵسۆن بدەن بەدادگاو رووبەڕووی یاسایان بکەنەوە.

١٣. ماڵێکســـاندرا: راوەدوونانی پۆلیس و دزەکان بە ماشـــێن و بەکارهێنانی چەکی قورس و هێلیکۆپتەر لەناوچـــەی (ماڵێکســـاندرا)داو لـــە دووڕیانی رێگاو دۆڵێکـــدا کۆتایی پێدێـــت. لەم شـــوێنەدا دزەکان، لەناویاندا (تۆنی ئۆڵســـۆن)و بەیارمەتی (ماتس نیلسۆن) و کەســـانی تری نازی و تاوانبار، بۆسەیەك بۆ ماشێنی پۆلیسەکان دەنێنەوەو بەشێوەیەکی توندوتیژو بێبەزەییانە، پۆلیسەکان لەنزیکەوەو بەدەمانچەکانی خۆیان دەکوژن. تۆنی ئۆڵسۆن بەبەشـــێکی زۆری پارەکەوە رادەکات بۆ وڵاتی (کۆســـتەریکا)، بەڵام ئەوەندە نابات پۆلیسی ســـوێدی هەرهەموویان دەگرن و رووبەڕووی یاسایان دەکەنەوەو تا ئێستاش لە بەندیخانەدان.

**سەرچاوە:**

رۆژنامەی

**Aftonbladt**

# پیاوێك لە گۆشەی شەقامەوە

نووسینی: خۆرخە لویس بۆرخیس
و. لە فارسییەوە: یاسین عومەر

سەبارەت بە خوالێخۆشبوو (فرانسیسکۆ ڕێڵ) قسەم لەگەڵ مەکە. من ئەوم دەناسیو دەمزانی کە ئێرە شوێنی ئەو نەبوو، چونکە ئەو ئازاو بکوژو بڕی دەوروبەری ناوچەی «نورتە «ی نزیك دەریاچەی «گۆدالۆپی « و «باتریا « بوو. من تەنیا سێ جار ئەوم بینی، هەر سێ جارەکەیش لە یەك شەودا، بەڵام هەرگیز ئەو شەوەم بیر ناچێتەوە، هەرگیز بیرم ناچێت کە چۆن «لوخانرا « بێ بانگهێشکردن هاتە کۆڵیتەکەمو نوستو «ڕۆزیندۆ خواریز «یش بۆ هەتاهەتایە لە «ماڵدۆنادۆ « ڕۆشت. دیارە ناویت نەبیستووە، تۆ لەو جۆرە کەسانە نیت کە ئەم شتانەیان بیستبێت. «ڕۆزندۆ خواریز» یەکێك بوو لە شەڕلاتییە بەناوبانگەکانی «ڤیلا سان ڕیتا «، لە چەقۆکێشیدا تاکی نەبوو. سەر بە دەستو دایەرەکەی «دۆن نیکۆلاس پارێدس « بوو، کە وەکو خۆت دەزانیت «پارێدیس»

خۆشی سەر بە دارودەستەی «مۆرێل» بوو. زۆر قۆزو ڕێکپۆشانە بە سواری ئەسپێکی ڕەشی یەخە زیوینەوە بە سورخانەکان ڕادەگەیشت. پیاوەڵو سەگەل ڕێزیان لێدەگرت کچانیش هەروەها. هەموو دەیانزانی کە دوو خوێنی لە گەردندایە. هەمیشە کڵاوە بەرزە لێوار هەڵگەڕاوەکەی دەکردە سەرە قژ درێژە ڕۆن لێدراوەکەی. وەك دەیانگوت بەختی زۆر بوو. ئێمە، کوڕو کاڵانی «ڤیلا» هەمیشە لاسایی هەڵسوکەوتو ڕەفتارەکانی ئەومان دەکردەوە، تەنانەت تف ڕۆکردنەکانیشی، بەڵام شەوێکیان تێگەیشتم کە مەعدەنی ڕاستەقینەی ئەو چییە.

چیرۆکی ئەو شەوە سەیرە، دەتەوێت باوەڕ بکە، ناشتەوێت مەیکە، بە گالیسکەیەکی ڕەوڕەوە سوور دەستی پێ کرد، کە تا بنمیچەکەی پڕ بوو لە مرۆڤ و یەکەو ڕاست لە ناوەڕاستی ڕێگا خۆڵەکەی نێوان کورەخانەکانو زەوییە بەیارەکاندا دەرکەوت.

دوو پیاوی ڕەشپۆش بە گیتار ئاوازێکیان دەژەنیو دەنگو هەرایەکی زۆریان بەرپاکردبوو. یەکێکی تریشیان کە لە سەرەوە دانیشتبوو قامچییەکەی دەستی هەواڵەی ئەو سەگانە دەکرد کە لەنێوان قاچو دەستی ئەسپەکاندا بەیەکدا دەهاتن. لەو ناوەڕاستەدا پیاوێکی کۆڵوانە بەشان بە ئارامی دانیشتبوو. ئەمە «کۆرالێرۆ»ی بەناوبانگ بوو کە بۆ کوشتو کوشتار هاتبوو. شەوێکی فێنكو خۆش بوو. دوان لەوان بە کڵاوە قەدکراو و سواری ئەسپەوە وەك ئەوەی لە کاروانی ئاهەنگو شادیی خواروی شاردا بن، بە ڕیز دەڕۆیشتن. ئەمە ڕوداوی ژمارە یەك بوو، ئێمە هەر زوو زانیمان کە ڕوداوی دیکەش بەڕێوەیە. تاقمەکەی ئێمە زوو بۆ هۆڵی سەماکەی (خولیا) هاتبوون. خولیا شوێنێکی گەورەو پەرشو بڵاوی هەبوو کە لە لەوحە ئاسن دروست کرابوو. ئەم هۆڵی سەمایە دەکەوتە نێوان

جادەی «گائونا «و ڕوبارەکەوەو دەتتوانی بەهۆی
ئەو گڵۆپە سـوورەی کە لە بەردەمیدا هەڵواسـرابوو
و دەنگەدەنگە زۆرەکەیەوە لە دوورەوە بیناسـیتەوە.
«خولیا» ئەگەرچی خوێنی سوورپێستانەیشـی تیابوو
کەچی زۆر وریاو کارزان بوو. هەمیشە مۆسیقا ئامادە
بوو، شەرابی چاکو هاوسـەمای بە تاقەتو سوکو
بێبەهای هەبوو. «لوخانرا»، دەنکەکەی «ڕۆزندۆ»، لە
هەموو ژنەکانی ئەوێ جوانتر بوو. ئەو ئێستا مردووەو
دەبێت دانی پێدا بنێم کە ساڵانێکە بیری لێناکەمەوە،
بەڵام دەبوو ئەوت ئەو کاتانەو بەو چاوانەیەوە بدیایە
کە خەوی لە پیاو دەزڕاند. خەوی لە کەللەی مرۆڤ
دەپەڕاند.

ئارەقی قامیشی شـەکر، سەما، ژن، ئەو جوێنو
قسە ناشرینانەی لە دەمی ڕۆزندۆوە دەهاتنە دەرێ، ئەو
دەستەی کە بە پشتی یەکەیەکەی ئێمەیدا دەکێشا،
هەوڵمدا لە جیهانی هاوڕێیەتیدا بەهەند وەرینەگرم،
مەسـەلەکە ئەوە بوو کە من زۆر کەیفخۆش بووم،
بەختیش یارم بوو. سـەرنجی کچێکم بۆ لای خۆم
ڕاکێشـابوو کە بۆ هەموو شوێنێك بەدوامدا دەهات
و لەپێشەوە پێشبینی جوڵەو بزاوتی سەماکەی دەکرد.
تانگۆکە سـیحری لـێ کرد بوویـن، دەیهێناینو
دەیبردین، پڕی دەکردین لە هێزو وزە، دەیبردین بەرەو
کەنار و پاشان بەرەو ناوەڕاست دەیکێشاینەوە. پیاوان
نوقمی سەما بوون، دەتوت خەون دەبینن، لەپڕێکدا
سەرنجم دا دەنگی مۆسیقاکە بەرزتر بۆوە، هۆکەی
ئەوە بوو لە دەنگی گیتارەکەی ئەو دوو کەسەی لە
ناو گالیسکەکەدا بوون و نزیکتر دەبوونەوە ـ تێکەڵ
بوو بوو. پاشان با دەنگی ئەوانی بەرەو لاکەی تر بردو
هەستو نەستم گەڕایەوە بۆ خۆمو هاوڕێ کچەکەمو
قسەکانمان لە کاتی سەماکەدا. پاش ماوەیەك دەنگی
هاتو هوریـاو لەدەرگادانێکی گەوجانە هات. لەپڕ
هەموو بێدەنگ بوون. بە توندی پاڵ بە دەرگاکەوە
نرا، کابرا هاتـە ژورەوە، وام هاتە پێش چاو کە لە
دەنگەکەی بچێت.

ئێمە هێشتا ئەومان بە «فرانسیسکۆ ڕیێل» نەدەناسی،
پیاوێکـی باڵابەرزی چوارشـانە بوو کـە هەموو
جلەکانی ڕەش بوو، جگە لە ملپێچێك بە ڕەنگی لمو
چەویلەکانی کەناری دەریا، کە دابووی بە شـانیدا.
بیرم یەت دەموچاوی وەك سوورپێسـتەکان لاوازو
ڕەقەڵە بوو.

تاکی دەرگاکە، لەکاتـی کردنەوەیدا بەر من
کەوت. بێ ئەوەی بزانم چی دەکەم خۆم دا بەسەریدا.
بەدەستی چەپ مشتەکۆڵەیەکم کێشا بە دەموچاویدا
و بە دەستی ڕاستیش کێردێکی تیژم کە هەمیشە لە
ژێر باخەڵکی چەپـی هێلەکەکەمەوە بوو دەرمهێنا.
پەلامارەکەی من زوو وەلا نرا، کابرا دەسـتی هێنایە
پێشێ تا خۆی لەسەر پێ ڕاوەستێنێتو پاشان بە پاڵێك
منی لە سەر ڕێی خۆی خستە لاوەو من بە پشتا کەوتم،
هەروا کە دەستم لە ژێر چاکەتەکەمەوە لەسەر چەکە
بێ کەڵکەکەم بوو، ڕیسوا بوومو ئەو وازی لێهێنامو
وەك ئەوەی هیچ ڕوی نەدابێت بەرەو پێشەوە ڕۆشت.
بەخۆشییەوە بەرەو پێشەوە دەڕۆشت، سەرو گەردنی
لەوانـە بەرزتر بوو کە بەلایاندا تێدەپەڕی و دەتوت
نایانبینێت. دەسـتەی یەکەم ـئیتالییە ترسنۆکەکان ـ
وەك باوەشـێن کرانەوەو ڕێگەیان کردەوە، لەترسدا
وشك بوو بوون. لە دەسـتەی دووەمدا «قژ سوور»

چاوەڕوانی بوو، بەرلەوەی دەســـتی کابرای غەریبە
بەر شانی بکەوێت، قژ سوور بە نوکە چەقۆیەك کە
ئامادەی کردبوو لایەکی دەموچـــاوی ئەوی بڕی.
کاتێك ئەوانی دیکە ئەمەیان بینی هەموو هێرشـــیان
بۆ هێنا. لەم سەر بۆ ئەو سەر وەك قوربانییەك کەوتنە
گیانی، بۆکسیان ئەهاویشتو فیکەیان لێ ئەداو تفیان
دەکرد. ســـەرەتا بۆکسیان دەهاویشت، بەڵام کاتێك
بینیان چیـــدی وەڵام ناداتەوە کەوتنـــە ئەوەی کە
بەئەســـپایی دەستی بۆ بەرن یان بە ملپێچ لێی بدەنو
گاڵتەی پێ بکەن، بەڵام ئەو هیچ بایەخی بەم شتانە
نەدەدا. هەموو هێزی خۆی بۆ «ڕۆزندۆ» هەڵگرتبوو
کە لە تەواوی ئەم ماوەیـــەدا پاڵی دابوو بە دیواری
دواوەو نەجوڵابوو، بە شڵەژاوی دوکەڵی جگەرەکەی
بە با دەدا، وەك ئەوەی ئەو شتەی کە دواتر بینیمان،
ئەو لە پێشەوە زانیبێتی. «قەساب» بێدەنگو تێهەڵدراو
و تفبارانکـــراو، بەنێو خەڵکەکەدا لێبڕاو و خوێناوی
پشـــت لە دەنگەدەنگی خەڵکە ئاژاوەگێڕەکە بەرەو
ڕۆزندۆ ڕێگەی خۆی دەکردەوە. ڕۆیشت تا گەیشتە
بـــەردەم (ڕۆزندۆ). ئەوکات چاوانی تێبڕی، بە قۆڵی
چاکەتەکەی دەموچاوی خۆی پاککردەوەو وتی:
«من فرانسیســـکۆ ڕیڵی خەڵکـــی نۆرتەم، ئەو
کەسەی کە بە «قەساب» ناسراوە. لێگەڕام ئەم خوێڕی
و هیـــچو پوچانە لێمدەن، چونکە من بەدوای پیاودا
دەگەڕام. بیســـتوومە کە یەکێك لەنێو ئەم خەڵکەدا
هەیە کە بە (چەقۆ) بەناوبانگە، دەڵێن چەقۆوەشێنێکی
زۆر باشە. گەرەکمە بیبینم. دەمەوێت لێیەوە شت فێر
ببم. من خۆم هیچ نیم. بەڵام دەمەوێت لەوەوە فێر ببم
کە پیاوی ئازاو بەجەرگ چۆن چۆنی دەجەنگێت.»
تەواوی ئەو ماوەیەی قســـەی دەکرد چاوی لە
(ڕۆزندۆ) هەڵنەدەگرت. کێردێکی گەورە لە دەستیدا
دەبریسکایەوە. دیارە ســـەرەتا لە قۆڵی کراسەکەیدا
شـــاردبوویەوە. ئەو پیاوانەی بەمشت لێیان دابوو لە
کەنارەوە ڕاوەستان، هەموو بێدەنگ بووینو چاومان
بڕیبووە ئـــەو دوو پیاوە، تەنانەت ئـــەو کوێرە دوو
ڕەگەی کە ڤیۆلۆنی دەژنی، لێوە ئەستوورەکانی بەرەو
لای ئەوان وەرسوڕاندبوو.
ئا لەو کاتەدا دەنگەدەنگێکمان لە دواوە بیست.
شەش حەوت پیاوێ بوون، کە لە دەمی دەرگاکەدا
ڕاوەســـتا بوون. دیارە لە دارو دەستەی فرانسیسکۆ
ڕیڵ بوون. پیرترینیان کە سمێڵێکی ماشو برنجیو
دەموچاوێکی خۆربردووی هەبوو هاتە ژورەوە، بەڵام
ڕاوەســـتا، ئەو هەموو ژنو ڕوناکییە گێژی کردبوو،
وەك نیشانەی ڕێز کڵاوەکەی لەسەری بەرز کردەوە،
ئەوانی دیکەش لە هەمان شوێندا ڕاوەستان. حازر و
ئامادە تا ئەگەر شەڕ بوو بێنە ژوورەوەو دەستی خۆیان
بوەشێنن.
نازانـــم (ڕۆزندۆ) چ دەردێکـــی بوو کە پیاوانە
قۆڵـــی لـــێ هەڵنەدەماڵی تا وەڵامی ئەم فشـــەکەرە
بداتەوە. بێدەنگ دانیشـــتبوو و چاوانی هەڵنەدەبڕی.
نازانم جگەرەکەی تف کردەوە یان لە دەمی کەوتە
خوارەوە. سەرئەنجام بە منگەمنگ چەند وشەیەکی
وت، بەڵام ئەوەندە لەسەرخۆ وتنی کە ئێمە لەوسەری

هۆڵەکەوە نەمانتوانی گوێمان لێ بێت. «فرانسیسکۆ ڕێڵ» جارێکی دیکە داواکەی دوبارە کردەوە، پیاوم دەوێ ئەوە عەرزو ئەوە گەز، بەڵام «ڕۆزندۆ» دیسان هیچی نـەوت. ئەو جا یەکێك لە غەریبەکان کە لە هەموویان گەنجتر بوو فیکەیەکـی لێدا. «لوخانرا» لەڕوی نەفرەتەوە تەماشـایەکی کابرای کرد، پاشان بەقژەکەیەوە کە بەسەر شـانیدا بەریدابووەوە بەنێو پیاو و کچەکاندا ڕێگەی خۆی کردەوە. بەرەو لای ڕۆزندۆ ڕۆیشـتو دەستی برد لە ژێر چاکەتەکەی ڕۆزندۆدا چەقۆیەکی ڕوتی دەرهێناو دای پێی و وتی:

—«ڕۆزندۆ، پێموایە ئەمە بەکەڵکت بێت.

لە نزیك بنمیچی هۆڵەکـە پەنجەرەیەکی درێژ هەبوو کە بەسـەر ڕوبارەکـەدا دەیڕوانی. ڕۆزندۆ چەقۆکـەی وەرگرتو تەماشـایەکی کردو وەك ئەوەی یەکەم جاری بێت بیبینێت لەپڕ گەڕایە دواوەو چەقۆکەی لە پەنجەرەکەوە توڕ هەڵدا تا بکەوێتە ناو ڕوبارەکەوە. من موچوڕکم پیا هات.

کابرای غەریبە دەستی بەرز کردەوە لێی بدات، وتی: «تەنها لەبەر یەك شـت ناتکەم بە دوولەتەوە، چونکـە بەو دیمەنـەت دڵم تێکهەڵدێـت.» بەڵام «لوخانرا» کابرای گرتو قۆڵو بازوی لە ملی ئاڵاندو بە نیگا تایبەتییەکەی خۆیەوە تەماشـای کردو وتی: «واز لەم خوێڕیـە بهێنە کە لافی پیاوبوونی لێدەدا.» بۆ ساتێك فرانسیسـکۆ دوودڵ بوو، پاشان کچەی لە باوەش گرت، وەك ئەوەی کە هەمیشـە هەر لە باوەشی گرتووە. بە ژەنیارەکانی وت بژەنن، فەرمانی بە ئێمەش دا سەما بکەین. مۆسیقا، لەمپەڕ بۆ ئەوپەڕ، کۆڕەکەی گەرم کردبوو. «ڕێڵ» زۆر لەسەرخۆ و بێ ئەو توندوتیژییەی کە لێی چاوەڕوان دەکرا سەمای دەکرد. کاتێك گەیشتە دەرگاکە هاواری کرد: «بچنە لاوە، کوڕینە ئێستا لوخانرا بەتەنها هی منە.» ڕومەتی نابوو بە ڕومەتییەوەو وەك ئەوەی سـەمای تانگۆکە ئەوانـی بۆ دەرەوە ڕاو نابێـت، لە دەرگاکە چوونە دەرەوە.

بێگومان دەموچاوی من لەشەرمدا کەمێك سوور هەڵگەڕابوو، دوو سـێ سووڕ لەگەڵ ژنێکدا سەمام کرد، پاشان وازم لێ هێنا و وتم هەوا گەرمەو دەنگە دەنگیش زۆرە، ویستم بەرەو لای دەرگاکە بمبات. لە دەرەوە شـەو جوانو دڵڕفێن بوو- بەڵام بۆ کێ؟ لە تەنیشت جادەکە گالیسکەیەك وەستا بوو، جوتێك گیتاریان بەقنجی لەسەر کورسییەکە دانابوو کە وەکو بنیایـەم دەهاتنە پێش چاو. لە بینینی گیتارەکان زۆر ناڕەحەت بـووم، ئەوان ئەم گیتارانەیـان لەدەرەوە دانابوو وەکو ئەوەی ئێمە شایسـتەی ئەوە نەبین کە بۆمـان بژەنن. بیرکردنەوە لەوەی کە ئێمە مشـتێك چەورەو خوێڕین، گڕم گرت. گوڵە مێخەکەکەم لە پشت گوێم دەرکێشایە دەرێو فڕێمدایە چاڵێکەوە. ماوەیـەك چاوم تێبڕی تا بیر لە هیچی تر نەکەمەوە. حەزم دەکرد ڕۆژ بێتەوە، حەزم دەکرد ئەو شـەوە کۆتایی بهاتبایە. پاشـان کەسێك بە ئانیشك تێوەی ژەندم و لەو دۆخە کێشـامییە دەرەوە. «ڕۆزندۆ» بوو کە بەتەنها و بێ سرتە لەوێ ڕایدەکرد.

بە بۆڵە بۆڵەوە پێی وتم: «کوڕە تۆ، هەمیشـە لە ناوەڕاسـتی ڕێگەدا ڕادەوەستیت.» نازانم دەیویست داخی دڵی خۆی بە من بڕێژێت یان شـتێکی دیکە بوو. بەرەو تاریکی لێواری ڕوبارەکە ڕایکردو ڕۆشت.

لەوە بەدوا ئیدی ئەوم نەبینیوەتەوە.

وەستامو تەماشایەکی هەموو ئەو شتانەم کرد کە تەمەنێکە دیوومن: ئاسمان کە تا چاو بڕیکات کشابوو، ڕوباری کەللە شەق کە هاژەی دەهات، ئەسپێك کە نووستبوو، جادەو بانی چۆڵو هۆڵو کورەخانەکان. بیرم کردەوە کە لە نێو ئەم هەموو پیسیو گیاکەڵانەدا خۆیشم لە گیاکەڵەیەك زیاتر نیم. لەم خاکە هەر ئەم تۆزە هەڵدەستێ. دنیایەك لافو گەزافو ئازایەتیو بەجەرگی کەچی هیچ. پاشان بیرم کردەوە ئەم بیرکردنەوانە گاڵتەجاڕانەن. چەند ناوچەکە خراپتر بێت بەجەرگیو ئازایەتیی پیاو دەبێت زیاتر بێت.

لە هۆڵەکە، سەما درێژەی هەبوو و لە دوورەوە بۆنی لاولاو دەهات. شەو لە ڕادەبەدەر جوان بوو. ئەوەندە ئەستێرە بەسەر یەکدا کەڵەکە بوو بوون کە ئەگەر تەماشایانت بکردایە گێژ دەبوویت. ویستم قەناعەت بە خۆم بکەم کە تەواوی ئەم ڕوداوە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نیە، بەڵام نەمتوانی ترسەکەی ڕۆزیندۆو بوێری و ئازایەتی ئەو غەریبەیە لە مێشکم دەربکەم.

ڕیڵ، توانیبووی تەنانەت بۆ ئەو شەوەیش ژنێك مسۆگەر بکات، بۆ ئەو شەوەو زۆر شەوی دیکەش، ڕەنگە هەر بەردەوامیش بێت، لەبەرئەوەی «لوخانرا» بەڕاستی زۆر کەیفخۆش بوو. بەس خوا دەیزانی کە ئەو شەوە ئەوانە بە چ ڕێگەیەکدا ڕۆشتبوون. نەیاندەتوانی زۆر دوور بکەنەوە. ڕەنگە ئێستا هەردوکیان لەناو جۆگەلەیەکدا خەریك بن.

دواجار کە گەڕامەوە، سەماکە بە هەمان دەنگە دەنگەوە بەردەوام بوو. وەکو ئەوەی کە هیچ ڕوینەدابێت. خۆم کرد بەناو خەڵکەکەدا، تێگەیشتم کە هەندێ لە تاقمەکەی ئێمە ڕۆشتوون. دەستەکەی نۆرتە خەریك بوون لەگەڵ کچەکاندا سەمای تانگۆیان دەکرد. هیچ گوشارو هێرشێك لەگۆڕێدا نەبوو و هەموو بەئەدەبو بەڕێز بوون. مۆسیقاکە خەواڵواوی بوو، ئەو کچانەی کە لەگەڵ دەستەکەی نۆرتە سەمایان دەکرد، بە زەحمەت دەمیان دەکردەوە. من چاوەڕوانی شتێك بووم بەڵام ئەوە نا کە ڕویدا.

لە دەرەوە دەنگی گریانی ژنێك هات، پاشان دەنگێك کە ئێستا ئیدی هەموومان دەمانناسییەوە، بەڵام ئەم دەنگە زۆر ئارام بوو، ئەوەندە ئارام کە دەکرا هی هەر کەسێك بێت.

وتی: «بڕۆ ژوورەوە قەحبە!» پاشان دەنگی گریانی ژنەکە هات. وەك ئەوەی خاوەنی دەنگەکە وەخت بێت ئارامیی خۆی لەدەست بدات.

«بەتۆم وت دەرگاکە بکەرەوە، بیکەرەوە، قەحبە بیکەرەوە.»

بەم قسەیە دەرگاکە کرایەوەو لوخانرا بەتەنها هاتە ژوورەوە. وەکو ئەوەی کە کەسێك پاڵی پێوە نابێت. کابرای قژ سور وتی: بێگومان ڕۆحی مردوویەك شوێنی کەوتووە.»

—«ڕۆحی مردوویەك نا هاوڕێ، خودی مردوویەك» ئەمە دەنگی «ڕیڵ» بوو، سەروچاوی لە سەروچاوی مەستەکان دەچوو، تلاوتل لەو ڕێگەیەوە کە جاری

پێشوو هەمووان بۆمان کردەوە دوو سێ هەنگاوێك هاتە پێشـــەوە. درێژ بوو و جێیەکی نەدەبینی. پاشان لەپڕ وەك کلۆرەدارێك کەوتە ســـەر زەوی. یەکێك لەو پیاوانەی کە لەگەڵ ئەو هاتبوو خســـتیە ســـەر پشتو کۆڵوانەکەی قەد کردو خستییە ژێر سەری. ئەوکات خوێن فوارەی بەستو برینێکی گەورەمان لەسەر ســـنگی بینی. خوێن بڵاودەبووەوەو ڕەنگی هێلەکەکەی تۆختر دەکرد. من پێشـــتر ئەم هێلەکەم نەبینیبوو لەبەرئەوەی لەژێر ملپێچەکەیدا شاردرابووەوە. بۆ ئەوەی بیهێننەوە هۆش خۆی، ژنێك بادەی هێناو هەندێکیش پەڕۆ کۆنیان سوتاند. حاڵی ئەو جۆرێك نەبوو کە بتوانێت باسی ڕوداوەکە بکات. «لوخانرا» بە دەمی داچەقیوەوە تەماشای ئەوی دەکردو دەستەکانی بە هەر دوو لایدا شۆڕ بووبوونەوە. هەموو گێژو وێژ بوون. سەرئەنجام «لوخانرا» توانی قسە بکات. وتی کە پێکەوە چوو بوون بۆ کێڵگەیەك و کەسێك کە ئەو نەیدەناسی پەیدابووەو دەمودەست هاتبووە دەستو بەم جۆرە چەقۆی لەو دابوو. سوێندی خوارد کە ئەو پیاوەی نەدەناسی، هێندە نەبێت کە دەیزانی «ڕۆزندۆ» نەبووە. بەڵام کێ باوەڕی بە قسەی ئەو دەکرد؟

ئەو پیاوەی کـــە لەبەر پێی ئێمەدا بوو، خەریك بـــوو دەمرد. پێموابوو ئەو کەســـەی بەو شـــێوەیە زامداری کردووە کەسێکی زۆر بەتواناو بەهێز بووەو کارەکەی بـــاش ئەنجام داوە. کاتێـــك کە دوبارە بێهۆش بوو«خولیا» چا ماتەکەی دەم کردو فنجانەکان سوڕان، بەر لەوەی ئەو بمرێت نۆرەی فنجانە ماتەکە گەیشتە ســـەر من. بەر لەوەی دوا هەناسەی بدات بە دەنگێکی لەســـەرخۆ وتی: «دەموچاوم داپۆشن.»

تەنها شتێك کە لێی مابووەوە غرور و لوتبەرزییەکەی بوو. نەیدەویست ئێمە تەماشـــەوانی ڕەنجو ئازاری مردنەکەی بین. کەســـێك کڵاوێکی ڕەشی بەرزی لەسەر دەموچاوی داناو بەم شێوەیە ئەو لە ژێر تاجە بەرزە ڕەشەکەیدا بێدەنگ مرد. تەنها کاتێك کە سنگە پانەکەی لە جوڵە کەوت زاتیان کرد کڵاوەکە لەسەر دەموچاوی لابەرن. لاشەی ژاکاوی مردوانی هەبوو. ئەو یەکێك بوو لەو ئازاترین پیاوانەی کە لەو ڕۆژانەدا لەنێوان «باتریا»و «سور»دا پەیدا دەبوون. کاتێك بینیم مردووەو ئیدی ناتوانێت قسە بکات، چیدی ڕقم لێی نەدەبووەوە.

یەکێك لە کچەکان لە نێـــو خەڵکەکەوە وتی: «مرۆڤ دەبێت تەنها زیندوو بێت تا بمرێت.» یەکێکی دیکەش بەهەمان ئاوازەوە وتی: «پیاوێك و ئەم هەموو غرورە، ئێســـتا تەنها بۆ مێشو مەگەس کۆکردنەوە باشە.»

ئەو پیاوانەی کە لە نۆرتـــەوە هاتبوون، هێواش هێواش لە نێوان خۆیاندا دەستیان کرد بە قسەکردن. پاشان دوانیان پێکەوە وتیان: «ئەم ژنە ئەوی کوشتووە.» یەکێکی دیکەیان بە دەنگی بەرز «لوخانرا»ی تۆمەتبار کردو ئەوانی تر لـــە دەوری کۆبوونەوە. ئەو کات مـــن بیرم چوو کە دەبێت ئیحتیاتی خۆم بخەم، بۆیە وەك بروســـکە پەڕیمە ناویانەوە. نازانم چۆن بوو کە چەقۆکەمم دەرنەهێنا. زۆربەیان ـڕەنگە هەمووشیانـ تەماشـــای منیان دەکرد، بەبێحاڵییەوە وتم: «تەماشای دەســـتی ئەم ژنە. چۆن تواناو بوێریی ئەوەی هەیە بە چەقۆ پیاوێك بکوژێت؟»

پاشـــان زۆر خوێنســـاردانە وتم: «کێ دەیتوانی

بیر لەوە بکاتەوە کــە ئەم پیاوە کە -وەك دەڵێن- لە ناوچەکەی خۆی بکـوژو ببڕێکی بەناوبانگ بووە، سەرئەنجام ئاقیبەتی ئەمە بێت؟ ئەویش لە شوێنێکی بێزارکەری وەك ئێرەدا کە هیچ شتێکی وای تیا نییە، تا کەسـێکی غەریبە بۆ خۆشـگوزەرانی بێتە ئێرەو ڕیسوایی بخاتە لاوە؟»

کەس بۆ شەڕکردن نەهاتە مەیدان.

ڕێك لەو کاتەدا، لــە بێدەنگییەکی مەرگباردا، دەنگی پێی چەند ئەسپێك هات. جەندرمەکان بوون. هەموو ئەوانەی لەوێ بــوون، لەبەر هەزارو یەك هۆ و بەڵگە نەیاندەویســت سەر و کاریان بکەوێتە لای جەندرمەکان. باشــترین کار ئەوە بوو کە تەرمەکە بخەنە نــاو ڕووبارەکەوە. ئەو پەنجەرە گەورەیەت بیر ماوە کە کێردەکەی ڕۆزنـــدۆی لێوە فڕێ درایە ناو ڕووبارەکەوە؟ کابرای ڕەشپۆشیش هەر لەوێوە هەڵدرایە ناو ڕووبارەکەوە. دەســتەیەك لە پیاوەکان ئەویان بەرز کــردەوە، تەواوی ئــەو پــارەو وردە دراوانەی نێو گیرفانیــان دەرهێناو تەنانەت یەکێکیـــان بۆ ئەوەی مســتیلەکەی بدزێت پەنجەی بڕییـــەوە. ئەوان باش سوودیان لە هەلەکە وەرگرت. ئەو بەڕێزانە غیرەتو جورئەتیان هەر ئەوەندە بوو کە مردوویەکی داماوی هیچ لە دەست نەهاتوو ڕوتکەنەوە کە سەردەمێك لە پیاوێك زیاتر بوو. بەرزیان کردەوەو بۆ دەرەوە توڕیان هەڵدا، ئاوی تیــژڕەوی ڕووبارەکە بردی. بێگومان بۆ ئەوەی لە سەر ئاوەکە نەمێنێتەوە ورگیان هەڵدڕیبوو، من نەمویست تەماشـــا بکەم. کابرای سمێڵ ماشو برنجی چاوی لە ســەر من هەڵنەدەگرت، «لوخانرا» هەلەکەی قۆستەوەو چووە دەرەوە.

کاتێــك جەندرمــەکان گەیشــتن، ســەما بە دەنگەدەنگێکــی زۆرەوە بەردەوام بــوو. ڤیۆلۆنژەنە کوێرەکــە وەها کەوانەکەی بــە تەلەکاندا دەهێنا و دەنگێکیان لێ دەردەهات کە تا ئێستا گوێم لێ نەبووە. لە دەرەوە خەریك بوو ئاسمان ڕوناك دەبۆوە. ستونی پەرژینی کێڵگەیەك لەو نزیکانە دەهاتە بەر چاو، بەڵام هێشتا تەلی نێوان ستوونەکان نەدەبینرا.

هێورو لەسەرخۆ دەگەڕامەوە کوختەکەم. مۆمێك لەپەنجەرەکەدا دەسووتا لەپڕ کوژایەوە. کاتێك ئەمەم بینی کەوتمە پەلەپەل. ئەوسا بۆرخیس، دەستم کرد بە ناو هێلەکەکەمدا -لێرە لە ژێر باخەڵی چەپمدا کە هەمیشە چەقۆیەکی تیادا هەڵدەگرم- دوبارە چەقۆکەم دەرهێنا. لەسەرخۆ دەمەکەیم سوڕاند. لە چەقۆیەکی تازە دەچوو، بێگونــاە دەهاتە بەر چاو و بچوکترین شوێنەواری خوێنی پێوە نەبوو.

**سەرچاوە:**

خورخە لویس بورخیـــس، هزار توهای بورخس، ترجمه احمد میر علائی، تهران، نشـــر کتاب زمان، چاپ دوم، ۱۳۸۰ هجری شمسی.

# ڕێز نواندن

نووسینی: نادین گۆردمایر
و. لە فارسییەوە: جەبار سابیر

لەبەرئەوەی قسە ناکەم. لێوەکانم بخوێنەرەوە. تۆ لەوێ دادەنیشی و کاتێك شەمەندەفەرەکە لە دوورەوە بە تەقوتۆق دەردەکەوێت، دەنووشتێیتەوەو سەرت دەهێنیە پێشێ، تا باشتر بژنەوی. بەڵام من قسە ناکەم.

ئەگەر توانیم بیاندۆزمەوە، نیوەی باقی پارەکە کە هەقدەستی ئەنجامدانی کارەکەیەو دەبوو وەریبگرم، وەریدەگرم، بەڵام ئەوان ڕۆیشتوون. نازانم کوێیان بۆ بگەڕێم. وابزانم ئیتر لێرە نین، بێگومان تێیان تەقاندووەو هەڵاتوون بۆ دەرەوە، بۆ وڵاتێکی تر، بەردەوام جێگە دەگۆڕن و لەبەرئەمەیشە کە خەڵکانی وەك من دەدۆزنەوە. ئێمە نیشتمانمان جێدەهێڵین، چونکە دەوڵەتەکان سەرەونگوم دەبن و ئێمە سەربازی لایەنی بەرامبەرین، نەکارێك، نە نان و ڕۆنێك، چما تۆوەکە هەمووی کوللە خواردویتی، کاتێك لە سنوور تێدەپەڕین، دەکەوینە سنوور و حەسارێکی ترەوەو دواتریش یەکێکی تریش. دواجار بەرەو کوێ ئەچین؟ نازانین، لە کوێ وەمێنین. جێگایەك کە ئێمە ڕەوانەی

جێگایەکی تـــر نەکات، لـــە ئۆردوگایەکەوە بۆ ئۆردوگایەکی تر. لە وڵاتێك کە ناســـنامەیەکت دەست ناکەوێ.

زارم بەستراوە.

دەمان دۆزنـــەوە. لە یەکێ لەم جێگایانە منیان دۆزییەوەو قوتاریان کردم. هەر کارێکیان لە دەســـت بێت، رەتم دەکەنەوە، لێرە ناسنامە دەدەن و ناوێکم لێدەنێن. ناوی خۆم بە خاك دەســـپێرم، کەس ناتوانێ لە زمانمی دەربکێشێ. بە منیان وت چییان دەوێت و نیوەی پارەکەیان لە سەرەتاوە دا. باش دەخۆم، جلوبەرگی جوان لەبەر دەکەم و لە ئوتێلێك دەمێنمەوە خەڵکەکە بەر لە هاتنە ژوورەوە بۆ ڕێستوڕانتە ســـیانەییەکەی لیستی خواردنەکان دەخوێننەوەو پاشـــان بڕیار دەدەن بچن بۆ کامیان. شـــامپۆی بەلاش لە گەرماوەکان دادەنێن و قاسە تایبەتەکانیان کلیلی تایبەتی هەیە کە لە بری پارە لیکۆری لێ دادەنێن.

هەموو شـــتێکم بۆ دابیـــن کراوە. دوای چەندیـــن مانـــگ چاودێری و شـــوێن کەوتن، دەیانزانـــی دەچێـــت بۆ کوێ و لـــە کوێ و چ کاتژمێـــرێ، لەگەڵ ئـــەوەی مرۆڤێکی کەتە بوو، بێ پاســـەوانانی دەوڵەتی لەگـــەڵ ژنەکەی بەملا و ئەولادا دەڕۆیشـــت، ئاخر حەزی دەکرد وەك خەڵکی ئاســـایی بەرچاو بکەوێـــت، یا مرۆڤێکی ئاسایی بێت. دەیانزانی کە نەشیاوەو ئەمەیش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پارە بدەن بە من تا کارێك بکەم، کە دەبێ ئەنجامی بدەم.

مـــن کەســـێك نیم، هیـــچ وڵاتێك منی لە ئامار و ســـەرژمێریدا تۆمار نەکردووە، ناوێك کە لە منیان نـــاوە، بوونی دەرەکی نییە و کارێك کە ئەنجام درا، کەســـێك ئەنجامـــی نەدا. لەگەڵ ژنەکەی دەچووە کەیف و سەفا، دەستی دەگرت و پێکەوە پیاسەیان دەکرد، دەچوونە ڕێستوڕانتێك کە دەرگای شووشـــەیی دوو دیواری هەبوو، بۆ

پاراستنی گەرماو سەرماکەی، هەموو هەفتەیەك دەچوون، دواتریش پێیان وتبووم دەچێتەوە ماڵێ، بەڵام ئەچوون بۆ سینەما، ئارامم گرت. لە کافێکە پەرداخێك خواردنەوەی سووکم بە دەستەوە بوو، هەر ئەمەو گەڕامەوە.

کە خەڵکەکە لە سینەما دەهاتنە دەرێ، پیشانیان نەدا ئەویان ناسیوە، چونکە خەڵکی ئێرە حەزدەکەن ڕێبەرەکانیان وەك خەڵکی ئاسایی بن. دەستی ژنەکەی گرت، ڕێك وەك هاوشارییە ئاساییەکان و بەرەو سەر شەقامەکە ڕۆیشت، هەمان جێگایەك کە دەرگای چوونە ژوورەوەی وێستگەی میترۆکەی لێیە، وەختێك لە دواوە وەستا، تا یەکەمجار ژنەکەی تێپەڕێت، کاری خۆم کرد. بەو جۆرەی کە داوایان لێکردبووم و پارەکەیان پێدابووم، کارەکەم کرد، چاك مشتم لێ گرتبوو، تاقیان کردبوومەوە، ڕێك نام بە پشتە سەرییەوە. گاڤێك کەوت و ئاوڕم دایەوە هەڵبێم، یەکێکی تریشم پێوەنا، پارەکەیان دابوو، لێمدا بۆ ئەوەی کارەکە تەواو بکەم.

ژنەکەی هەڵەی کرد و لە بری ئەوەی ئاوڕبداتەوەو سەر هەڵبڕێ و بزانێ کێ لێیداوە، لە تەنیشتییەوە کەوتە سەر ئەژنۆ. تەنیا قسەیەك کە بە پۆلیس و چاپەمەنییەکانی وت، ئەمە بوو کە تەنیا پشتە سەری پیاوێکی بینیوە، جلەکانی تۆخ بووە، قەمسەڵەیەکی چەرمی لەبەردابووە، بە پلیکانەکاندا بەرەو ژوور بۆتەوە تا گەیشتۆتە شەقامە لاوەکیەکە. ئەم شارە بە تایبەت بە کۆڵانی تەنگ و باریك و سەرەوژووری ناسراوە. سیمای منی نەبینی. ئێستا چەند ساڵێك رابردووە، لە ڕۆژنامەدا دەیخوێنمەوە، بە هەمووان دەڵێ کە سیمای یارۆی نەبینیوە، سیمای کەسێك کە ئەم کارەی کردووە، خۆزێ چرکەیەك زووتر سەری هەڵدەبڕی. ئەوسا منیان گرتبوو، ناکەسێك کە ئەم کارەی کردبوو، دەبوو بە من. هەموو ماوەکە بیر لە پشتە سەرم و کڵاوە ڕەشەکەم دەکاتەوە، ڕاستییەکەی ڕەشیش نەبوو، کڵاوێکی چوار خانەی سەوزی کاڵ بوو بە ڕێڕێی قاوەیی، لەو کڵاوە گرانانەی کە بە هەمان ئەو پارەیە کڕیبووم، دوای کارەکە، بەردێکم تێکرد و فڕیمدایە جۆگەکەوە. بیر لە ملم دەکاتەوە، پارچەیەك کە لە نێوان کڵاو و یەخەی قەمسەڵە چەرمەکەوە دیار بوو. نەمدەتوانی قەمسەڵەکە فڕێدەمە جۆگەکەوە، قەمسەڵەکەم بۆیاخ کردبوو. بیر لە بریقەی قەمسەڵە چەرمییەکەم دەکاتەوە لەسەر کۆڵ و شانم، کە لە بەر ڕووناکی گڵۆپی شەقامەکەو لە سەر پلەکانەوە بریقەی دەدایەوە هەروەها بیر لە پێکانم دەکاتەوە کە بە خێرایی و چالاکی منیان لە چاوی ئەو دەشاردەوە، کە دانیشتبوو و دەیقیژاند.

پۆلیس وردەواڵە فرۆشێکی سەر کۆڵانەکەی بان قاڵدرمەکانی وێستگەی میترۆکەی دەستگیر کرد. ژنە نەیتوانی بیناسێتەوەو، چونکە دەموچاوی نەبینی بوو. باقی ئەوانەیشیان بەم شێوەیە ئازاد کرد کە لەسەر شەقام گرتبوویانن. تاوانباران، سەرپێچی کارانی پێشینەدار، ناکۆکانی سیاسیی و هەر کەسێك کە بیری لێبکەیتەوە، چارەیەك نەبوو، چونکە باڵای کابرای پیاو کوژیان نەبینی بوو. جێگەی مەترسی نەبوو. هەموو ماوەکە دەربەدەری ئەم وڵات و ئەو وڵات بووم، دەترسام، دەترسام، چوون ناسنامەم پێنەبوو، دەترسام لێکۆڵینەوەم لەگەڵ بکەن، دەترسام برسی وەمێنم، بەڵام نەۆ

ترسم نییە. هەنووکەیش ترسم نییە. قسە ناکەم.

رۆژنامـــەکان دەخوێنمەوە تا بزانم چییان نووســـیوە و چۆن رووداوەکەیان شرۆڤە کردووە. لێکۆڵینەوەکان نەگەیشـــتوونەتە ئەنجام، پۆلیس و تەواوی وڵات دەســـتیان لە دەســـتی یەك ناوە و بەردەوامی بە گەڕان و پشـــکنین دەدەن. هەندێك جار هەموو گریمانـــەکان دەخوێنمەوە، هەندێك جاریش وەك ئێستا کە لە میترۆ دانیشتووم، سەیری رۆژنامەیەك دەکەم کە بە دەســـتی یەکێکەوەیەو گریمانـــەی تازە دەخوێنمەوە. یەکێ پرســـەکەی داوەتە پاڵ ئێرانییەکان و بەهۆی دژایەتیان لەگەڵ هەندێك لـــە دەوڵەتان خەتاکەیان خســـتۆتە ملی ئەوان. جارجاریَکیش هەوڵی ئەفریقای باشوور لە تۆڵەی پاوانکارییەکانـــی ئەو وڵاتە دژی رژێمی رەگەزپەرســـت. مـــن دەزانم کێ ئـــەم کارەی کردووە، بەڵام نازانم بۆ. کاتێك نیوەی پارەکەیان دا، نەیانوت بۆچی و منیش نەمپرسی. بەم ئاسانییە. بە من چی بپرســـم کام دەوڵەت، دواجار یەکێك رادەستمان دەکات. ئەوان تەنیا کەسانێك بوون کە پێشنیاریان بۆ من کرد.

نیـــوەی پارەکەیان دا. دوای پێنج ســـاڵ شـــتێکی زۆری لێ نەماوەتەوە، مانگێکی تر دەبێتە پێنج ســـاڵ. تەواو بێ کار نیم، جاروبار کارێکی کاتیـــم هەبووە، کەس لێی نەدەپرســـیم لە کوێم هێناوە، تا کرێی خانـــوو و خەرجییەکانم دەدەم. لە گرەوی پێشبڕکێی ئەســـپ غاردانەدا بەشداریم دەکرد و یـــەك دوو جاریش وێڵی کابارێ بووم. جێگاگەلێك کـــە ئاماری مرۆڤی لێـــوەر ناگرن. ئەگـــەر باقی ئـــەو پارەیەیان دەدا، کـــە بەڵێنیان دابوو، دەمویســـت چی کارێکی پێبکەم؟ بڕۆم بۆ جێگایەکی تر؟

کاتێـــك بڕۆم بۆ وڵاتێکی تر، رێك وەك ئەوان، لە پێش ســـنوور کاغەز گەلێکی بێناسنامە رۆدەکەم کە بە منیان دا، ئەوسا قیافەم دەبینن.

قسە ناکەم.

هەقم بەسەر کەسەوە نییە. تەنانەت هەقی ژنانیشـــم نییە. جێگاگەلێك کـــە کارم لێکردووە، پێشـــنیار گەلێك کـــە بۆم دەکەن، مـــاڵ کڕین، جێگۆڕکێـــی بابەتی دزی، دابەشـــکردنی مادەی هۆشـــبەر، وەك بڵێـــی خەڵکەکەی ئێـــرە بۆنیان کردبێت کـــە بە دوای کاردا هاتووم. بەڵام نا لەم هەواڵانە نییە!

من لێرە نیم. لەم شـــارە نیم. ئەم شـــارە قەت ســـیمای منی نەبینیوە، تەنیا پشـــتە ســـەری پیاوێکیان بینیوە کە لە پلەکان ســـەرکەوتووەو لە کۆلانی تەنیشـــت میترۆکەوە ونبووبوو. دەزانم کە وتویانە تاوانبار دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی تاوانەکەی. بەڵام تەنانەت من لە پێش دەرگای میترۆکەیشەوە تێپەڕنەبـــووم. قەت لەو قاڵدرمانـــە نزیك نابمەوە. کاتێك لە دوامەوە قیژاندی، ون بووم، بۆ هەمیشە ون بووم.

کاتێك بیســـتم کە نایانەوێ لە گۆڕستان بینێژن، باوەڕم نەدەکـــرد. ئەویان لە باخچەیەکی بەردەم کەنیســـەکە ناشـــت کە نزیك وێستگەی میترۆکەیە. جێگایەکی بە رواڵەت ئاسایی، بە چەند دار و درەختێکـــی دێرینەوە کە دڵۆپە بارانی زۆر لەوانەوە دەچکایەوە سەر چەوەکانی دەورووبەری گۆڕەکە. رێك لەسەر شەقامی سەرەکی. بەردێکی هەڵکۆڵراو و لاوانەوەیەکی کورتیش بە دەوریدا، هەر ئەمە. خەڵکانێك کە بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ

دێنە دەرێ، خەڵکانێك کە بۆ شـــمەك کڕین دێن، ئەوانەی کە لە میترۆکە دێنە دەرێ، ئەوانەی کە لە سینەماکە دێنە دەرێ، لە ڕێگە چەوڕێژکراوەکەوە تێدەپەڕن و لەسەر گۆڕەکە دەوەستن، لە جێگایەك کە ئەویان لێ ناشتووە، گوڵ دادەنێن.

چوومەتە ئەوێ. بینیومە. لێی دوور ناکەومەوە. جێگایەکە وەك جێگاکانی تر. لانیکەم بۆ من وایە. هەر جارێ کە دەچمە ئەوێ، بە دوای ئەوانی تردا، ئەوانەی بۆ کەنیســـە دەچن، گەنجانێك دەبینم کە دەگرین، گوڵ دەهێنـــن، جارجارێ کاغەزگەلێك دەردەهێنن کە شـــتانێکیان لەسەر نووسیون، وەك بڵێی شیعرە. ســـەر لە دەستوخەتەکەیان دەرناکەم، دەبینم کە هێشـــتا بەدواداچوونـــەکان بەردەوامی هەیەو تـــا زەمانێك کە دەموچاوەکەیان دەســـت نەکەوتـــووە، بەردەوامی دەبێـــت، هەمان کارێك دەکەم کە ئەوانیتریش دەیکەن. باشـــترین ڕێگەیە بۆ ئەوەی لە ئاسایشـــدا بمێنم. ئەمڕۆ چەپکە گوڵە باخێکی ســـوورم کڕی، کە گەڵا پلیشاوەو دڕکە تەڕەکانیان بە لاســـیکێك پێکەوە پێچابوو. لەسەر گۆڕەکە دامنا، ڕێك لەســـەر بەردە تاشراوەکە، لە پشـــت ڕیزی پەرژینەکانـــەوە، جێگایەك کە ناوی منیش هاوڕێ لەگەڵ ئەودا نێژراوە.

**سەرچاوە:**

بیست بیست

بیست داستان از بیست نوسینده برنده جایزه نوبل ادبیات

ترجمه اسدالله امرایی

نشر گل ازین

١٣٨٩

# خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم

شیعری : کاتلین کالدما
و. لە عەرەبییەوە : تەیب جەبار

خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم،
تەواو ئەوروپایی نییە.
لە راستیدا، خەڵکی سەرانسەری ئەوروپایە.

خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم لە سوریا یان تورکیا،
مەغریب یان تونس، میسـر یان ئەندونیسیا، سربیا یان
عیراقەوە هاتووە.
رابردووی نییە، بەس بیر دەکاتەوە بژی.

خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم رۆژی لەدایکبوونی
نییە.
ئـەو رۆژەی لە دایك بوو، کارەبای هەموو وڵات
بڕا.
سوتەمەنی نەبوو دایکی بگوازنەوە بۆ نەخۆشخانە
لەبـەر ئـەوە، بەیارمەتـی برا گەورەکـەی، لە
چەرداخێکدا لەدایك بوو.
پێش ئەوەی لەدایك بێ، باوکی لەشەڕدا کوژرا.

خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم، لە وڵاتە ئەوروپاییەکەیدا لە شوقەیەکی کرێدا دەژی.
یەك دوو خانوشی لە وڵاتەکەی خۆیدا هەیە.
ئێستاش نیگەرانی ئەو خوشکانەیەتی کە شویان نەکردووە.
ئەگەر دایکی بمرێ.

کاتێ خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم لەپەم دەخوێنێتەوە
باسی کێشەکانی رابردووی خۆمم بۆ دەکات و بەڵێنی دوارۆژێکی گەشم پێدەدا.
هەردوو دەستی پڕ سۆزن.

ئەگەر بچین بۆ ناو جێگا، ناخەوین
دوو زمانی ئاڵۆز و بایەخ وروژێنمان هەیە
وەك مار لە یەك دەئاڵێن
بۆ بەیانیش تەنها بۆ هەردووکمان، زمانێکی تازەمان دەبێت.
لەم وڵاتە تازەیەدا ئەو شەوە، جووت بە دیداری یەك گەیشتین.

خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم دڕندەیەکی ترسناکە
تووکی سنگی منداڵی کۆرپە دەترسێنێ
ڕێك وەك (ئەخیل) لە (ئەلیادە)دا.
پێچەوانەی (ئەخیل) هیچ کێشەی لەگەڵ پاژنەدا نیە.
دەتوانێ بە گورج و گۆڵی رابکات،

بەو راکردنە ژیانی خۆی پاراستبوو،
کاتێ لە دەست پڵنگ و شێر و پیاوی تر رایدەکرد.

بۆ خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم ژیان سادەیە
مەسەلەکە مردن یان راکردنە.

خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم بێزاری دەرنابڕێ
خانوە تازەکەی خۆشدەوێ، هەروەها ژنەکەشی.
منداڵەکانی دەنێرێتە باشترین قوتابخانە.
نیگەران نیە بەوەی کوڕی نەبووە.
کچەکانی خۆشدەوێ بەو شێوازە ژیانەی خۆیان هەڵیانبژاردوە.
بەخشندەیە لەگەڵیان زیاد لەوەی هەیەتی.

خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم دڕندەی سێکسە
گەرچی من نازانم، تا ئێستا هیچ سێکسمان کردووە
هەرچەند دەچینە ژووری نوستن، لە خۆشەویستی زیاترمان نیە
کە بەردەوام دەبێ و دەمانبا
لە ڕێگایەکی بەرزەوە بۆ یەکێکی تر
لە هەڵگەڕانەوە بۆ کەوتن
لە کەوتنەوە بۆ فڕین

له فڕینەوە بۆ بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان.
هەرکاتێ خۆشەویستیمان دەگۆڕییەوە،
ژوورەکە سور دەبوو
هەروەها پەردە و سیسەم و دیواریش.
هەرچی لە ژورەکە هەبوو سور دەبوو
لێرە هیچ گوناحێك لەدایك نابێ
ئەمە شوێنی بونەوەری ئاسمانییە

خۆشەویستە ئەوروپاییەکەم
بەڕاستی شتێکە لە رابردوو.
پیاوێکە ئەوەندە ژنی خۆشدەوێ،
ئامادەیە هەرچی هەیە بیگۆڕێتەوە..
لە پێناوی بەسەربردنی شەوێك لە کۆشکی بادا

کاتێ پرسیاری رۆژی لەدایکبوونی لێ دەکەی
پێت سەیر نەبێ گەر بڵێ:
ئەو رۆژەی لە ئێران کۆمپانیای پیپسیان خۆماڵی کرد لەدایك بووم.

*کاتلین کالدما: ژنە شاعیرێکە خەڵکی وڵاتی (ئەستۆنیا)یە.

**سەرچاوە:**

سایتی ایلاف
وەرگێڕانی(عبدالرحمن الماجدی)

# بەم نزیکانە ژیاننامەی ئۆکتاڤیو پاز بڵاودەکرێتەوە

و. لە عەرەبییەوە: باوکی ڕەهەند

لەمیانەی ئەم ساڵدا، توێژەری کوبی «ئەنریکۆ ماریۆ» سەرقاڵی نوسینەوەو بڵاوکردنەوەی ژیاننامەی شاعیری مەکسیکی «ئۆکتاڤیو پاز»ە کە ساڵی ١٩٩٠ خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە، ئەم ژیاننامەیە لە هەمو ژیاننامەکانی دیکە، لە ژیانو کارەکانی شاعیرەوە نزیکترە. ئاشکرایە ئەوەی دەربارەی دانەری کتێبی (وێڵگەی تەنهایی) نوسراوە هێجار زۆرە، چ لە بارەی بەرهەمە شیعریەکانییەوە یاخود کارەکانی لە بواری توێژینەوەدا. بەڵام ئەوەی دەربارەی ژیاننامەی نوسراوە، زۆر زۆر کەمە، ئەمە ئەگەر ئەو تەحەفوزە گەورەیە لەبەرچاو بگرین کە نوسەر دەربارەی ژیانی تایبەتی خۆی هەیەتی. نزیکترین ژیاننامە تاکو ئێستا لەسەر ژیانی ئۆکتاڤیو پاز بڵاوبوبێتەوە، بریتییە لە کۆمەڵێ وتارو توێژینەوەی «گیلیبرمۆ شریدان»ی نوسەر کە لە ساڵی ٢٠٠٤ لە دووتوێی کتێبێکدا بە ناونیشانی (شاعیرێك بە دیمەنە سروشتییەکانەوە) بڵاوکراوەتەوە.

بەڵام پێش ئەوە، «ئەلبێرتۆ روی سانجێس» لە ساڵی ١٩٩٠، کتێبێکی بە ناونیشانی (دەروازەیەك بۆ ئۆکتاڤیو

پاز) نوســـی، کتێبەکە چەندین وردەکاری گرنگ‌و بایەخداری لەســـەر ئۆکتاڤیو پـــاز لەخۆدەگرتووە. لەگەڵ ئەوەشدا تەنها ئەو کتێبانە بڵاونەکراونەتەوە کە قســـەوپاز لە ژیان‌و کارەکانی ئۆکتاڤیو پاز دەکەن، بەڵکـــو «خۆرخێ ئەگیلار مۆرا» کتێبێکی دەربارەی ئۆکتاڤیو پاز بڵاوکردەوە کە جێگای سەرنج‌و مشتومڕ بوو، لەکاتـــی بڵاوبونەوەی ئەو کتێبەدا ئۆکتاڤیو پاز توڕەدەبێـــت. کتێبەکـــە بەم ناونیشـــانەیە (دووانەی خودایی)و تیشـــك دەخاتە ســـەر مێژو و ئەفسانە لە کارەکانـــی ئۆکتاڤیو پاز دا. دوای چەند ســـاڵێکی دیکەو لەساڵی ١٩٩٨، «ئیلینا بونیاتویسکا» کتێبەکەی بەناونیشانی (ئۆکتاڤیو پاز.. وشـــەکانی درەختەکە) بڵاوکردەوە.

لە ماوەی چەنـــد مانگی داهاتـــودا، کتێبێکی نایابیتر دەچێتـــە ڕیزی ئەو کتێبانەی دیکەوە کە پاز لە ژیاننامەی ئۆکتاڤیو پـــاز دەکەن. ئەویش کتێبی (ژیاننامە مەزنەکەی ئۆکتاڤیو پاز)ە کە نوســـەری بە ڕەگەز کوبی «ئەنریکۆ ماریۆ سانتی» نوسیویەتی. ئەم نوســـەرە دەڵێ حەز ناکات لە میانەی چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانییەکانیـــدا پازی ئەو کتێبە بکات، بەڵام لە هەمانکاتدا جەخت لـــەوە دەکاتەوە کە لە کۆتایی ئەم ســـاڵدا یاخود لە سەرەتای ســـاڵی ٢٠١٢ دا، لە وتووێژەکانیدا پازی لێوە دەکات.

وەك ئاماژەیـــەك بۆ ئەو پێگـــە ئەدەبییە بەرزو شکۆدارەی ئۆکتاڤیو پاز هەیەتی، «براولیۆ بیرالتا»ی ڕۆژنامەنوس‌و بڵاوکار دەڵێ: (ئۆکتاڤیو پاز نوسەرو توێژەرو شـــاعیرو بیرمەندە، ئەمە لەپـــاڵ ئەوەدا کە ڕەخنەگرێکی شـــێوەکاری گەورەیەو توانیویەتی لە پێشـــەوەی ئەو کەسانە بێت کە ژیانی خۆیان بۆ ئەم جۆرە لە ڕەخنەی ئەدەبی تەرخانکردووە. ئۆکتاڤیو پاز وەك هارۆڵد بلۆم دەڵێ شاعیرێکە خاوەنی قوتابخانەی خۆی‌و هەوادارانی خۆی هەیە).

تا ئێستا کاری نوسینێکی پڕاوپڕی تەواو لەسەر ژیاننامەی ئۆکتاڤیو پاز، مەسەلەیەکی هەڵپەسێردراوە،

ئەگەرچی چەندین توێژینەوەی گرنگو بایەخداری تایبەت بە ژیانی ئەم شاعیرە دەرکەوتنو بڵاوبونەتەوە. ئۆکتاڤیــو پاز لەبەر ئەوەی پەی بــەوە بردوو دوای مردنی، ژیانو کتێبەکانی دەبنە شوێنی لێکۆڵینەوەو بایەخپێدانــی نەوەکانی داهاتوو، بۆیە دەیویســت ســەبارەت بە ژیانی تایبەتی زۆر وریاو بەپەرێزبێت. ئەوەی ئێستا سەبارەت بە هەندێ لە وردەکارییەکانی ژیانی لەبەردەســتدایە، هیچ نییــە جگە لە کۆمەڵێ زانیاری کە لە چاوپێکەوتنــە رۆژنامەوانییەکانییەوە وەرگیراون یاخود لەوەی خــۆی لە کتێبەکانییەوە لەسەر خۆی وتویەتی.

لە پاڵ ئەو پرســیارە زۆرانەی تا ئێســتا لەسەر کاروانی ئەدەبی ئەم نوسەرە دەوروژێنرێت، کەچی لایەنی کۆمەڵایەتی هێشتا نارۆشنی زۆری تێدایەو زۆر لایەنی ژیانی هەیە هێشتا قسەی لەسەر نەکراوە، وەك ئەو لایەنەی پەیوەســتە بە کاری دیبلۆماسییەوە یان ئەو رۆڵەی وەك بڵاوکەرەوەیەكو ریکلامکردنێك بۆ چاپەمەنییەکان هەیبووە. وەك چۆن هەمو نوسەرێکی مەزن چەندین کتێب هەیە پاز لە ژیاننامەکەی دەکات، ئەوا پێویســتییەکی زۆر هەیە بــۆ کتێبێك تەواوی وردەکارییەکانی ژیانی ئۆکتاڤیو پاز لەخۆبگرێت، لە هەمو لایەنەکانەوە، لەوانە لایەنی داهێنانەکانیو لایەنی کۆمەڵایەتــی. چونکە ئەوەی تا ئەمرۆ لەســەر ئەم نوسەرە بڵاوبوەتەوە، ئەو مەبەستە نادات بە دەستەوە بۆ کەســێك کە بیەوێت لە جیهانەکەی نزیکبێتەوە. رەنگە کتێبەکەی «ئەنریکۆ ماریۆ» ئەو کتێبە بێت کە خوێنەرانی ئۆکتاڤیو پاز چاوەڕوانی دەکەنو لەوانەیە تینوێتیان بشــکێنێتو وایانلێبــکات بتوانن زۆر لە نزیکەوە لێکۆڵینەوە لە ژیانو کارەکانی بکەن.

لەوانەیە، بتوانین کتێبی (شاعیر لە نیشتیمانەکەیدا) لە نوســینی «براولیۆ بیرالتا»، لــە خانەی ئەو کتێبانە دابنێین کە نزیکن لە ئۆکتاڤیو پاز، چونکە پێچەوانەی ئەو کتێبانەیە کە پاز لە ژیاننامەی تایبەتی ئەم شاعیرە مەکســیکیە دەکەن. کتێبەکە بریتییــە لە کۆمەڵێ گفتوگــۆی رۆژنامەوانی کە لەگــەل ئۆکتاڤیو پاز ئەنجامــدراوە، گفتوگۆکان لەبارەی ئاشــنابونی بە جیهانی سریالیو شــیعری (سپی)و هەستوسۆزی لە (دوانەی ئاگر) لەوێوە بۆ بیروباوەڕە سیاسییەکانی لە کتێبی (دێوی چاکە) یان کتێبی (کەشــوهەوای تەمومژاوی)و دواجار شوناســی مەکسیکییەکان لە «وێڵگەی تەنهایی»و بەرجەستەکردنی خودی خۆی لە (تەڵەکانی ئیمان)دا.

زۆرن ئەو تێکستانەی پاز لە کارەکانی ئۆکتاڤیو پازی شــاعیر دەکەن، ئەم نوسەرە بە دوو ساڵ پێش مردنی، لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانی لەگەڵ «سیلفیا جێریم»دا دەڵێ: (لەساتەوەختی دەستکردنم بە نوسینو بڵاوکردنەوەو بە درێژایی شەســت ساڵ، روبەڕوی کۆمەڵێ تۆمەــتو حوکم بومەتــەوە، کاتێ مێرد منداڵبووم تۆمەتی ئەوەیان دەخستەپاڵم لە بیانی دەچم، بەتایبەتی لە فەرەنســی دەچم. دواتر ســتالینییەکان بە منیان دەوت ترۆتســکی-یە و ناپاکە، پاشــان بە کۆنەپەرست وەسفیان دەکردمو دەیانگوت من خۆم بە سەرمایەداری فرۆشتووە. پێش چەند ساڵێکی کەم لەمەوبەر، وتیان من قســەکەری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکام. ئایا من ســەر بەو خێزانــە گەورانەم کە خۆشەویست نین؟).

**سەرچاوە:** یوسف یلدا، ایلاف، ٢٠١١/٨/١٨

# ئایا سیخورەکانی (کەی، جی، بی) لە پشت کوشتنی "ئەلبێرت کامۆ"وە بوون

و. لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

نوســەرو بیرمەندی فەرەنسی «ئەلبێرت کامۆ» دوای وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ بە دوو ســاڵ، واتە لە ســاڵی ١٩٦٠ لــە رووداوێکــی هاتوچۆدا کوژرا. رۆشــنبیرانی فەرەنسا ماتەمینییان راگەیاندو مردنەکەیان بە کارەساتێکی نیشــتیمانی لە قەڵەمداو وەك یەکێك لەکارە ناشرینەکانی قەزاو قەدەر تەماشایانکرد. هۆکارەکەشی بۆ دۆزینەوەی ئەو بلیتی شــەمەندەفەرە دەگەڕێتەوە کــە لە گیرفانی «ئەلبێرت کامــۆ» دۆزرایــەوەو بەکارنەهاتبوو، بلیتەکە تایبــەت بوو بە گەڕانەوەی لە ماڵەکەی لە (پرۆفانس) بۆ پاریس بە شەمەندەفەر. «ئەلبێرت کامۆ» تەمەنی ٤٦ ساڵ بوو، دەیویست دوای بەســەربردنی جەژنەکانی سەری ســاڵ، لەگەڵ هاوسەرەکەیو هەردوو کچە جمکەکەی «کاترینو جین» بەشەمەندەفەر بگەڕێتەوە بۆ پاریس. بەڵام بڵاوکەرەوەی بەرهەمەکانی «میشــێل گالیمار» پێشنیازی ئەوەی بۆ دەکات هەمویــان پێکەوە بە ئۆتۆمۆبێلەکەی گالیمار بگەڕێنەوە.

دوای ئەوەی ئۆتۆمۆبێلەکەی گالیمار لە ڕێگابەستووەکە

دەردەچێــتو خۆی دەکێشـێت بــە درەختێکدا، دەمودەست «ئەلبێرت کامۆ» دەمرێتو «گالیمار»یش پاش چەند رۆژێکی کەم گیان لەدەستت دەدا. پۆلیس لەگەڵ بلیتی شەمەندەفەرەکەدا، ١٤٤ لاپەڕەیان لەناو ئۆتۆمۆبێلە تێکشـــکاوەکەدا دۆزییەوە کە بە دەست نوســـرابوەوە، لاپەڕەکان دەستنوسی رۆمانێك بوو بە ناونیشانی (دواهەمین پیاو)، «ئەلبێرت کامۆ» پێیوابووە کارەکانی، بەم رۆمانەی، دەچێتە ئاســـتێکی باڵاوە، سەرچاوەی رۆمانەکە ساڵانی منداڵییەتی لە جەزائیر. فەرەنسا بە مردنی «ئەلبێرت کامۆ» داچڵەکیو بۆ کوڕە رۆماننوسو فەیلەسوفەکەی گریا. لەو ساتەوەختەدا بە خەیاڵی کەسدا نەهاتووە ئەوەی رویداوە، روداوێکی تراژیدی نەبووە. بەڵام رۆژنامەی (کۆریری دیلا سیرا) ی ئیتالی، لە ئێستادا پێیوایە سیخوڕەکانی سۆڤیەت، لە پشت روداوی هاتۆچۆکەوە بوون. رۆژنامەکە لێرەدا پشت بەو قسانە دەبەســـتێت کە شاعیرو ئەکادیمی ئیتالی «جیڤانی کاتیللی» تۆماریکردووە. ئەم شاعیرە ئیتالیە تێبینی ئەوە دەکات بڕگەیەك لە کتێبی (هەمو ژیان)ی شـــاعیرو وەرگێڕی ناســـراوی چیکی «یان زابرانا» لابراوە، ئەو بڕگەیە لە وەرگێڕانی ئەو کتێبە بۆ زمانی ئیتالی لابراوە.

«زابرانا» لەو بڕگە لابراوەدا نوسیویەتی: (لە دەمی پیاوێکەوە کە ئاگاداری زۆر شـــت بووەو چەندین ســـەرچاوەی هەواڵو زانیاری باشی هەبووە، شتێکی زۆر سەیرو سەرســـوڕهێنەرم بیست. بە پێی قسەی ئەو پیاوە بێت، ئەو ڕوداوەی ســـاڵی ١٩٦٠ کە بووە هۆی لەدەستدانی ژیانی کامۆ، سیخوڕەکانی سۆڤیەت پێیهەســـتاون. ئەویش لە ڕێگەی دەســـتکاریکردنی تایەیەکی ئۆتۆمۆبیلەکەوەو بە بەرکارهێنانی ئامێرێك کە لەکاتێکدا ئۆتۆمۆبێلەکە بەخێرایی تێپەڕیوە، تایەکە کراوەتەوە یان کونێك کراوەتە تایەکەوە).

«زابرانـــا» بەردەوام دەبێتو بـــاس لەوە دەکات وەزیـــری دەرەوەی ئەو کاتی ســـۆڤیەت «دیمتری ترۆفیمۆفیتش شـــبیلۆف»، فەرمانی کردووە وەڵامی

ئەو وتارە بدرێتەوە کە «ئەلبێرت کامۆ» نوسیویەتی‌و لە گۆڤارێکی فەرەنسی لە ئازار/مایسی ساڵی ١٩٥٧ دا بڵاوکراوەتەوە. «ئەلبێرت کامـۆ» لە وتارەکەیدا بەرپرسـیارەتی سـەرکوتکردنی خۆپیشاندانەکانی مەجەری سـاڵی ١٩٥٦ دەخاتە ئەستۆی شبیلۆف‌و لـە وتارەکەیدا بەناو نـاوی دەهێنێـت. هەروەها پرۆتستۆی بڕیارەکەی مۆسکۆ دەکات کە هێزی بۆ سەرکوتکردنی خۆپیشاندانەکان رەوانەکردووەو بە (قەسابخانەکەی شبیلۆف) وەسفی کردووە. «ئەلبێرت کامۆ» دوای ساڵێکیتر جارێکی دیکە دەسەڵاتدارانی سـتالین توڕەدەکات، ئەمەش ئـەو کاتە بوو کە بە ئاشکرا پشتیوانی خۆی بۆ نوسەری روسی «بۆریس باسترناك» خاوەنی رۆمانی (دکتۆر زیفاگۆ) دەربڕی کە ستالین هەم ڕۆمانەکەی قەدەغەکردبوو هەم دواتر لێنەگەڕا باسترناك خەڵاتی نۆبڵ وەربگرێت کە دوای کامۆ پێیبەخشرا. رۆمانی دکتۆر زیفاگۆ دوای ئەوەی بە شـێوەی قاچاخ برایە دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت، لەساڵی ١٩٥٧ لە خۆرائاوا بڵاوبوەوە.

رۆژنامە ئیتالییەکە «کۆریری دیلا سیرا»، پێیوایە چەندین هۆکاری تەواو لای مۆسکۆ هەبووە، تاکو چرای سـەوز بۆ تیرۆرکردنی «ئەلبێرت کامۆ»، بەو ڕێگایەی لەسەری ڕاهاتبوون‌و سیخوڕەکانی (کەی جی پی) تەواو تێیدا شارەزابوون، هەڵبکات. ئەگەر ئەو بۆچونـەی ڕۆژنامە ئیتالییەکە ڕاسـتبێت، ئەوا قەتماغەی برینێك هەڵدەداتـەوە کە لەلای ملیۆنان کەس لە خۆشەویستانی کارەکانی «ئەلبێرت کامۆ» سارێژ ببوو. لەو سـەردەمەدا کاتێ تەرمی نوسەری (غەریب، تاعون، یاخی، ئەفسـانەی سـیزێف) لە گۆڕستانی (لورماران) لە باشـوری فەرەنسا بەخاك سپێردرا، تیپێکی دوو گۆڵی میللی ئامادەی ناشتنەکەی بوون، ئەمەش گەواهی ئەوەیە «ئەلبێرت کامۆ» لەپاڵ ئەوەی بیرمەندو فەیلەسـوف بووە، پیاوێکی میللی سادەو ساکاریش بووە. ساڵی پار سەرۆکی فەرەنسا «نیکۆلا سارکۆزی» هەوڵیدا ڕوفاتی «ئەلبێرت کامۆ» بگوێزێتەوە بۆ گۆڕستانی مەزنەکان، بەڵام هەوڵەکەی سەرینەگرت‌و شکستیهێنا.

«ئۆلیڤـەر تۆد» ئەوەی سـاڵی ٢٠٠٠ ژیاننامەی «ئەلبێرت کامۆ»ی بە زمانی ئینگلیزی بڵاوکردۆتەوە، بـە رۆژنامەی (ئۆبزڤێر)ی ڕاگەیانـدووە لە میانەی گەڕان‌و پشکنینی بەناو ئەرشیفی یەکێتی سۆڤیەتدا، هیـچ ئاماژەیەکی نەبینیوە بەوەی مۆسـکۆ بڕیاری دەستگیرکردنی «ئەلبێرت کامۆ»ی دەرکردبێت. ئەو ئاماژە بـەوە دەدا هیچ بەلایەوە سـەیر نەبووە گەر جموجوڵ‌و چالاکییەکانی (کەی جی پی) یاخود ئەو دەزگایەی دوای ئەو هات، شتی لەو بابەتەی تێدابێت. بەڵام ئەو بانگەشەیەی ڕۆژنامە ئیتالییەکە دووچاری دۆشدامانی کردووەو دەڵێ» (ئاخۆ کێ لەوە سودمەند بووەو هۆکارەکەی چی بووە).

«ئۆلیڤەر تـۆد» گومانی هەیە لـەوەی ڕۆژنامە ئیتالییەکە باسی دەکات‌و دەڵێ بەڵگەنامەکانی (کەی جی پی) پڕە لەو ڕاپۆرتانەی کە سۆڤیەت خەڵکانی بۆ کاری پیس‌و بۆگەن بەکارهێناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی قەناعەتی بەوە هەیە (کەی جی پی) هەرگیز سـڵی لە هیچ شـتێك نەکردوەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی وایە چیرۆکی تیرۆرکردنی «ئەلبێرت کامۆ» ڕاست نییە.

**سەرچاوە:**


ئیلاف، عبد الاله مجید، ٢٠١١/٨/٢٧



دۆستۆیڤسکی

لە قومارچییەکەوە بۆ پێغەمبەرێکی گەورەی ئەدەب

ئەردەڵان عەبدوڵڵا



دۆستۆیڤسکی

ئەردەڵان عەبدوڵڵا



COVER DESIGN: NARMIN MUSTAFA

DOSTOEVSKY

ARDALAN ABDULLA

محەمەد عومەر عوسمان

لەغوربەتا



کتێبی ستایشەکان

ڕێبوار سیوەیلی

# بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم

ئامادەكردنی: باوكی رەهەند

لە ماوەی رابردودا دەزگای سەردەم كۆمەڵێ كتێبی هەمەرەنگـــی چاپو بڵاوكردەوە، ئێمـــە لێرەدا رانان بۆ هەندێ لەو كتێبانە دەكەین.

**دۆستۆیڤســـكی لە قورمارچییەكەوە بۆ پێغەمبەرێكی گەورەی ئەدەب**

ئەم كتێبە یەكێكە لـــەو كتێبە باشو دەگمەنانەی بە زمانێكی كوردی جوانو پوختو بە تێروتەسەلی باس لە ژیانو بەرهەمەكانی ئەدیبی گەورەی روسیا دۆستۆیڤسكی دەكات. وەك ئاشـــكرایە دۆستۆیڤســـكی یەكێكە لەو كەڵە نوســـەرە گەورانەی كە هەمیشە بە نەمریو مەزنی دەمێنێتەوە، دیارە هۆكاری ئەم مانەوەیەش بۆ بەرهەمەكانی دەگەڕێتـــەوە، بۆ ئەو رۆمانانـــە دەگەڕێتەوە كە باس لە مرۆڤو لایەنە شاراوەكانی ناخی دەكات. باس لەو حەزو ویســـتو ئارەزوانە دەكات كە بەشێوەیەك لە شێوەكان پەنهانن‌و تەنها لە هەندێ چركەســـاتی تایبەتو ناوازەدا دێنەدەرەوەو دەردەكەون.

نوســـەری ئەم كتێبە بۆ ئەوەی خوێنـــەری كورد، تاڕادەیەكی باش بە جیهانی دۆستۆیڤســـكی ئاشنابكات،

کتێبەکەی کردووە بە شـــێ بەشـــەوەو هەر بەشەی چەندیـــن لقی لێدەبێتـــەوەو هەر لقـــەش باس لە خەسڵەتەێك لە خەســـڵەتەکانی ژیانو بەرهەمەکانی دۆستۆیڤســـکی دەکات. لە بەشی یەکەمدا باس لە ژیانی دۆستۆیڤســـکی دەکات، خوێنەر لەم بەشەدا بۆی دەردەکەوێت کە دۆستۆیڤســـکی لە یەکێك لە نەخۆشـــخانەکانی مۆســـکۆ لەدایك بـــووەو لە تەمەنی بیستوچوارساڵیداو بۆ یەکەمجار لە ڕێگەی کاری وەرگێڕانـــەوە هاتوەتە ناو جیهانی نوســـینو ڕۆشنبیرییەوە. ئەویش لە ڕێگەی وەرگێرانی ڕۆمانی (ئۆژنی گراندی) نوسەری ناوداری فەرەنسی «بەلزاك». دواتر هەر لەم بەشـــەدا باس لە گرتنو نەفیکردنی دۆستۆیڤسکی دەکرێت بۆ سیبریاو کاریگەری ئەو گرتنو دوورخستنەوەیەی لەســـەر ژیانی دواتریو بەرهەمەکانی.

خوێنەر لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا، ئاشنای ئەو تایبەتمەندیانە دەبێت کە لە ڕۆمانەکانی دۆستۆیڤسکی دا ئامادەییان هەیە. هەروەها ئاشنای ئەو نوسەرە روسانە دەبێ کە کاریگەری گەورەیان بەسەر دۆستۆیڤسکی دا هەبووە، لەوانە تۆرجینێڤ، بلینسکی رەخنەگر، لیۆ تۆڵستۆی. دواتر دانەری کتێبەکە باس لەو نوسەرانە دەکات کە لەژێر کاریگەری دۆستۆیڤسکی دابوون، لەوانە نیتچە، سیگمۆند فرۆید، ئەلبێرت کامۆ. هەر لەم بەشەدا هەندێ نوسین تەرخانکراوە بۆ ئەو ڕەخنانەی لە ڕووی تەکنیكو فیکرو فەلسەفییەوە لە کارەکانی دۆستۆیڤســـکی گیراوە. هەروەها ڕەخنە لە هەندێ وێستگەی تایبەتی ژیانی ئەم نوسەرە مەزنەی روسیا گیراوە، وەك کاتەکانی قورمارکردنیو پەلاماردانی بۆ کچێکی منداڵو نوسین بۆ ستایشکردنی قەیسەر. سەیرە! ئەم کەڵە نوسەرەی جیهان، لە هەندێ قۆناغی ژیانیدا، یەکێك بەوە لـــە قومارچییە بەناوبانگەکانی ئەو ســـەردەمەی روســـیا، کاتێکی زۆری خۆی بە قومارکردن بردوەتەســـەر، تەنانەت ئەو پارەو پولەی کە دەســـتی دەکەوت، لەباتی ئـــەوەی بۆ خێزانو منداڵەکانی خەرجی بکات، هەموی لەســـەر مێزی قورمارکردن دادەنا. وەك لەم کتێبەشـــدا باسکراوە

یەکێك لە منداڵەکانی بەهۆی قومارکردنەوە دەمرێت، چونکە منداڵەکەی نەخۆش کەوتووەو پارەی نەبووە چارەسەری بکات!

بەشی سـێیەمی کتێبەکە تەرخانە بۆ قسەکردن لەسـەر بەشـی زۆری بەرهەمـە ئەدەبییەکانـی دۆستۆیڤسـکی لە رۆمانو چیرۆك، لەوانە هەژاران، شـەوە سپییەکان، تاوانو سـزا، قومارچی، گەمژە، شـەیتانەکان، برایانی کارامازۆڤ. دانەری کتێبەکە باس لـەوە دەکات یەکەم کاری دۆستۆیڤسـکی کە خوێندبێتییـەوە رۆمانی (تاوانو سـزا)یە، هەر جوانیو نایابی ئەم شـاکارە مەزنەیـە، وایکردووە نوسەری کتێبەکە بکەوێتە شوێن بەرهەمەکانی دیکە دۆستۆیڤسکیو پەیدایان بکاتو بیانخوێنێتەوە. پاشان دانەری کتێبەکە باس لـە رۆمانی هەژاران دەکات کە یەکەم ڕۆمانی دۆستۆیڤسـکیو لە تەمەنی ٢٤ ساڵیدا نوسیویەتی. ئەم بەشەی کتێبەکە هەوڵدانێکە بۆ تێگەشتن لە بەرهەمە ئەدەبییەکانی دۆستۆیڤسکی لە دیدی خوێنەرێکی کوردەوە کە دانەری کتێبەکەیە. لە کۆتایی ئەم بەشـەدا ناوی تەواوی ئەو بەرهەمانە بە ڕیز نوسـراوە کە دۆستۆیڤسکی لە ژیانی ئەدەبی خۆیدا نوسیویەتیو ژمارەیان **٢٣** بەرهەمە.

ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز «ئەردەڵان عەبدوڵڵا» وە بە زمانێکی سادەی قووڵ نوسراوەو خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەیدا هیچ نارەحەتییەك نابینێتو بە ئاسانی لە بابەتەکان تێدەگات. ئەمەش خاڵێکی جوانی ئەم کتێبەیە. کتێبەکە بریتییە لە **٢٦٤** لاپەڕەی مامناوەندیو تیراژەکەی ٧٠٠ دانەیەو نرخی چوار هەزار دینارە.

**لە غوربەتا**

ڕەنگە هەمو ئەوانەی سـەرقاڵی کاری نوسینو ئەدەبیاتن، تێیاندا نەبێت نـاوی دیوای لە غوربەتای نەبیسـتبێت یان چەند جارێك نەیخوێندبێتەوە. ئەم دیوانە یەکێکە لـەو دیوانەی دەگمەنو ناوازانەی بە درێژایی تێپەڕبونی سەردەمو ڕۆژگارەکان، جوانییەکانی خۆی لەدەسـتنەداتو هەمیشەو لە هەر سەرزەمینو زەمەنێکدابێت، بەهـاو خوێنەری خۆی هەیەو نەوە دوای نەوە دەیخوێنێتەوە. وەك چۆن نەوەی کۆن چێژ لەم شیعرانە وەردەگرێت، بە هەمان ئەندازەش نەوەی تازە چێژی لێوەردەگرێت. لەوانەیە کەم کتێبخانەی کـوردی هەبێت ئـەم دیوانە قەبـارە بچوکەی لە سوچێکدا هەڵنەگرتبێت.

وەك ئاشـکرایە بابەتی نێو ئەم دیوانە شـیعرە وەرزی پایـزە، ئێمە لەگـەڵ خوێندنـەوەی ئەم شـیعرانە، بەجۆرێك ئاشنای پایزو تێکەڵ بە وەرینی گەڵاکان دەبین کە هەرگیز حەز ناکەین لەو وەرزە بێینەدەرەوەو پێمانخۆشە بە درێژایی ساڵ پایز میوانی ماڵو شـەقامو کوچەو کۆڵانەکانمـان بێت. حەز دەکەین لەو دیمەنانە رامێنین کە ئەم دیوانە بە پایزی بەخشیوەو تێیدا بمێنینەوە. لێرەدا پایز لەوە دەرچووە تەنها وەرزێکی سێ مانگی بێتو ئیدی بڕواو دوای چەندین مانگی دیکە بێتەوە، نەخێر پایز لەم دیوانەدا میوانێکی ئازیزی ناو ڕۆحو دەرونو قوڵایی ناخمانە، میوانێکە بـۆ هەرکوێیەك بڕۆین لە پێشـمانەوەیەو ئێمـە کەوتوینەتە دوای ئەو، پیاز بووەتە بەشـێك لە جەسـتەمانو بیرکردنەوەمان، بووەتە حاڵەتێکی دەروونی کە زۆربەمان گیـرۆدەی بووینو خۆمان لەناویدا دەبینینەوە، بووەتە بەشێك لەو خولیاو حەزو ئارەزوانەی کە لە خەیاڵو بیرکردنەوەماندا ئامادەیی هەیەو حەزدەکەین لەسەر ئەرزی واقیع بیهێنینەدی.

لە غوربەتدا پێمان دەڵێ وەرن پایزانە بژین، ژیانی پایزانە بریتییە لە فڕێدانی دەمامکەکانو دەرخسـتنی خۆمـان وەك ئـەوەی هەیـن نـەك وەك ئەوەی تەماشـادەکرێن، واتە لەبەردەم یەك روتبینەوە چون رووتبونـەوەی درەختەکان. ئەمەش مانای وایە چیتر درۆو نیفاقو دووڕوویی بەرامبەر یەك نەکەینو ئەوەی

لە قولایی ناخماندایە، بۆیە کرتی هەڵڕێژین‌و هەمو ئەو پەردەو دەمامکە درۆزنانــــە فرێیدەین کە ڕووکاری ڕاستەقینەمان دەشارێیتەوە. با وەك درەختەکان ئەگەر بۆ چەنــد ڕۆژێکیش بێت، خۆمـــان ڕوتکەینەوەو ڕاستۆگایە یەکتر بدوێنین.

من بۆ خۆم پێش خوێندنەوەی ئەم دیوانە، هەڵبەتە مەبەســـتم ئەو کاتەیە کە بۆ یەکەمجار لە ناوەراستی هەشتاکاندا بلاوکرایەوە، هەرگیز نەمزانی بوو پایز ئەم هەمو جوانی‌و غەم‌و خوربەتەی لەخۆگرتووە، دوای خوێندنەوەی ئەم دیوانە پایز مانای دیکەو رەهەندی دیکە وەردەرگێت کە پێشـــتر من دەرکم بەو ماناو رەهەندانەی نەکردبوو، پایـــز لەوە دەردەچێت تەنها وەرزێك بێت لە پاڵ سێ وەرزەکەی ساڵداو لە مانگی نۆدەستپێبکات‌و لە مانگی یانزە کۆتایی پێبێت. نا ئەوە تەنها پایزی ناو ڕۆژمێرەکان‌و ئەو تەقویمانەیە لەسەر مێزەکان دادەنرێن‌و بە دیواری فەرمانگەکان‌و ماڵانەوە هەڵدەواسرێن. ئەوەیان پایزێکی بێ ڕۆح‌و بێ جووڵەو بێ هەســـتە، پایزێکە مت‌و بێ خەیاڵ. وەلێ پایزی حەقیقی‌و راســـتەقینە، پایزی نێو دیوانی لە غوربەتایە کە پڕە لە ڕەنگ‌و پڕە لە ژیان‌و لە ڕاستگۆیی، پڕە لە جووڵەو لە خەیاڵ.

دیوانی لە غوربەتا لە نوســـینی «محەممەد عومەر عوسمان»ە کە بە حەق شـــایەنی نازناوی جەنەڕاڵی پایـــزە. ئەم جەنەڕاڵە وەك جەنەڕاڵەکانی جەنگ نییە، کاتێ لە جەنگێك ســـەردەکەن یان دەدۆڕێنن، ئەوا پلان‌و نەخشەی دیکە بۆ جەنگێترو شەڕێترو کوشتاری دیکە دادەنێن. نا ئەم جەنەڕاڵە تەنها یەك دیوانی نوسی، ئیدی دوای ئەوە تاڕادەیەکی زۆر لە نوســـینی شیعر دوورکەوتەوە، نەبادا نەتوانێ شتێك بنوسێت لە ئاست ئـــەم دیوانەیدا نەبێت. ئەمەش یەکێك لە خەســـڵەتە جوانی‌و هەرە دەگمەنەکانی جەنەڕاڵی پایز، چونکە ئەم ڕێزو حورمەتێکی زۆری بۆ نوسینی شیعر هەیەو شـــیعری نەکردوەتە ئامرازێك بۆ کاری بازرگانی‌و ناوبانگ دەرکردن. لە راستیدا ئەم شاعیرە تەنها دیوانی لە غوربەتای بەسەو تا ئەبەد بە نەمری دەیهێڵێتەوە. ئەم دیوانە جوانە تەنها بریتییـــە لە ١٥٤ لاپەڕەی بچوك‌و چاپی ســـێیەمیەتی‌و تیراژەکەی ســـێ هەزار دانەیەو نرخی سێ هەزار دینارە.

**کتێبی ستایشەکان**

ئەم کتێبە یەکێکی دیکەیە لەو کتێبانەی کە «ڕێبوار سیوەیلی» نوسەرو ڕۆشنبیر، بلاویکردۆتەوەو تێیدا بە زمانێکی سادە بەلام قووڵ، زمانێکی فەلسەفەی بەلام ئاسان بۆ تێگەشتن، ستایشی کۆمەڵێ بابەت دەکات، لەوانە دایك، سروشت، گەردوون، ئاسمان، نیشتیمان، تێکشـــکان...هتد دەکات. ئێمە لەم کتێبەدا لەبەردەم هەندێ ستایشـــدا راوەستاوین کە پێشتر تاڕادەیەکی زۆر بە خەیاڵماندا نەهاتووە ستایشـــی بکەین، یاخود بەلامانەوە گرنگ نەبووە ستایشی بکەین‌و یان راستتر هەر بیری لێبکەینەوە. لەوانە گەردون، قســـەکردن، خود، ئەویتر، بەردەوامی.

کتێبەکـــە جگـــە لـــە پێشـــەکی دانەرەکەی چاوپێکەوتنێك کە لەگەڵ خودی نوسەری کتێبەکەدا کراوەو لە کۆتایی کتێبەکەدایە، ١٣ وتاری ستایشکردن لەخۆدەگرێت. وتارەکان بـــە زمانێکی پوخت‌و بێ گرفت نوســـراون‌و خوێنەر لەکاتـــی خوێندنەوەی بابەتەکاندا، هەست بە هیچ جۆرە ناخۆشییەك ناکات، واتە ئەگەرچـــی وتارەکان تائاســـتێك بە زمانێکی فەلسەفیانە نوسراون، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا تێگەشتن لە بابەتەکان کارێکی قورس نییەو ئاسانە، ئەمەش بۆ توانای نوســـەر دەگەڕێتەوە کە دەزانێ چۆن‌و بۆچی دەنوســـێت. کتێبەکە لە ١٧١ لاپەڕەی نیو ئەی فۆڕ پێکهاتووە، تیراژەکەی حەوت سەد دانەیەو نرخەکەی ٢٥٠٠ دینارە.

کتێبی ژمارە:

# نامیلکەی
# دەست - دەسەڵات

و. لەسوییدییەوە: گۆران مەریوانی

دەسەڵات جوانە!

پرسێ هەر لە سەرەتاوە دەبێ جەختی لێبکەین:- دەسەڵات نە ناشرینە نە جێی شەرمەزارییە. بەمەرجێ بەد بەکار نەهێنرێ. دەسەڵات جوانە، باش و گرینگە گشت لایەنگرانی راستکردنەوەی بێدادی و گۆڕانخوازیی کۆمەڵگە هەیانبێ.

دەبێ زۆر بە وریایی، دانشمەندانە، مرۆڤپەروەرانە و ژیرانە لەتەك دەسەڵاتدا بەرخوردبکرێ. ئێمە دەزانین چی دەقەومێ کاتێك پیاوان بەتاقی تەنیاو بۆ خۆیان دەسەڵات مۆنۆپۆڵ دەکەن. پیاوان دەرۆستی ئەمکارە نایەن! دەبێ فرەگەلێك ژنانی نمونەیی بچنە ریزەکانی دەسەڵاتکارانەوە. تەنیا ئەوکاتە دەکرێ بەدبەکارهێنانی دەسەڵات بوەستێنرێ.

بۆیە دەبێ ژنان لەسەرجەم ئۆرگانە بڕیاردەرەکانی سەنتەری دەسەڵاتدا بەرپرسی نیوەی دەسەڵات بن. بڕیارێك تەنیا پیاو بیدا شیاو نییە، نا-بڕیارە. بڕیارگەلێکی وا دەبێ لە رووی یاساگەرییەوە لەکاربخرێ.

دەکرێ دەسەڵات کاریگەریی هەبێو گۆڕانکاری

**ژنان دەبێ خۆیان رابێنن کە باشتر دەرکەون، بەهێزتر پرۆفایلیان بکرێن و کەسایەتی خۆیان نیشانبدەن. دەبێ جوانو ئاشکراش روونیبکەنەوە بە چ ئامانجێ بەنیازن دەسەڵاتی خۆیان بەکاربێنن.**




بکا، هاوکات دەبێ دەسەڵاتداران ئامادەبن بەرپرسی ئەو بریارانەش بن کە دەیدەن.

جا گەر تۆ ژنیت، ئامادەشی دەسەڵات و مەسئولیەتی زیاترت هەبێ، بەردەوامبە لە خوێندنەوەی ئەم مەتنەدا. خوێندنەوەی بەسوودە بۆت.

جوان لێی رامێنە، دەسەڵات زیاتر گوزارش لە چیتر دەکا.

خۆت رابێنە و ئاشکراش نیشانی بدە تۆ ئامادەیت پلەیەکی دەسەڵات وەربگریت. لەبەر دەسەڵاتدا بە چۆکدا مەیە! بەشی خۆت لەو بسێنە.

وا بکە:

• وابزانە کە تۆ ئەندامی ئەنجومەنی رێکخراوێکیت، جا ئەنجومەنی کۆمۆن یان هەر ئۆرگانێکی تر بێ!

• وایدابنێ تۆ سەرۆکیت!

بە رێساکانی گەمەکە ئاشنابە

برێکی زۆری دەسەڵات، گەر نەزانیت بریار چۆن دەدرێ، دەفەوتێ. سەردەرکردن لەوەی چۆن پێشنیارێکی بەرامبەر دەخرێتە دەنگدانەوە، کارێکی هێند ئاسان نییە گەر بەوردی سەرلەبەری پێشنیارە جیاوازەکانی ترت نەخوێندبێتەوە، نەزانیت چۆن بەرامبەر یەکدی دەکرێ دابنرێنو بخرێنە دەنگدانەوە. رێگەچارەیەك ئامادەت بکا و تا حەپەسانی لەمجۆرەت نەیەتە پێش کۆبوونەوەی خۆئامادەکاریە بەر لەهەر کۆبوونەوەیەکی گرینگ. لێگەرێ، ژنێك کە زۆر لەمێژە خەریکەو لە تۆ شارەزاترە، سەری لە کونو کەلەبەری رێبازە ئاڵۆزەکانی بریاردان دەردەکا، لەگەڵتدابێ و رێنماییت بکا. دەکرێ ئەو چۆنیەتی رەوشی بریاردانت بۆ باسبکاو ئینجا ژنەکان خۆشیان لەوە بدوێن بەتەمان چ پێشنیارێ بخەنە روو.

دەکرێ بریاری گرینگ کودێتا ئاسا گوزەربکاو کەسێکیش هێند بێدارنەبێ تا بریارەکە بە جۆرێکی تر بدرێ. ناکرێ ژنان باز بەسەر شێوەی کۆبوونەوە لە رووی هونەری، تەکنیکی و فەرمیەوە بدەن.

مەشـــقبکە لەبواری ســـەرۆکایەتیدا، یەکەمجار لە گروپێکی ئاسودەی بچوکدا، ئینجا لە هەلومەرجێکی گەورەتردا. هۆشیاربە! ناوی چەند ژنێکی شارەزات ئامادەکردبێ بۆ پێشنیارکردن کاتێ دێتە سەروەختی هەڵبژاردنی سەرۆکێ لە کۆبوونەوەکاندا.

شـــێوازی تەکنیکی کۆبوونەوە هێند گران نییە وەك لەوەی دێتە بەرگوێ. وەســـفکردنی نەخش و نیگاری کراسێکی ئاودامان فرە ئاڵۆزترە!

گرینگە ئاشنابیت کە چۆن بڕیارەکان دەدرێن. دەنا گشت خۆئامادەکاریەك بێئاکامە.

وا بکە:

- کۆبوونـــەوەی پێشـــوەختی خۆئامادەکاری ســـازبکەو بە وردی ئەگـــەری چ هەلومەرجێ کە دەکرێ بێتە پێش تاوتوێکە.
- پەیوەندی توندوتۆڵ بـــە ژنانی ئەزموونداری سیاسیەوە بکە تا لێیانەوە فێربیت.
- خولی بازنەیەکی خوێندن لە گشـــت بواری شـــێوازی تەکنیکی کۆبوونەوەدا بە دووورودرێژی سازبکە.
- هەر لەگەڵ دەرفەتت بۆ رەخســـا خەریکی مەشقو راهێنان بە.

نیـــوەی ژنـــــــــــــــان

لـــە گشـــت شـــوێنێك

ورد چۆنیەتـــی ســـترەکچەری یـــان بونیادی دەسەڵات شـــیکەرەوە، جا چ کۆمۆن بێ یان ئەو ئۆرگانەی تۆ ئەندامی تێیدا. بزانە بڕیارە گرینگەکان لە کوێوە دەردەچن؟ لەو جێگەو ئۆرگانەدا وجودی ژنان نییە؟ فرەجار وەڵامی ئەم بڕیارەی دوایی بەڵێیە. کارێ بکە ژنان پێشنیارو کاندید بکرێن تا دەگەنە ئاستی ئەم ئۆرگانی بڕیاردەرانە. ستراتیژیەکی رونو ئاشکرا بۆ پایەی ئەو دەسەڵاتانە دابنێ کە دەبێ ژنان هەیانبێو چۆن ژنان ســـەرکەوتووانە بۆ ئەم فرمانو ئەرکانە دەکرێ پێشنیاربکرێن.

بیربکـــەوە، هیچ پیـــاوێ بۆ بـــوون بەئەندامی ئەنجومەنـــی کۆمۆنێك نەزاوە! هیچ ژنێکیش. بەڵام لـــەو ئۆرگانەدا هەلومـــەرج بـــۆ هەردووکیان لە گۆڕێدایە تا ببنە ئەندام.

وا بکە:

- رێو شـــوێنی بڕیاردەرە هەرە گرینگەکان بدۆزەوە.
- بزانە نەبوونی ژنانیان تێدا هەیە.
- ســـتراتیژیەك کە چۆن ژنان لەم ئۆرگانانەدا دێنە زیادبوون دابڕێژە.

خۆبەخشـــــــــانە ناوی خۆت تۆماربکە

بۆ کۆمیتەی ئامـــادەکاری هەڵبژاردن

یەکێ لە ئەرکە هەرە بەهادارەکان بوونە ئەندامە لە کۆمیتـــەی ئامـــادەکاری هەڵبژاردندا. کۆمیتەی ئامادەکاری هەڵبژاردنە پێشنیاری ئەندامان بۆ پۆستە متمانەپێکراوەکان دەکا. بۆیەکە دەبێ رێژەی ژنان لە کۆمیتەی ئامادەکاری هەڵبژاردنەکاندا زیادبکرێ. ژنان دەبێ پلانێکی ستراتیژی هاوبەش بۆ کۆمیتەی ئامادەکاری هەڵبژاردنـــەکان دانێن کە چۆن ژنان پێشنیاربکرێنو دەنگیان بخەنە پاڵ کام ژنانە. لێرەدا گرینگە زۆر بەوردی ئامادەکاریەکان ئەنجامبدرێن. پێشوەخت پەیوەندی بکە بە کاندیدە جیاوازەکانەوە تا خۆیان حازرو ئامادەبکەن. ئەزمونو لێوەشـــاویی یەکە بەیەکیان لیســـتبەند بکە. لیســـتەکە بەرە بۆ کۆمیتەی ئامادەکاری هەڵبژاردن. کارێ بکە گشت ژنانـــی بەشـــداربوان لە گەرمـــەی کۆبوونەوەی ئامادەکاری بۆ هەڵبژاردن داوای رادەربڕین بکەنو پشـــتیوانی خۆیان بۆ ئـــەو پێشـــنیارەی کە پێکرا لەسەری کۆکن نیشانبدەن. دەبێ ژنان، جا لە هەچ

هەلومەرجێکدا بێ، باشتر پشتیوانی لەیەکتر بکەن.
وا بکە:
• خۆت بۆ کۆمیتەی ئامادەکاری هەڵبژاردنەکان ناونووس بکە.
• هەوڵبدە لە کۆمیتەی ئامادەکاری هەڵبژردنەکاندا ژمارەی ژنان زیادبکرێ.
• پلانی ستراتیژی هاوبەش لەگەڵ باقی ژنانی تردا دابنێن تا کۆکبن لە کوێدا پێویستە ژنان زیادبکرێن‌و کامانەشن ئەو ژنانەی پێشنیاریان دەکەن.
ناساندنی ژنە کاندیدکراوەکان
دوای ماوەیەکی باشی بیرکردنەوە، بەوردی و ژیرانە پێشنیاری ژنێك یان چەند ژنێك، کە دەتانەوێ دەنگیان پێبدەن، بکەن. دەبێ کاندیدکراوەکان لەگەڵ باری واقیعدا گونجاوبن. دەبێ تا ئەندازەیەك ئەگەری سەرکەوتن زۆربێ. هەر زوو، پێش ئەو کۆبوونەوەیەی تێیدا بڕیاری هەڵبژاردنی ئەندامانی نوێ یان سەرۆکی نوێ دەدرێ پێشنیاری کاندیدکراوەکانت خستبێتە روو. تەواوی ئەزمون، لێهاتوییو لێوەشاوەیی ژنە کاندیدکراوەکان لیستبەند بکە. پێشوەخت‌و پێش کۆبوونەوەی ئامادەکاری هەڵبژاردن پەیوەندی بکە بە دەروبەری خۆتەوەو ئارگومێنت بۆ ژنە کاندیدکراوەکانتان بێنەوە لە نێو ئەو ژنانەی کە ئامادەی کۆبوونەوەکە دەبن. هەوڵبدە زۆرینەی ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە ژن بن. کارێکی چاکە گەر پیاوانی هاوپەیمانیش پەیدابکرێن.
زوو کاندیدکراوەکانتان لە کەناڵی میدیا لۆکاڵیکانەوە بە خەڵکی بناسێنن تا رێگا سەختربێ بۆ ئەو پیاوانەی وەك بەنیازن (دیسانەوە-) خۆیان هەڵبژێرنەوە. کارێ بکە چەند رۆژێ پێش هەڵبژاردن گوتارێکی نایابی ژنی کاندیدکراوەکان بێتە پەخشکردن. روونو ئاشکرا پشتیوانی لە کاندیدکراوەکانتان بکەن. کارێ بکەن کاندیدیان ببینرێن‌و دیاربن. نووسین‌و وتار دەربارەی باشێتی ئەوان بنوسن‌و بنێرن بۆ چاپەمەنیەکان.
کۆرسی خوێندن بۆ ئەندامانی نوێی ئەنجومەن سازبکەن. گرینگە هەموو بزانن رەهەندەکانی ئەرك‌و فرمانی پێسپێردراو چییەو لەچی پێکدێ. لە میانی ئەو سالانەی دواییدا ساغبۆتەوە فرەگەلێکی ئەندامانی ئەنجومەن‌و ئۆرگانەکان لە ماهیەتی جیدیو مەسئولیەتگەریەك کە پەیوەستە بە ئەرکی پێسپێردراوەوە حاڵی نەبوون. کات‌و رەنجی سەختی گەرەکە تا دەبێتە ئەندامێکی تەواو لێزان. بێگومان ئێمەی ژن دەبێ بەرپرسێتی بفامین‌و وەرگرین.
وا بکە:
• لیستبەندی ئەوانەی بەنیازن کاندیدبکرێن، لەتەك لێوەشاوەییو کارامەیی ئەواندا ئامادەبکە.
• پردی پەیوەندی لەتەك رۆژنامەوانە ژنە نایابەکاندا دروستبکە.
• وێنەی قەشەنگ‌و جوانی کاندیدەکانتان بگرن بۆ پەخشی نێو میدیاکان.
• کۆنفرانسێ بۆ میدیا سازبکە تا کاندیدکراوەکان تێیدا ئاشنابکرێن.
ژنـــــــــــــــــــــــــانبـا
سەرتۆپی لیستەکان بن
لیستێك کە ناوێك لەم رەگەزو ناوێك لەو رەگەزەی گرتۆتەخۆ باشە، بەلام ژنان دەبێ بەقەد پیاوان، چەندجار ئەمان سەرتۆپی لیستەکانن، ژنانیش هێندە. بێ کەم‌و زۆر. لیستێك کە سەرتۆپی پیاوێك گرتویەتی سێ چکولەیەك پێکدێنێ، دوو پیاوان سەربەندو بنبەند، ژنێکیش لە نێوەندیاندا بەندە! فرەجار ئەم سێ چوکلەیە پرێسیدیوم (دەستەی بەڕێوەبردن)، پێکدێنێ، یانی ئەو ئۆرگانەی تێیدا بابەت‌و کێشەکان

ئامادەدەکرێن، ئەجێندای کۆبوونەوە دیاریدەکرێت، فرەگەلێکی بڕیارەکان دەدرێن، ئەمە بەدەر لەوەی زۆر بڕیاری تریش تێیدا دەدرێن پێش ئەوەی بەرەو خوارەوە، بۆ خودی ئەنجومەن و کۆمیتەکانی بنێررێن. سێ چوکڵەکە نەخشی هونەرێکە هەر بەقازانجی پیاوان دەشکێتەوە.

دەشێ لە هەقیقەتدا تەنیا ناوی یەکەمی لیستەکە بێتە هەڵبژاردن، ئەمەش بۆخۆی هۆکارێکی ترە تا سەرتۆپی لیستان ژنان بن. ئەگەر هەمیشە سەرتۆپی لیستەکان بە ناوی پیاوێك بکرێتەوە، رەنگە هەرگیز نەگەینە دابەشکردنێکی دادپەروەرانەی کاندیدیان، ئیتر بێسودە هاوار، با ئەودوای لیستەکەش بەیەکێ لەم و یەکێ لەو رەگەز برازێنرێتەوە، بۆیە گرینگە ژنان سەرتۆپی نیوەی لیستەکان بن.

وا بکە:

• رێسایەك پێشنیاربکە کەلەکاتی پێویستدا هەمیشە دوو لیست ئامادەبکرێ، یەکێکیان سەرتۆپی ژنێك بێ‌و ئەوی تریان پیاوێك.

• داخوازیتان بۆ سەنتەری ئۆرگانی رێکخراو-یان پارتیەکەتان راستکەنەوە تا مەسئولیەتی رێکخستن‌و دابەشکردنی تەنیا ئەو لیستانە نەگرنە ئەستۆ کە سەرتۆپیان پیاوە، بەڵکو مەسئولیەتێکی یەکسان‌و چونیەك، بەوەی لەبەرابەرێتی ئەواندا، لیستگەلێکی تر کە سەرتۆپیان ژنە، هەڵگرن.

• هەر زوو ژنی سەرتۆپی لیستەکان بە وێنەو-ناوەوە لە میدیای ناوچەکەدا بڵاوبکەنەوە. کارێکی وا خەڵك سەرسامدەکاو دەهەژێنێ چونکە دەگمەن‌و نانۆرماڵە.

• شوهرەت‌و ناوبانگ بۆ ژنانی سەرتۆپی لیستەکان پەیدابکەن. کارێ بکەن ماوەیەکی زۆر پێش هەڵبژاردنەکان کاندیدیانی ژنان دەنگ‌و رەنگیان لە میدیای ناوچەکەدا هەبێ، لەوانە، گوتارو نوسینی نێو رۆژنامەو گۆڤارەکان، جەدەل و مشتومڕ، کۆمێنتارو گفتدانی میدیایی....هتد هیچ کام لەمانە کارێکی گران نین.

پۆستی سەرۆکایەتی بگرن

ئەرکی سەرۆك، لەوانە، بەڕێوەبردنی کۆبونەوەکانە، ئامادەکردنی ئەجێندای کۆبوونەوەو بڕیاردانێتی، دەکرێ هەندێ بڕیار بەتەنیاش بدات. سەرۆك دەسەڵاتێکی گرینگی هەیە. نیوەی ئەم دەسەڵاتە هی ژنە. بۆیە دەبێ هەمیشە وریابی تا ئامادەگیەکی باش بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك بکرێ.

لیستبەندی ئەو ژنانە بکە کە پۆستی سەرۆکیان پێ رەواو شیاوە. گشت ئەوانەی ناویان لە لیستەکەدا رێنوسکراوە کۆبکەرەوەو تاووتۆی دارِشتنی ستراتیژیەتی خۆتان بکەن. با سەرجەمی ئەوانەی بەنیازن بۆ سەرۆك هەڵبژێرێن زانیاری رێکوپێکیان لەپەیوەند سەرۆکایەتیەوە پێبدرێ بەوەی کە گوزارش لە چی دەکاو ئەوانیش، کاندیدەکان، چۆن بەخەڵکی ئاشنادەکرێن. فرەن ئەوانەی بەگومان‌و نیگەرانن لە پۆستی سەرۆکایەتی کە بەئەرکێکی قورس‌و گرانی دەزانن‌و یان وای بۆدەچن کاتی زۆر دەوێ. رێنوێنیکارێ کە ژن بێ‌و لە مێژە لە یەکێ لە پۆستەکانی سەرۆکایەتیدا جێگیرو سەقامگیر بووبێ هەڵبژێرە. ئەرکی پەروەردەیی، پشتیوانی، هاندانی ژنە نوێ سەرۆکەکانی پێبسپێرە. خانمی رێنوێنیکار، بەم ئەرکە رووسور دەبێ و دەبێتە مایەی شانازی بۆی!

رۆژنامەوانێکی نایابی ژن بدۆزەرەوە تا هاوکاریت بکا لە بە ئاشناکردنی کاندیدە نوێکان بۆ سەرۆکایەتی. رۆژنامەوانان باش دەزانن چۆن دەکرێ بە کاریگەرترین شێوە لەکەناڵەکانی میدیاوە کاندیدکراوەکان لەناو خەڵکدا بناسرێنرێن. ژنان

دەبێ خۆیان رابێنن کە باشـــتر دەرکەون، بەهێزتر پرۆفایلیان بکرێن و کەســـایەتی خۆیان نیشانبدەن. دەبێ جوانو ئاشکراش روونبیکەنەوە بە چ ئامانجێ بەنیازن دەسەڵاتی خۆیان بەکاربێنن.

بەبەردەوامی کورتە کۆرس لەبواری مەشـــقی هونەری گوتاردان، سەروسەوداکردن لەتەك میدیا، هونەری نوســـینو گوتاردانی باش بکەنەوە، ئەمانە کارێکن هەموومان پێویستمانە. دەستبەکاربەو بابەتی کۆرســـێکی ئا لەو تەرزە رێکبخـــە. ژن، نەك تەنیا ئەوەی بەرێوەن بەرەو ســـەرۆکایەتی، بگرە ئەوانی تریـــش بەدڵنیاییـــەوە دێن، بەمەرجێ بانگهێشـــتی شەخسیان بۆ بنێرێت.

وا بکە:

- ناوی کاندیدکراوەکانی پۆستی سەرۆکایەتی، لێوەشایی و تواناگەریان لیستبەند بکە.
- کۆرسێك بۆ سەرۆکایەتی لە بواری هونەری گوتاربێژی، نووسینو ستراتیژی میدیادا سازبکە.
- رێنوێنیکارێ لە ناو سەرکردە سەقامگیرەکاندا بۆ رێنوێنیکردنی تازەکان هەڵبژێرە.
- کاندید بۆ سەرۆکایەتی بەگوێرەی سەرجەم رێسا هونەریەکان لەم بوارەدا بە خەڵك بناسێنە.

لەناو پارتی و رێکخراوەکاندا دەسەڵات بگرن

فرەگەلێـــك لە پارتەکان رایان وایە لیســـتەکان دەبـــێ یەکێ لەم رەگەزو یەکێ لەو رەگەز بگرێتە خۆی. لە پرســـی متمانەدا کێشەیەك هەیە هیچ کام لەم پارتیانە لێی حاڵی نابن، ئەویش تەنیا لیستەبنەدی بەپێـــی بنەمـــای جیاوازیـــی رەگەز بـــۆ پارتی و رێکخراوەکان کافی نییە.

لیســـتی پارتیەك کە لەســـەر بنەمای جیاوازی رەگـــەز رێکدەخرێ کەچی لەولاشـــەوە بەردەوام پیاو سەرۆکایەتیان دەکاو نمایندەیان دەبن، زمانێکی پیاوانە بەدەر لە ئاسەوارێکی ژنانە بەکاردێنن، بەهیچ جۆرێ نافامن ئەو پرســـانەی لای ژنان گرینگ و بەهادارن گرنگی پێبدەن و بیهێننەوە. تەنیا دیکۆرو تیاتربازی کافی نییە!

دەبێ پارتەکان لە دابەشـــکردنی دەســـەڵاتدا، کە سەرلەبەری ســـەترەکچەر و بونیادی دەسەڵات دەگرێتـــەوە، چ فەرمی یان نافەرمی، سازشـــبکەن. نەشیاوە گروپی کاری ســـتراتیژی، نەلواوە گروپی کەمپین، لیژنەی لێکۆڵینەوەو...هتد پێکبهێنرێ تەنیا پیاو ســـەرتۆپیانی گرتبێ و چەند «دەنکێك»ـــیش ژنیان بۆ ناوی خوا لە خوارەوە، بۆ بەشـــدرایکردن لەکارو گفتوگۆکاندا دانابێ. نەشیاوە دابەشکردنێکی نابەرابەر لە رووی رەگەزیەکسانیەوە لە ناو نماینده، نوێنەر، کادێرو سکرتێرە سیاسیەکاندا کرابێ، یانی، لە ناو باکراوندی پرۆفایلەکاندا کە بەشێکی فراوانی دەســـەڵاتی نافەرمی دەگرێتەوە. بەشـــێکی زۆری بەرپرسانی رێکلام، پروپاگەندە و زانیاریدان لە کن پارتە سیاسیەکانی سەردەم پیاون. ئەمە گوزارشە کە پیاوان فۆرمی رێوشوێنی سیاسەتمەداران، پارتەکان ئەوان دایدەرێژن. هەر ئەمانەشـــن پەیامە سیاســـیە گرینگەکان هەڵدەبژێـــرن و رادەگەیەنن. گرینگە بنکەو ســـەنتەری دەسەڵاتێکی وا لەلایەن ژنەوە بێتە داگیرکردن. کردنی ژنان بە بەرپرسی پۆستەکانی PR، **Public relation}** رایەڵاکانی پەیوەندی بە خەڵکەوە**}** کارێدەکەن کە وێنای پارتەکان و سیاسەتمەداران بە شێوەیەکی تر بگۆرن. بە شێوەیەکی خۆشتر!

پێنج هونەرەکەی زاڵـــبوون

پیاوان هەمیشە چەند مێتودو شێوازێکیان هەیە - جا بە هۆشیاری یان نا هۆشیاری بێ — کە بەکاری دێنن تا دەسەڵاتیان زاڵبکەن بەسەر ژنان و کولتوری ژناندا. پرۆفیسۆر بێریت ئۆس **Berit Ås** لە نەرویج

ئەو جۆرە مێتودە یان هونەرەی بەسەر پێنج گروپدا دابەشکردوە:

١. نەبینراوکردن
٢. بە گاڵتەجاڕکردن یان قەشمەرپێکردن
٣. شاردنەوەی زانیاری
٤. دەبڵ یان دووجار سزادان
٥. پسوڵەدانی منەتبارکردن و شەرمداگرتن

بەم پێنج مێتودە ئاشـــنابە تا بزانی گوزارش لە چ دەکـــەن. مێتودەکان بە ژمارەکانیاندا بناســـەوە کە ئیتر ئاســـان لە گەرمەی کۆبوونەدا، بە یارمەتی بەرزکردنەوەی یەك یان چەند پەنجەیەك لە هەوادا، بتوانـــی بە باقی هاوڕێکانتی رابگەیێنی کە چ جۆرە مێتودێك لەو ساتەوەختەدا بەکاردەهێنرێ!

وا بە کورتی لەخوارەوە لەمەڕ ئەم پێنج هونەرە دەدوێین:

١. نەبینراوکردن

ئەم هونەری زاڵبوونە وشـــەنەدارو بێدەنگە، ئەو کاتە پیادەدەکرێ کـــە پیاوان گوێڕانادێرن تا بزانن ژنان هیچ گوتارو گفتێکیان هەیە بیڵێن و دەربیڕن، بەڵکو خۆیان ســـەرقاڵدەکەن، لەوانە، دەستدەکەن بەهەڵدانـــەوەی لاپەڕەو کاغەز، قســـەکردن لەگەڵ یەکتردا یان لە بری ئەمانە دەچنە تەوالێت. ئێمەی ژن فرەجار پرسو کێشەی جیاواز بە پیاوان دەوروژێنین چونکـــە ژنان لە هەلومەرجێکی جیـــاواز لە پیاوان دەژین. باسوخواسێ کە ژن دەیکەن پیاوان خۆیانی تێدا نابیننەوە بۆیە کارێدەکەن تا خۆیان لە گوێبیستی بدزنەوە یان گرینگی پێنەدەن.

نەبینراوکردن هونەرێکـــی زاڵبوونی وێرانکەرە. کەســـێ کە نەبینرێ یان نەبیســـترێ هەستدەکا بێ بەهایە، کەمنرخە ئیتر دەشـــێ بـــە نابەدڵی چالاکی ئیدامە پێبداو لە گۆڕانخوازی بکەوێ.

وا بکە:

• ئاشـــکرا نیشانیدە کە تۆ بە مێتودێکی وا نەك تەنیا ئاشناو شارەزای بگرە دەشزانی پیادەش دەکرێ و تۆش بەهیچ جۆرێ قایل نیت پێی.

• داوابکە گوێبیستت بن و گرینگیت پێبدەن.

• گەر حاڵـــی نەبون چی دەبێژی، چاوەڕێکە، کاتێ پیاوێ خۆی دێتە دووان مێتودی نەبینراوکردنی بەسەردا پیادەکە. ئاشـــکرا بەزێدەڕۆییەوە ئەمکارە ئەنجامبدە تا هەموویان بزانن مەبەستت چیە.

٢. بە گاڵتەجاڕکردن یان قەشمەرپێکردن

ئەم هونەرە زۆڵانە هەر زوو دەناسرێتەوە کاتێ پیاو دەیەوێ لەســـەر حیسابی ژن گاڵتەو قەشمەری بکا. هونەرەکە گوزارشـــە لە بەکەمنرخاندنی ژن و کارێ کە ژن ئەنجامیـــدەدا. لە میانی ئەم هونەری زاڵبونـــەدا چەمك و رەهەندێکـــی زۆرو بەربڵاو لە قسەی پڕوپووچ و ناشرین دەدۆزینەوە، لە (زەعیفەی مێشـــکپووت)ـەوە تا ئافرەت کـــە هەر خەریکی قاووقیـــژن و بە هێســـتێریان. نمونە هێنـــد زۆرە، بێئەندازەیە!

وا بکە:

• بـــە زاری خۆت جوان حاڵیانکە کە مامەڵەی لەوجۆرەت پێ قەبوڵ ناکرێت.

• هەرگیز لەگەڵیاندا پێمەکەنە. تەنانەت ئەگەر نوکتەو گاڵتەجاڕیەکە پەیوەندی بە ژنێکی تریشەوە هەبێ. مەسئولیەتی یەکتر هەڵگرن.

• بـــە سەرســـوڕمانەوە چاو لەچـــاوی پیاوانێ کە قەشـــمەریان بە ژن دێ ببڕەو بە باوێشـــکێکی پڕمەبەســـتەوە ناڕەزاییـــت دەربـــڕە. کارێ بکـــە بێدەنگیەکی جاڕســـکەر ئەو ناوە بگرێتەوە. روو لە ژنێ بکەو، بۆ نمونە بپرســـە، «ئەرێ بە بۆچوونی تۆ مەبەستی ئەو پیاوە لەوەی ئێستا گووتی چی بوو ؟»

• بــە زاری خۆت جوان حاڵیانکە کە مامەڵەی لەوجۆرە قابیلی قەبوڵ نییە.

٣. شاردنەوەی زانیاری

شاردنەوەی زانیاری باشترین ڕێگای ئاکتیڤە بۆ مانەوەی مرۆڤ بە جاهیلی. ژنان زۆرجار بەم داوەوە دەبــن. پیاوان لە باڕ و کەڵەبەکان، بەدەم یاری و لە شوێنگەلێك پیاوان نۆڕماڵ تێیدا گرددەبنەوەو یەکتر دەبینن «حیساب و کیتابی نێوان خۆیان، جا هۆشیارانە یان ناهۆشیارانە، پاکوپیس دەکەن». ئەوەی دوایی لە کۆبوونەوەکاندا ڕوودەدات -بە ئامادەبوونی ژنان- دەیانەوێ هەر زووبەزوویی تەقە لە چەکوشی بڕیار بەرزبێتەوەو ئەجێندەی کۆبوونەوە خاڵ لە دوای خاڵ بەخێرایی گوزەربکا. ئیتر ژنان دەرفەت و چانسێکیان بــۆ نامێنێتەوە تاووتۆی خاڵەکانــی ئەجێندا بکەن، پیاوانیش بەش بەحاڵــی خۆیان، لەوەوپێش، لەمێژە لە کۆڕو کۆبوونەوە بچکۆلەو تایبەتیەکانی خۆیاندا تاووتۆی خاڵەکانیان کــردوە، یەکلایانکردۆتەوەو لێبوونەتەوە. پیاوان نافامن بۆچی ژنان هەمیشــە لە گەرمــەی کۆبوونەوەکاندا قاووقیــژو دەمەقاڵەیانە تا خاڵ بە خاڵی ئەجێنــدای کار درێژەی هەبێ بۆ ئەمەش پێویســتیان بە وەختی زیاتــرە، تەنانەت بۆ کۆبوونەوەکانیــش، ئەوجا دەڵێــن: بۆ ناکرێ ژنان کەمێ زیاتر «زەوقی بڕیاریان» هەستێ!

وا بکە:

• پێش بڕیاردان داوای باکڕاوندی ســەرجەم زانیاریەکان بکە.

• داوای دواخســتنی بڕیاری ئەو کێشەو پرسە قورســانە بکە کە کاتی زیاتر گەرەکە بۆ بە وردی خوێندنەوەیان.

• هەوڵدە لە ڕێگاو جای ترەوە زانیاری پێویست پەیدابکەیــت، لەوانە، لەڕێی تۆڕی پەیوەندی نێوان ژنان خۆیاندا.

٤. دەبڵ یان دووجار سزادان

چۆن بیکەی ســەقەتی دەکەی! ئەمە بەکورتی وەســفی ئەمجۆرەی تریانە لە هونــەری زاڵبوون. ژنان هەمیشــە لە گشــت بارێکدا زوو تووشـــی ئازاری ویژدان دەبن. ئاخر دەبا لەوشوێنە نەباما کە لە ڕاســتیدا لێیبووم — لەســەرکار، لای منداڵ، لە کن مێردەکەم. سترێســێك کە بە دووی ئەم باری نیگەرانی ویژدانەوەیە لە تەحەمولدا نییە. لە هەموویان خراپتر هەستی خۆ بەکەم زانینە. زۆرجار دەوروبەر، بێ ئەوەی بە قســە بیڵێن، ژنان بە ســیفەتی دایك تاوانباردەکەن بەوەی تەقســیریی دەکەن کە کاتی خۆیان تەرخانی کار و سیاسەت دەکەن، هاوکات گەر بێت و لە پێش گشت شتێکدا خۆیان تەرخانی ماڵ و خێزان بکەن، ئینجــا دەڵێن، ئەمانە بەتەنگ هیچ شــتێکەوە نایەن، بێخەمــن و ئاگایان لە دونیا نییە. ئەگەر هەردووکیان هەڵبژێرن ئەودەم گلەیی و ناڕەزایی لە هەردوو لاوە بەرزدەبێتەوە.

ژنان دەیانەوێ ڕایەڵی نێوان خێزان و کار ڕاگرن، هەردووکیان هەبێ، مافی تەواوی خۆیانە بڵێن نا، جا چ لە ماڵدا بێ یان لەسەر کار، بێ ئەوەی سزابدرێن! پیاوان، جیاواز لە ژنان، بەدەگمەن تووشی ئەمجۆرە دەبڵ ســزادانە دەبن. پیاوان زۆرجار ئاساییە لایان و ئولفەتیان بە بەڵێ - ــەوە لەســەر کار گرتووە و لە ماڵیشــەوە بە نەخێر! ئەمە نە ئەوەیە قەبوڵبکرێ نە دادپەروریشە. ژنان دەبێ وەك پیاو مافی کار و ژیانی خێزانیان هەبێ.

وا بکە:

• وریاو وردبە کە هاوســەرێکی ڕەندو ڕەسەن هەڵبژێریت.

• وریاو وردبە لە هەڵبژاردنی بەڕێوەبەردا.

• داوا لە بەرپوەبەرەکەت بکە کە بتوانی بڵێی نا –یان– بەڵێ بەبێ ئەوەی وەك باوە سزات بدەن، لەوانە، ئیتر بەرزکردنەوەی پلەی کارت راگرن.

• ئیش و کاری ناو ماڵ حسابکە بە سەعات ئینجا لەگەڵ هاوسەرەکەتدا ڕێکەوە کە کاری ناوماڵ وەك یەك بەشبکەن.

٥. پسوڵەی منەتبارکردن و شەرمگری پێدان

لەناو گشت هونەری زاڵبوونەکاندا ئەمەیان سەختە و گرانە تێگەیشتنی. ژنێ کە جۆرێ لە سووکایەتی پێدەکرێ یان حورمەتی دەشکێنرێ خۆی بە خەتابار دادەنێ! ئەمجۆرە حوکمە کوێرانە هەستی ئەوەی، راستە دەشێ ئێمە گوناهبار بین، لای ژنان دروستدەکا. ئاخر خەتای خۆمە، خۆم بە خۆمم کرد! گوناهی منە، ژن وا بیردەکاتەوە و گوناهی رووداوەکە دەکاتە گەردنی خۆی بەدەر لە هۆکارە هەقیقیەکە کە داخۆ وایە یان نا.

لەم حاڵەتانەدا دەبێ خێرا لێکۆڵینەوەی رووداوە راستیەکە کە لە واقیعدا روویداوە بکرێ، بەوپێیە ئیتر هیچ هۆکارێك نامێنێ گوناهەکە بخەیتە گەردنی خۆت.

وا بکە:

• بە هاوکاری هاوڕێیەکی ژیر و زرینگت شیکاری رووداوەکە بکە.

• لەڕێی هەوڵی بینینی نەخشی هەقیقی رووداوەکە خێرا تۆزی گوناهباری لە خۆت بتەکێنە.

• رووداوەکە لەگەڵ ئەو کەسەی گوناهەکەی خستۆتە ملی تۆ یەکلاکەرەوە. بۆی بسەلمێنە ئەو رووداوە لەڕاستیدا چۆن قەوماوە.

• بەرگری لە ژنانی تر بکە کە دەکرێن بە ئەنقەست و بەئامانج تا تەوقی گوناهباریان لە گەردن نێن.

چۆن کاریگەری راستەقینە و دەسەڵاتی خۆمان بەدەست دێنین!

ژنان سەرگەرمی بەدەستهێنانی دەسەڵاتی خۆیانن ئێستا. کاتێ ژنان لە دەسەڵاتی راستەقینە نزیك دەبنەوە مەیلێکی سەیرو ناچیز دەیانگرێ کە دووردەکەونەوە، هەستن و بچنە جایەکی تر. بۆ کوێ دەڕۆن کێشەیەکە دەبێ بیدۆزینەوە!

لەو ڕێیەدا کە دەڕوا بەرەو زیادکردن و بەدادپەروەرکردنی دەسەڵات بە قازانجی ژنان چەندەها چاڵوچۆڵی هەیە بکەویتە ناوی.

لەم نامیلکە دەستیەدا پێناسەی ئەو چاڵانە دەکرێ و چۆن خۆمانی لێ لادەین یان چۆن دەکرێ لەناویانبەرین.

ژنانی-ئێس**S**))، فێمێنیستە سۆسیال دیموکراتەکان، خەباتی چینایەتی و خەباتی رەگەزیەکسانی شان بە شانی یەك دادەنێن. کۆمەڵەی ئێمە، ژنان لە سەرجەم سویدا ڕێکدەخەن. ئێمە بەیەکەوە خەباتمان بۆ رەگەزیەکسانی زیاتر- لە کۆمەڵگە و لە ناو پارتی خۆماندا درێژەپێدەدەین.

یەکێتی ژنانی سۆسیال دیموکراتەکانی سوید.
بۆکس ٧٠٤ ٥٨ ستۆکهۆڵم **Box** ٧٠٤ ٥٨
١٠٧**Stockholm** ٢٨ ،
ئادرەسی دیدەنیکردن: شەقامی سڤێیە ٦٨، ٦٨
**Sveavägen** ستۆکهۆڵم.
ژ ت: ٠٨-٧٠٠ ٢٦ ٠٠

**سەرچاوە:**

**www.s_kvinnor.se**

**Makthandboken**

**Översättning Goran Meriwani**

**juli, Sverige 2011**

# ئەدەب و سێکس



دواهەمین کاتی وەرگرتنی بابەتی وەرگێڕاو بۆ مەلەفی ئەدەب و سێکس

1-12-2011